# دانراوی

## مه لا عارف مووده ررسی ((بالكی))

کۆمه ڵه به سه رهات و په ند و ئامۆژگارییه

کۆمەڵە بەسەرهات و پەند و ئامۆژگارییە


دانراوی:

مەلا عارف مودەڕڕیسی «بالکی»

عارف زور پر زه حمه تـــــم		له دلّ ده رناچی خه مو خه فه تم

خزمه ت كه م به وه ته نـــــم		یا شوانی بم بو هاووه ته نـــــم

بو كورته پیش كه شی ئه كه م		هیوای قه بولی له ئیوه ئه كـــه م

## به ناوی خوای گەورە

*کورتەیە لە بەسەرهاتی ژیانی خۆم.........*

من «موحەممەد عارف» باوکم مامۆستا مەلا «موحەممەد باقر مودەڕڕیس» کوردستانی (رحمه الله). دایکم خەدیجە خاتوون. باوکی شێخ سەعید لە ساداتی کەسنەزانی سەقزە کە ئەچنۆ سەر مەلا «ئەبووبەکری موسەننیفی چۆڕی» (رحمه الله) دایکی ئامینە خاتوون لە شێخانی مەولاناناوای شاقەلایە، خوشکی شێخ موحەممەد سادق. لە ساڵی ۱۳۰۵ هەتاوی لە دێی بالک لە دایک بووم. پێنج ساڵم بووە دایکم لە دەس داوە لە شەش ساڵیا دەسم کردووە بە خوێندنی سەرەتایی لە بالک. عیلمی نەحوو سەرفیشم لە بالک لای باوکم و فەقێکانی‌خوێندن. وە بۆ باقی خوێندنم لەم دێهاتا لە خزمەت ئەم مامۆستا بەڕێزانا خوێندوومە. خوا جەزایان بە خێر باتۆ. لە ئێرانا: لە بالک مامۆسا مەلا باقر، لە چۆڕ مامۆسا سەیید عەتا، لە ئەڵمانە مامۆسا حاجی سەیید بابە شێخ، لە دەرەتفێ مامۆسا مەلا مەحموودی جوانڕۆیی، لە نێ مامۆسا شێخ حسەین. لە دوایی‌یا بوو بە مەلای نەزارە. لە ئێراقا: لە بیارە مامۆسا مەلا عەبدوالکەریم مودەڕڕیس، لە خۆرماڵ مامۆسا سەیید عارف هانە سوورەیی ـ کە لە ئەسلا چۆڕین ـ لە عەبابەیلێ مامۆسا مەلا حەسەن، لە عەنەب مامۆسا مەلا مەحموود کانی بەردینەیی. لە چنگیان مامۆسا مەلا عارف. لە بەرزنجە مامۆسا شێخ تۆفیق، حەزرەتی شێخی علاءالدین و شێخ عوسمان سراج الدینی کوڕی ئیجازەنامەیان بۆ نووسیوم. لە ئاخرا لە دێی بالک لە خزمەت باوکما سێ نەفەری ئیجازەمان وەرگرت: من و مامۆسا مەلا موحەممەد بداقی و مەلا یۆسف لە ساڵی ۱۳۳۰ش، وە باوکم ئیجازەنامەیێ بەرزی بۆ نووسیوم.وە چونکە بە باشی خۆم تەسلیمی شێخ سراج‌الدینی بیارە نەکرد زۆر دوا‌کەوتم.

دوای ئیجازە وەرگرتن، بووم بە مەلای بەرقەلا تا شەش ساڵ. دوایی بووم بە مەلای نەچێ تا ۱۳ساڵ. وە تا ساڵ و نیوێ دوای فەوتی باوکم بووم بە مەلای باشماخی مەریوان. ساڵی ۱۳۵۰ بە ئەمری شێخ سراج‌الدینی بیارە هاتمۆ بۆ بالک بە مەلایەتی. وە ۱۲ساڵ لە بالک مامەوە و لەوێ شەش نەفەر فەقێم ئیجازە دا. وە دوای ئەوە هاتم بۆ شاری مەریوان وە شەش ساڵ بووم بە مودەڕڕیسی عولوومی دینی

مەریوان و دوو ساڵیش لە مەدرەسەی عولوومی دینی شاری سنە. لەم مزگەوتانی مەریوانا مەلاییم کردووە: مزگەوت هەورامیەکان، مزگەوت تازاوا، مزگەوت بیلال حەبەشی. وە تا ئێستا ۱۲ کتێب باوکمان چاپکردووە و شەش کتێبی تری ئامادەی چاپە. بە کۆمەک خوا لەم نزیکانەدا چاپ ئەبن. وە چوار کتێب خۆیشم چاپ بووە ۱.ئیسبات شەفاعەت بە نەسسی ئایەت. ۲.بازێ لە کەشف و کەرامەت مامۆسا مەلا باقر و باوکی. ۳.کەلەپووری کوردی پەندی پێشینیان. ٤ دەستووری رێ خستنی مردوو بۆ قەبر کە تەڵقین و باسی چۆنیەتی پرسەی باوکمی لە گەڵە. وە ئەم کتێبی «راز و نیازە» و تەرجەمەی ئیسبات تەریقەت دانراوی باوکم بە عەرەبی و من کردوومە بە فارسی بە یەکۆ ئامادەی چاپن. خوا عاقیبەتم بە خێرکا ئامین. وە لەبەر خۆمۆ ئەڵێم خوای گەورە هەرچێکم لێکەی حەقی خۆتە، هەرچێکم لێنەکەی رەحمی خۆتە.

دلا خو کن به تنهایی که از تنها بلا خیزد　　سعادت آن کسی یابد که از تنها بپرهیزد

هەموو قۆناغەکانی ژیانم بڕیوە تەنیا مردنم ماوە بە تەمای دۆعای خێری ئێوەم. والسلام علیکم

براتان/ موحەممەد عارف مودڕریسی بالکی ۱۳۸۷/۱/۷هەتاوی

# بسم الله الرّحمن الرّحيم

## به ناوی خوای گەورە و میهرەبان

بە ناوی خودا دەسی پێ ئەکەم
حەمد و سەنای زۆر بۆ خودای عالەم
لەسەر ئوممەت و ئال و یارانی
دوای ئەوە تەوفیق لە خوا ئەخوازم
خۆم نەم نوسیوە من کۆم کردووەتۆ
هەرکەس تەماشای بکا بە باشی
هەزار و سێسەد هەشتا و دووی شەمسی
ئەگەر بۆ ناو و شۆرەتمە پرسی
دووای ئەوە ئەلێم پیر و فەقیرم
تۆشەی عەفووی تۆ بۆ رێگەی دوورم

داوای یارمەتی هەر لە ئەو ئەکەم
سەلەوات لەسەر حەزرەتی خاتەم
بە قەی گەلای دار تەرزە و بارانی
لە بۆ پێشەکی راز و نازم
زویر مەبە لێم هەروا لەخۆتۆ
ئەبێ بە زانا، نابێ بە ناشی
ئاخر شەهریوەر ئەمانەم نووسی
موحەممەد عارف، هۆز مودەررسی
خودا بیبەخشە خەتا و تەقسیرم
کە بێ بە هاورێم ئیتر روو سوورم

***

## پێشەکی بۆ حیکایەتی پێشینیان

قورئان پێشەوا و ئیمامی هەموو ئینسانە بە تایبەت موسولمان بۆ راهنمای دین و دونیا، یەکێ لە جوابی سوئالی قەبر ئەوەیە کە ئیقرار بکەین بە پێشەوایی قورئان بۆ ئێمە. ئەوە کە قورئان باسی ئەکا بۆ ئێمە سێ بەشە: هەوەڵ لەو سیانە کە موهیمترینی هەموویانە باسی زات و سیفاتی خوایە کە عیلمی کەلامی بۆ دانراوە، کە خولاسەی ئەو عیلمە لە سوورەتی ﴿قل هو الله﴾ وەرئەگیرێ. کۆمەڵێ لە ئەسحابی پێغەمبەرﷺ، بە ئیجازەی حەزرەتﷺ ئەرۆن بۆ سەفەر یەکێکیانی کرد بە گەورەیان کە پێشنوێژییان بۆ بکا. کە هاتنەوە پرسیاری بەسەرهاتی سەفەرەکەی لێ کردن یەکێ لەوانەی بۆیان گێراوە ئەوە بوو وتیان: ئەو گەورەمانە لەم سەفەرا لە نوێژا زۆرتر سوورەتی ﴿قل هو الله﴾ی ئەخوێند. حەزرەت لێی پرسی بۆچی وات

کردووه؟ وتی: ئەو سوورەتە لەبەر ئەوە کە باسی زات و سیفەتی خوا ئەکا خۆشم ئەویٚ و پیٚم خۆشە هەمیشە بیخویٚنم. حەزرەتﷺ فەرمووی: ئەو خۆشەویستییە بۆ ئەو سوورەتە ئەتخاتە بەهەشت. مەعنای ئەم سوورەتە ئەمەیە کە: «کافرەکان لیٚت ئەپرسن ئەی موحەممەد کە خوا چیە و چۆنە؟ لە جوابا بلیٚ: خوا تاک و تەنیایە، خوا بیٚنیازە، هەموو کەس نیازی بە ئەو هەیە، کەسی لیٚنەبووە و لە کەسیش نەبووە وکەسیش هاوماڵ و هاوتای نیە». ئەم سوورەتە دوو سیفەت وجودی واتیا ١.خوا تاک و تەنیایە ٢.خوا بیٚنیازە. سیٚ سیفەتی سەلبی واتیا ١.کەسی لیٚ نەبووە ٢.لە کەس پەیا نەبووە ٣.کەس هاوماڵ و هاوشانی نیە. ئەم پیٚنج سیفەتە سەرجەمی هەموو سیفەتە گەورەکانی خوایە. بۆیە ﴿قل هو الله﴾ خۆلاسەی عیلمی کەلامی تیایە و لەبەر ئەوە کە ئەم سوورەتە باسی گەورەترین سیٚ بەشەکەی قورئان ئەکا. عولەما فەرموویانە: سیٚ کەڕەت ﴿قل هو الله﴾ بخویٚنی ئیحسانی خەتمیٚ قورئانی هەیە. دووهەم لە سیانەکە لە قورئانا باسی لیٚئەکریٚت ئەحکامە. واتە: ئەبیٚ بزانین ئیٚمە چۆن کار وبارمان ببەین بەریٚوە و ئەم باسە شەریعەتی ئیسلامی بۆ دانراوە کە هەمووی لە قورئان و حەدیس وەرگیراوە. وە ئەم شەریعەتە چوار بەشە و پیٚی ئەڵیٚن چوار روبعەی شەرع ١. باسی عیبادەتە وەکوو نویٚژ، رۆژوو، حەج. ٢.باسی موعامەلاتە وەکوو فرۆشتن، سەندن، سەلەم، رەهن، نەزر، سولح، قەرز، قازانج بەشەراکەت، وەسیەت، میرات بەش کردن، ٣.باسی نیکاح و تەلاق و ریجعەت. ٤.باسی جەنایاتە، وەکوو قەتڵ و سەرو و دەس شکاندن و تۆڵە سەندنی ئەمانە، حەددی زینا و دزی ئەبیٚ حکومەتی ئیسلامی بە زۆر حوکمی ئەم شەریعەتە ئیجرا بکات. ئەگەر زۆر نەبیٚ کەس ناچیٚتە ژیٚر تەکلیف بۆیە وتویانە: مەزەب چوارە کوتەک پیٚنج.

ئافەرین کوتەک بۆ دەست و بردت     بۆ مل راکیٚشان ملهۆڕ و وردت

کوتەک لە بەینا نەبیٚ هەرنابیٚ     بیٚ ئەو حوکمی شەرع هیچ ئیجرا نابیٚ

سیٚهەم لە باسی قورئان حیکایەتی پیٚشوەکانە، وەکوو باسی پیٚغەمبەرەکان ئەکا. ئەم باسە کتیٚبی «قصص الانبیاء»ی بۆ دانراوە کە بە تایبەتی باسی

.............................................................

پێغەمبەرەکان ئەکا وە باسی پێغەمبەرەکان باسی خراپکاریشیان لەگەڵایە. بۆ نموونە باسی مووسا و هارِوون «لەسەریان بێ سەلام» باسی فیرعەون و نەمرودیان لەگەڵایە، بۆ ئەوە کە لە چاکەکان دەرس و مۆجگاری وەرگرین و لە خراپەکان عیبرەت و نەفرین. یا حیکایەت وە باسی داهاتوومان بۆ ئەکات بۆ ئەوە کە ئیمانمان پێی ببێ و بترسین. وەکوو مردن و زیندوو بوونەوە، سوئال و جوابی قەبر، قیامەت، حەشر، نەشر، حیساب و کیتاب، بەهەشت و جەهەننم، پردی سیراط، تۆڵەسەندنەوە بۆ هەموو گیاندارێکی ستەملێکراو.

جا منیش بە چاولێکەری قورئان بە گوێرەی زانین و توانینی خۆم چەن حیکایەتێکم لەگرا نووسیوە و ناوم ناوە «راز و نیاز» بە نیازی ئەوە کە هەموومان تەماشای کەین و مۆچیاری و عیبرەتی لێوەرگرین با نەبێ بە باسی ئەو کابرا کە وتی: باوکم حیکایەت خوانێ باش بوو، وتیان: گوێیان لێ ئەگرت؟ وتی: نەوەڵا، وتیان: جا بە کار چی ئەهات.

خودای تەعالا لە قورئانا فەرموویەتی «موژدە بدە بەو عەبدانی منە کە گوێ ئەگرن بۆ هەموو قسەیەک و ئەکەونە شوێن ئەویانە کە چاکترە»[1]. وەکوو ئەمانەم نووسیوە کتێبێکی‌تریشم کۆکردوەتۆ بە ناوی «کەلەپووری کوردی» کە پڕە لە پەندی پێشینیان و هەردووکیان بۆ مۆجگاری و عیبرەتن.

سەلام لەوانە گوێ ئەگرن بۆ حەق  دوورن لە ریا و لە درۆ و ناحەق

حەزرەتی سولەیمان سەلامی لەسەر بێ بە هۆردوویێ زۆرۆ لە جێیەکا خستبووی مێلورەیە رانە کولەیەکی گرت بە دەمیۆ و بە دیاری بردی بۆی، حەزرەتی سولەیمان فەرمووی: من بە خۆم و ئەم هەموو هۆردووە چی بکەم لەم رانە کولەی تۆ؟ مێلورەکە وتی: لێم بوورە:

هەرکەس بە گوێرەی دەسەڵاتی خۆی  دیاری ئەنێرێ لە بۆ گەورەی خۆی
منیش هەرئەونە دەسەڵاتم هەس  ئەمیشە زۆرە بۆ کەسی بێدەس

---

١. سورەتی زومەڕ ئایەتی/ ١٩

عارفی هەژار وەک ئەو مێلــووره مەعزەرەت ئەکا ئەڵـێ لێم بـووره
نەم تـوانی خزمەت کـەم بە وەتـەنم پاســەبانــێ بم بـۆ هـاو رەســەنم
ئـەم کـەم و کورتـە پێشکەشی ئەکەم چاوەڕوان قـەبووڵ لە ئێوه ئەکەم

ئەم کتێبە وا لەبەر دەستاندا ٢٦٦ بەسەرهاتی لە خۆ گرتووە لە چوار بەشا، بەشی ئەووەڵ کە لە ئایەت و تەفسیر وەرگیراوه ١٥ حیکایەتە، بەشی دووهەمی کـە لە حەدیس وەرگیراوه ٣٣ حیکایەتە. بەشی سێهەمی کـە لـە فـەرمایشی عولـەما وەرگیراوه ١٠٨حیکایەتە. بەشی چوارەمی کـە دەماودەم بیسراوه و پێی ئـەڵێن تەواتور ١١٠ حیکایەتە.

# بەشی هەوەل کە لە تەفسیر وەرگیراوە

«۱»

## لوقمانی حەکیم

لوقمانی حەکیم کوڕی باعورا کوڕی ناحوور کوڕی تاروخ باوکی حەزرەتی ئیبراهیم بووە، کە لە ساڵی دووهەمی پاشایەتی داووددا لوقمان لە دایک بووە و هەزار ساڵ عومری بووە لە ئاخر عومریدا بە خزمەتی حەزرەتی یونس گەییوە. حەکیم بووە و پێغەمبەر نەبووە، جارێک شەو لە خەوا بانگیان لێ کردووە و وتوویانە حەز ئەکەی بتکەین بە خەلیفە و قازی خوا لەسەر عەرزا کە حوکم کەی لە بەین خەڵکا؟ ئەڵێ: ئەگەر بە مەیلی خۆم بێ حەز لە ئیستراحەت ئەکەم، حەز لە بەڵا ناکەم، خوا خۆی ئیختیاری حاکمی من ئەکا و بە سەر و ماڵۆ حازرم بۆ ئیتاعەی و ئەبیسم و ئەزانم خوا کۆمەکم ئەکا و ئەمپارێزێت. مەلائیکەیەک دووبارە کە دەنگەکەی ئەبیست و ڕەنگەکەی نەئەبینی وتی: بۆچی قبووڵی حاکمی ناکەیت و بە بەڵای ئەزانی؟ وتی: حاکمی زۆر سەختە و تاریکی و بەڵا و ڕۆژ ڕەشی زۆر لە هەموو لایێکەوە ڕووی تێ ئەکا، ئەگەر عادڵ بێ نەجاتیەسی و ئەگەر زاڵم بێ ڕێگەی بەهەشتی هەڵەکردووە. ئینسان لە دونیادا زەلیل و ژێر دەس بێ باشترە لەوە کە گەورە بێ و خەڵک لە ژێر دەسیا بێ و لێی ڕازی نەبن. هەرکەس دونیای خۆشتر بوێت لە قیامەت تووشی بەڵای دونیایی ئەبێ و قیامەتی لە دەس دەرئەچێ. مەلائیکەکە لە جوانی جوابەکەی سەری سوڕما!. لوقمان خەوی لێ کەوت کە خەبەری بووەوە خوا حیکمەتی پێ عەتا کردبوو وتوویژی با حیکمەت ئەکرد و بوو بە وەزیر و کۆمەکی حەزرەتی داوود«سەلامی خوایا لەسەر بێ». پیاوێ تووشی بوو لە حاڵێکدا کە حیکمەتی بەیان ئەکرد وتی: تۆ فلان شوانەکە نەبوویت چۆن گەییتە ئەم دەرەجە؟ وتی: بە سێ شت ئەم دەرەجەم پێ درا: ۱.ڕاستی لە وتندا ۲.خەیانەت نەکردن لە ئەمانەتدا ۳.تەرکی کارێکم ئەکرد کە مەبەستی منی تیا نەبووبێ. لەبەر ئەوەی کە خوا عیلم و عەمەل و عەقڵ و فەهم بۆ ئەو یەک خستبوو بە «لوقمانی حەکیم» ناو بانگی دەرکرد.

لـە ئـەمانـەتـا خـەیانـەت مـەکـە | لـە وتـوو ویـژا درۆی تیـا مـەکـە
کـاریٚ مـەبـەستی تـۆی تیـا نـەبـیٚ | خۆت ئا لەو کارا سەر جەنجاڵ مەکە
بـا تـۆیش وەک لوقمـان سـاحیٚب حیکمەت بی | سەربەرز و رووسوور هەردوو دونیا بی

××

لوقمان خزمەت کاری ماڵیٚ بوو ساحیٚب ماڵەکە بۆ تەجرەبە و تاقی کردنەوەی وتی: تۆیش لەگەڵ خزمەتکارەکانترا بڕۆن بۆ باخەکەی خۆمان هەریەکیٚ کۆڵیٚ میٚوە بیٚننۆ بەو شەرتە کە لیٚی نەخۆن، رۆیشتن لە ریٚدا زۆر حەزیان لیٚ‌ئەکرد ئەڵیٚن بە لوقمان با بازیٚکی لیٚ بخۆین زۆرە، ساحیٚب ماڵ نازانیٚ کە لیٚی خوراوە، ئەڵیٚ ساحیٚب ماڵ رازی نیە و من نایخۆم و ئیٚوەیش مەیل خۆتانە. گوییٚ پیٚ نادەن و ئەیخۆن. دوایی ساحیٚب ماڵیٚ لیٚیان ئەپرسیٚتۆ: لیٚتان خوارد یا نە؟ هەموویان ئەڵیٚن: کەس لیٚی نەخواردووە لوقمان نەبیٚ. لوقمان بۆ رووسووری خۆی ئەڵیٚ بە ساحیٚبەکەی مەیدانیٚکمان بۆ دیاری کە لەم پەڕ بۆ ئەو پەڕ ڕاکەین، کە ڕائەکەن و ئاو گەرم ئەخۆنۆ هەموویان میٚوەکە هەڵیەننۆ، لوقمان نەبیٚ ئەمە ئەبیٚ بە دەلیل لەسەر ئەوە کە هەموویان ناڕاسن و خەیانەت کار بوون لوقمان نەبیٚ و دەرەجەی بەرزۆ ئەبیٚتۆ.[1]

❋❋❋

«٢»

## ژنیٚکی نەزانکار

وەکوو ئیشارەی قورئانە لە سوورەی نەحل ئایەتی ٩٥ ئەفەرمیٚ: «ژنیٚ بووە کە هەموو ڕۆژیٚ تا ئیٚوارە خوری رستووە، ئیٚوارە دووبارە کردوویەتۆ بە خوری ئیتر هیچ کاتیٚ گلۆلەییٚ بەنی نەبوە بیکا بە وسلە»، جا ئەمە تەمسیلە بۆ کەسیٚ چاکەییٚ بکا خۆی چاکەکەی لە خۆی تیٚک بدا، وەکوو ئەمە عیبادەت کات و ریای تیٚکەڵ کات، یا چاکە لەگەڵ خەڵکا کات و منەت بە سەریانا کات یا بیکولیٚنیٚتۆ. مەسەلەن کابراییٚ ڕاییٚ دادانی ئیٚشابوو چوبوو بۆلای دەدان کیٚشیٚ و بۆی کیٚشا. دوایی ئەونە لە

١. بۆ ئەم باسە تەماشای تەفسیری [illegible] بکە لە ئەوەڵی [illegible] لوقمان

...........................................................................

مەجلیسا کولانێو کە ئەو ڕۆژە باش فریات کەوتم ددانەکەم بۆت کێشا ئەونە دڵی ئازاری پێ‌ئەگات ئەڵێ ددانێکت بە ئێشۆ بۆ کێشاوم ئیسە بێ بێ‌ئێش دوو ددانم بکێشە و مەیکولێنەرۆ. ئەمەیە کە مەشهوورە ئەڵێن: ڕیسەکەی کردۆ بە خوری.

*** 

«٣»

## بەسەرهاتی حەزرەتی مووسا و خضر

بە حیکایەت لە حەزرەتی مووساوە ئەیگێڕنۆ کە لە دوای تیاچوونی فیرعەون و دارودەستەکەی بەنی‌ئیسرائیلیەکانی کۆکردەوە و خوتبەیێ عەجایەبی بۆ خۆندن کە گوێ‌گرەکان هەموویان هاواریان لێ‌بەرزەوە بوو، هەموویان لە جوانی و وردەکاری مەعناکەی سەریان سوڕمابوو. یەکێ لە گەورەکان بەنی‌ئیسرائیلی وتی: ئەی مووسا کەسێ ببێ لەسەر ئەرزا لە تۆ زاناتر بێ؟ مووسا ﷺ فەرمووی: وا نازانم لە خۆم لەسەر ئەرزا زاناتر ببێ. بازێ ئەڵێن ئەمە بە خەیاڵ بە دڵیا هاتووە وە بە دەم نەیوتووە. خوای تەعالا دوای ئەوە وەحی بۆ نارد کە لە «مجمع البحرین»ا بەندەیێکم هەیە کە زانینی تایبەتیم بەو داوە، لەگەڵ یەکێ لە دۆستە راستەقینەکانتا بڕۆ بۆ لای و ماسی برژاو لەگەڵ خۆتا ببە کە ئەو ماسییە جێگە و ڕێگەی ئەو پیاوەت نیشان ئەدا. بازێ ئەڵێن حەزرەتی مووسا «سەلامی لەسەر» چەن پرسیاری کرد لە خوا، خودایش جوابی داوە: س١: کام لە بەندەکانت لە هەموویان بە لای تۆوە خۆشەویسترە؟ ج: ئەویانە کە هەمیشە ناوی من ئەبا و منی لە بیر ناچێ. س٢: کام لە بەندەکانت عادڵ‌ترە؟ ج: ئەویانە حوکم بە حەق ئەکات و ناکەوێتە شوێن هەوای نەفس. س٣: کامیان زاناترە؟ ج: ئەویانە کە ئەگەڕێ لە هەرکوێ زانینێکی دەسکەوێ بەلای خەڵکۆ، یێنێتی بۆلای زانینەکەی خۆی بەشکو کە لیمەیەکی دەسکەوێ کە شارەزایی کا بۆ ڕێگەی هیدایەت یا لایدا لە کارێکی خراپ. حەزرەتی مووسا عەرزی خوای کرد: خوایا ئەگەر لە بەندەکانتا کەسێ هەیە کە عالم‌تر بێ لە من ڕاسپاردەم بکە بۆلای. خوا فەرمووی: ماسییەک برژاو بنێ ناو تۆشەبەرەیێ لە هەرکوێ ماسییەکە نەما ئەو زانا وا لەویا. وتی: بە ڕەفێقە جوانەکەی وەختێ ماسییەکە نەما خەبەرم بەرێ. دەسیان کرد بە ڕۆین. (لێرۆ ئەڕۆینەوە سەر

هەوەڵ باسەکە) ئەی موحەممەد بیرکەرۆ کە چۆن مووسا وتی بە شاگردەکەی کەوا عەبدی خوا بوو، یانێ یووشەعی کوڕی نوونی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی یوسف «لەسەریان بێ سەلامی خوا»: هەمیشە ئەڕۆم ناوێسم هەتا ئەگەمە جێگەیی کە پێی ئەڵێن «مجمع البحرين» کە بەحری رۆم و فارس لەویا تێکەڵ ئەبن تا ئەگەمە لای ئەو پیاوە زانا. یا ئەڕۆم زەمانێ دوور و درێژ تا هەشتا ساڵ. واتە بە هێچ جۆرێ دەس لەم سەفەرە خێرە هەڵناگرم تا ئەو زانا پەیا ئەکەم. پرسی لە یووشەع: هاوڕێیم ئەکەی کە بە دوای ئەو پیاوە ساڵحا بگەڕێین؟ یووشەع وتی: هاوڕێیی و رەفێقی تۆ بە نیعمەت ئەزانم. لە دوای ئەوە یووشەع چەن نانێک و ماسیەک برژاوی هەڵگرت، کە گەیینە ئەو شوێنە کە پێیان ئەوت «مجمع البحرين» لەسەر بەردێکا لەلای کانیێکا دانیشتن. مووسا خەوت یووشەع لە ئاو ئەو کانییە دەسنوێژی گرت. ئاوی دەستی تکا بە سەر ماسییەکەدا کە ئاوی حەیات بوو، دەس‌بەجێ ماسییەکە زینوو بووەوە و خۆی خستەوە ناو بەحرەکە. یووشەع لەم کارەساتە زۆر سەرگەردان بوو. مووسا خەبەری بووەوە و خەبەری لە حاڵی یووشەع و ماسییەکە نەپرسی، مل رێگەی گرت لەبەر ئەوە کە زۆر عەجەلەی سەفەرەکەی بوو ماسییەکە و خۆیانی لەبیر چووبووەوە، ماسییەکە رێگەی بەحرەکەی گرتەبەر چووە ناو ئاوەکە بۆ هەر کوێ ئەڕۆیی ئاوەکە بە سەریۆ وەک تاق ئەوێستا و زەویەکە وشک ئەبوو کە لەویا مووسا و یووشەع تێ‌ئەپەڕێن. مووسا وتی بە شاگردەکەی: خواردنێ چاشتمان بۆ بێنە با بیخۆین خۆ وەختی چاشت هاتووە و برسیمانە. قسەی ماسییەکە کەوتە بیری و وتی بە مووسا: لەبیرتە ئەو وەختە کە ئیسراحەتمان کرد لەسەر بەردەکە لای کانیەکە من لە بیرم چوو قسەی ماسییەکەت بۆ بکەم کەس لەبیری نەبردمۆ کە بۆتی بەیان کەم شەیتان نەبێ، کە لە بیری بردمۆ ماسییەکە بۆ هەرکوێ ئەڕۆیی چۆڵ ئەبوو لە ئاو و وشکی پەیا ئەبوو. مووسا وتی: قسەی ئەو ماسییە ئەوەتە کە ئێمە بە شوێنیا ئەگەڕێین چونکە خوا وەحی بۆ ناردم کە ئەم ماسییە رانماییت ئەکات بۆلای ئەو کەسە کە ئەگەڕی بە شوێنیا. دوای ئەوە گەڕانۆ بە شوێن پێکان خۆیانا بەو شوێنا رۆیین تا گەیینە ئەو شوێنە ماسییەکە چوو بووە ناو بەحرەکەوە، پردێ پان و وشکیان چاو پێ‌کەوت لەوێۆ هاتنە ناو بەحرەکە لەویا بەندەیی لە بەندەکانی خوایان پەیا کرد کە خوا ئەفەرمێ: بەومان داوە بەخششێکی گەورە لە

........................................................................................................

تەرەف خۆمانۆ کە وەحی و نبووەتە بە قەولی ئەوانە کە بە پێغەمبەری ئەزانن یا عومری درێژە بە وتەی ئەوانە کە بە پێغەمبەری نازانن، وە ئەومان فێر زانینێ کردووە لە تایبەتیەکان خۆمانە و کەسێ‌تر نایزانێ مەگەر کەسێ ئێمە تالیمان کردبێ.

ئەگێڕنەوە کە وەختێ گەیینە ئەو جێگە حەزرەتی خدر (خضر)لە بەحرەکەدا پاڵی دابوۆ و بە کراسەکەی خۆی داپۆشی بوو. مووسا سەلامی لێ‌کرد و خدر سەر خۆی لابرد و جوابی سەلامەکەی داوە و وتی: تۆ کێیی؟ وتی: من مووسام، پێغەمبەری بەنی‌ئیسرائیل. حەق تەعالا دەستووری پێداوم کە ماوەیێ رەفێق تۆ بم و شتێ لە تۆ فێر ببم. لە جوابا وتی: کەسێ بلێ من پێغەمبەری ساحێب شەریعەتم چۆن لە کەسی‌تر فێر ئەبێ! کە وتوویانە پێغەمبەری خوا ئەبێ عالم‌تربێ لەوانە کە ئەڕوا بۆلایان لەو شتانا کە هێناویەتی لە تەرەف خوداوە لە ئوسووڵ و فرووعی دینا. حەزرەتی مووسا فەرمووی: تۆ عیلمێ جیاوازت هەیە ئیجازە ئەدەی کە من بێم بە شوێنتا لەسەر ئەم شەرتە کە فێرم کەی لەو عیلما کە تۆیان فێر کردووە؟ عیلمێ کە رێی خێری پێ بدۆزینەوە؟ حەزرەتی خدر فەرمووی: هیچ وەختێ ناتوانی خۆت راگری لەو کارانا کە من ئەیکەم. مووسا فەرمووی: بۆچی ناتوانم سەبر بکەم؟ حەزرەتی خدر فەرمووی: لەبەر ئەوە تۆ ساحێب شەریعەتی رێی تێ ئەچێ کە لە منۆ رەفتارێ دەرکەوێ کە بە زاهیر ناشیرین و ناپەسەند بێ و تۆ حیکمەتەکەی نەزانی و خۆت بۆ رانەگیرێ، چۆن خۆت بۆ راگیر ئەبێ لە شتێکا کە عیلمی تۆی پێ‌رانەگەییوە؟ مووسا وتی: خودا مەیلی بێ زوو بە زوو منت چاو پێ‌ئەکەوێ بە خۆڕاگر لەوانا لە تۆوە چاوم پێ‌ئەکەوێ و نافەرمانیت ناکەم لە هیچ کارێکا. «خضر» وتی: ئەی مووسا ئەگەر ئەکەویتە شوێنم ئیتر لە من مەپرسە لەوا کە تۆ بە خراپی ئەزانی تۆ رێگە دروسەکەی نازانی تا خۆم بۆت بەیان ئەکەم بە جۆرێ کە بە باشی حاڵی ببی. مووسا ئەمەیە قەبووڵ کرد و هەردوو پێکەوە رێ‌کەوتن و یووشەع کەوتە شوێنیان بە قەراخ بەحرەکەدا رۆیشتن تا گەیین بە کەشتییێ لە سەرنشینەکانی داوایان کرد کە سواریان کەن لە هەوەڵۆ سواریان

کردن تا خدریان ناسی ئیتر سواریان کردن به تەعزیمێ زۆرۆ. وەختێ چوونە ناو شتییەکە، (حەزرەتی خضر) چەن تەختەیەکی لابرد مووسا وتی: تۆ چۆن ئەم شتییە کون ئەکەی ئاوی تێ بچێ و سەرنشینەکانی غەرق بن؟! تۆ کارێکی یرین و ناپەسەندت کردووە کە بە سەر دلانۆ گرانە! خدر وتی: ئەی پێم نەوتی ناتوانی خۆت راگری لە رەفێقی منا. مووسا وتی: بمبەخشە کە لە بیرم چوو خت گیریم لێمەکە بەبۆنەی ئەم نافەرمانیەوە کە کردوومە.

دوای ئەوە لە کەشتییەکە هاتنە دەرەوە رۆیین تا گەیشتنە دێیێ لە قەراخ بەکەدا کۆمەڵێ منالان گەمەیان ئەکرد کوڕێکی جوانخاس و بالا بەرز لە ناویانا ر کە خەتێ سەوز بە پشتیەوە بوو مووسا و خدر ئەڕۆیین تا گەیین بەو منالە. خدر گی کرد بۆ پەنای دیوارێ و لەوێ منالەکەی کوشت!. مووسا وتی: بۆچی ئەو لە پاکە بێگوناهەت کوشت خۆ کەسی تۆی نەکوشتووە؟ کارێکی ناپەسەندت رد خضر وتی: ئەی پێم نەوتی تۆ ناتوانی رەفێقی من بکەی و خۆت بۆ اگیرێ!. من و تۆ ئەبێ لەیەک جیاوبین بە کەڵکی رەفێقی نایێت. مووسا وتی: ای ئەم کەڕتە ئیتر تۆ رەفێقی من مەکە ئەگەر نافەرمانیم کرد ئیتر بوو بە عزەرەت لە تەرەف منۆ کە دوو ڕا نافەرمانیم کردووە. لە حەدیسا هەیە ئەگەر وسا خۆی راگرتایێ زۆرتر عەجایەباتی چاو پێئەکەوت. هەروا رۆیشتن تا ونە لای ئەهلی دێیێ کە ناوی ئەنتاکیە بوو بە دەوریا حەسار کشابوو ئەهلی ئەو بە وەختێ شەوهات دەروازەی دێکەیان ئەبەست و بۆکەس نەیان ئەکردۆ تا انی. نوێژی شێو بوو کە مووسا و خدر گەیینە ئەو دێیە گەرەکیان بوو بچنە ناو کە کەس درگای بۆ نەکردنۆ داوای خۆراکیان لێ‌کردن وتیان: ئێمە لێرا غەریبین رسیمانە کە جێمان ناکەنۆ بێینە ناو دێ بازێ خۆراکمان بۆ بنێرن. خۆدزکیان کرد میواندارییان بکەن. شەو بە برسی لەویا مانۆ بەیانی چوونە ناو دێکە چوونە لای ارێ کە لارۆ بووبوو نزیک بوو بکەوێ لە دوای ئەوە خدر راسی کردەوە وسا وتی: ئەم دێیە ئێوارە جێی ئێمەیان نەکردۆ خۆراکیان پێ‌نەدایەن تۆ بۆچی

................................................................................

دیوارەکەیان تازە ئەکەیتۆ ئەگەر مەیلت بوایێ کرێت لێ‌وەرئەگرتن. خدر وتی: ئەمەتە وەختی جیابوونەوەی من و تۆ.

دوای سێ کەڕەت نافەرمانی منت کرد. خەبەرت پێ‌ئەدەم لە مەعنای ئەوانە کە خۆت بۆڕانەگیرا و لە زاهیری ئەو ئینکاریت ئەکرد، ئەو کەشتییەکە کونم تێ‌کرد مالی دە فەقیر بوو پێنجیان بێ‌چارە و بێ‌کارە بوون پێنجیان کاریگەری کەشتییەکە بوون لە بەحرا کاریان ئەکرد گەرەکم بوو کەشتییەکە عەیبدار کەم لە بەر ئەوە کە لە بەردەمیانا حاکمێ زالم بوو هەر کەشتییە ساق بوایێ داگیری ئەکرد لە ساحێبەکەی لەبەر ئەوە عەیبدارم کرد کە ئەو زالمە نەیبا و ئەو دە نەفەرە فەقیرە بێ‌بەش نەبن. ئەمما ئەو کوڕە کە من کوشتم باوک و دایکی ئیماندار بوون و ئێمە ترساین لەوە کە بەبۆنەی ئەو منالۆ تووشی بێ‌باکی لە گوناهـ و تووشی نا سوپاسی نیعمەت ببن لەبەر مەحەببەت ئەولادەکەیان گەرەکمان بوو کە خوای گەورە ئەو منالە بگۆڕێ بە منالێ باشتر و پاک و تەمیز لە گوناهـ و نزیکتر لە بەخشش و میهرەبانی یا لەگەڵ دایک و باوکیا. ئەگێڕنۆ کە خوای گەورە کچێکی پێدان لە جێی ئەو کوڕە کە شووی کرد بە پێغەمبەرێ کە حەفتا پێغەمبەر لە نەتەوەی ئەو کچە پەیا بوون. ئەمما دیوارەکە راسمان کردۆ ماڵ دوو منالی هەتیو بوو کە ناویان نەسر و موسریم بوو کوڕە کوژیاویش ناوی خەسیوم بوو وە ئەو دوو هەتیوە وان لەو شارا و لە ژێر ئەو دیوارا خەزێنەیەک هەیە کە ماڵ ئەو هەتیوانەیە ئەگەر ئەو دیوارە لاچوایێ خەزێنەکە دەرئەکەوت و خەلک ئەیبرد. باوکی ئەوان پیاوێ سالح بووە پێیان وتووە کاسخ. ئەلێن ئەو کاسخە باوەگەورەی حەوتەمیان بووە خودای تەعالا لەبەر خاتری ئەو پیاوە سالحە چاودێری ئەوانی کردووە. پەروەردگارت گەرەکی بوو ئەو دوو هەتیوە گەورەبن و عەقل پەیا کەن و خەزێنەکەی خۆیان دەربێنن. ئەم کارەساتە کە کردم بەخششێ بوو لە تەرەف پەروەردگارتۆ و ئەم کارمە لە خۆمەوە نەکردووە بەلکوو بە فەرمانی حەق‌تەعالا کردم کە ویستی خەزێنەکە بگاتەوە دەس خاوەنی. بازێ ئەلێن ئەو خەزێنە تەلا و نوقرە بووە. بازێ‌تر ئەلێن کتێبێ عیلمی بووە. وە مەشهورتر ئەوەتە کە لە وەحی بووە لە تەلا لێی نوسراوە:

بسم الله الرحمن الرحیم

۱.عەجایب ئەمێنم لەو کەسە کە ئیمانی بە قەزاو قەدەر هەیە چۆن بۆ بەلا غەمگین ئەبێ.

۲.عەجایب ئەمێنم لەو کەسە کە ئیمانی بە رازقی خوا هەیە بۆچی خۆی ئەونە مانوو ئەکا بۆ رزق.

۳.عەجایب ئەمێنم لەو کەسە کە بڕوای بە مردن هەیە چۆن دڵ خۆش ئەکا بۆ ڕابواردن.

٤- عەجایب ئەمێنم لەو کەسە کە بڕوای بە قیامەت هەیە چۆن لە قیامەت غافڵ ئەبێ.

٥- عەجایەب ئەمێنم لەو کەسە کە ئاڵووگۆڕی دونیا و ئاڵووگۆڕی ئەهلی دونیای چاو هاتێوە چۆن دڵ ئەبەستێ بە دونیاوە. لا الە الا الله محمد رسول الله. ئەمە حەقیقەتی ئەوەیە کە نەتتوانی لە سەری سەبر بکەیت و خۆت ڕاگری. ئەگێڕنۆ لە دوای ئەوە حەزرەت مووسا و خدر خواحافیزیان لەیەک کرد و هەریەک ڕۆینۆ بۆ مەنزڵ خۆیان.

لە تەفسیری «بیضاوی»ا نووسراوە کە ئەم بەسەرهاتی مووسا و «خضره» چەند فایدەی هەیە: ۱.ئەبێ ئینسان بە زانینی خۆی بایی نەبێ و پەلە نەکا لە ئینکاری شتێکا کە خۆی باش نایزانێ بەشکوو سیرڕێکی تیابێ کە ئەم ئاگای لێنەبێ. ۲.هەموو وەخت خۆڕاگری ببێ بۆ فێر بوونی ئەوەی کە نایزانێ و خۆی زەلیل کا لە بەردەس مامۆستایا و ئەدەبی زۆری لێبکا لە وتارا وەکوو حەزرەتی مووسا لەگەڵ حەزرەتی خدرا. ۳.ئەبێ خەتاکار ئاگادار بکات لەسەر خەتاکەی و عەفووی کا، تا زەرەرەکەی بۆ مەعلووم ئەبێ دوای ئەوە تەرکی کات. وە دووبارە لەو تەفسیرا نووسراوە لە بارەی ئەو دێوە کە خۆدزکێیان کرد لە میوانداری مووسا و خدر کە ئایەتەکە ئەفەرموێ: ﴿فأبوا أن یضیّفوهما﴾ خۆدزکێیان کرد لە میوانداریان. وتیان ئەم ئایەتە تا ماوە بەدناوی ئێمە لە ناو خەڵکا ئاشکرا ئەکا چوون بۆلای کاتبی وەحی و ئەوانە کە قورئانیان ئەنووسیۆ، وتیان ئێمە باری وشترێ تەلا و جەواهێرتان پێئەدەین ئێوە «أبوا»مان بۆ بکەن بە «اتَوا» واتە چوون بە پێشوازییانۆ بۆ میوانداریان.

ئەوانە کە قورئانیان ئەنووسییۆ وتیان دونیامان بۆ بکەن بە تەلا «اَبَو» ناکەن بە« اَتـو»
قورئان خوا زامنیەتی تا ئاخر زەمان حەرفێکی ناگۆڕێ. خوا گەرەکی بوو دونیا
تەواوکا تا قورئان مابێ تەواوی ناکا. هەرکەسێ قورئان بزانێ لەبیری ئەچێتۆ
ئەوەیشەکە نووسراوە مەحووی ئەکاتۆ جا دونیا وێران ئەکا کەوابێ ئەبێ قورئان
حاکم بێ تا دونیا ماوە.

قورئان پێشەوای ئەهلی ئیمانە  بو دین و دونیا ئەو رابەرمانـــــە
با تکاکار بێ لە بۆ هەموومـان  خوا تاوان لابا لە سەر هەموومان

* * *

«٤»

## بەسەرهاتی قابیل و هابیل

تەرجەمەی تەفسیری حوسەینی سوورەتی مائیدە ئایەتی ٣٠ تا ٣٦: «ئەی
موحەممەد بیخوێنەرۆ بەسەر ئەهلی کیتابا خەبەری دوو کوڕەکەی حەزرەت ئادەم،
قابیل و هابیل، بەڕاستی و دروستی. بەسەرهاتی ئەوان بە کورتی ئەمەیە کە حەوا
بیست و یەک سکی کوڕ و کچی کردووە. بیستیان دوانە بوون، یەک کوڕ و یەک
کچ و حەزرەتی شیس کە پێغەمبەر بووە تەنیا خۆی لە سکی حەوا پەیا بووە. کا
گەورە ئەبوون بە شەرعی حەزرەتی ئادەم «سەلامی لەسەر» کچی هەر سکێکی بۆ
کوڕی سکێکیتری ئەشیا. ئەو کچە کە لەگەڵ قابیلا بە یەکۆ لە دایک بوون ناوی
ئەقلیما بوو زۆریش جوانچاک بووە و ئەو کچەی کە لەگەڵ هابیلا لە دایک بوو
ناوی لیونا بووە و زۆر جوانخاس نەبووە. کە پێگەیین حەزرەتی ئادەم ئەقلیمای
دیاری کرد بۆ هابیل. قابیل لەم حوکمە سەرپێچی کرد و وتی: خوشکی مـ
جوانترە و لەگەڵ من لە سک دایکا بووین بۆ من باشترە. ئادەم وتی: حوکمی خو
بەم جۆرەیە ئیختیاری ئێمەی تیا نیە. قابیل تەسلیمی نەبوو وتی: تۆ ئەوت لە مـ
خۆشتر ئەوێ بۆیە ئەویانە جوانە ئەیدەی بەو. ئادەم فەرمووی ئەگەر باوەڕ بە مـ
ناکەی هەریەکێ لە ئێوە خێرێ بکەن خێری هەرکامتان قبوڵ بوو ئەقلیما بۆ ئەوتا
وەکوو ئایەتەکە ئەفەرموێ هەرکەس بە خێرێ خۆیان لە خوا نزیک کرد و هابیـ
حەیواندار بوو مەڕێ قەڵەوی بوو کە زۆری خۆشەویست. هێنای بردیە سەر کێـو

نیەتی هانی و وتی: ئەگەر خێری من قبوڵ نەبێ تەرکی ئەقلیما ئەکەم. قابیل کە کشتوکاڵی بوو دۆنمێ گەنمی کەم دانی هانی نای بە سەر کێوێکۆ هەر لەویا لەبەر خۆیۆ ئەیوت: خێری من قبوڵ بێ یا نەبێ من دەسبەردار خوشک خۆم نابم.

ئینجا خێر لە یەکێکیان کە هابیل بوو وەرگیرا، بەم جۆرە کە ئاورێ بێدووکەڵ لە ئاسمانۆ هاتوو مەڕەکەی قووت کرد ئەوی‌تریان خێرەکەی قبووڵ نەبوو و ئاور نەهات بەلایا قابیل دڵی پڕ بوو ئاوری رقەبەری و حەسوودی چاوی عەقڵی کوێر کرد. قابیل وتی بە هابیل قەسەم بە خوا ئەتکوژم لەبەر ئەوە کە خێرەکەی تۆ قبووڵ بوو و خێرەکەی من قبووڵ نەبوو. هابیل وتی: خوا هەر لەو کەسانەی خێر قبووڵ ئەکا کە لە خوا ئەترسن، ئەگەر تۆ دەس درێژی بکەی بۆ کوشتنی من، من دەس‌درێژی ناکەم بۆ کوشتنی تۆ من لە خوا ئەترسم کە پەروەردگاری هەموو عالەمە. هەرچەن هابیل قەوی‌تر و بە شەوکەت‌تر بوو خۆی کز کرد، هابیل وتی: من ئەمەوێ تۆ گەڕێیتۆ بۆلای خوا بە گوناهی منیش و خۆیشتۆکە بیبەی لەگەڵ خۆتا. وە ئەمیشە موافق ئیرادەی خوا بوو ئیتر تۆ ئەبی بە جەهەننمیەکی هەمیشەیی و سزای جەهەننم سزای ئەو زاڵمانەیە کە قەتڵ ئەکەن. قابیل نەفسی هەڵێنا بۆ کوشتن براکەی وکوشتی. وەختێ قابیل ئەیویست براکەی بکوژێ نەیئەزانی چۆنی بکوژێ. شەیتان لە شێوەی بەشەرێکا خۆی نیشان دا، باڵدارێ بەدەسێۆ بوو سەری باڵدارەکەی نا سەر بەردێکوو بەردێ‌تری ماڵی بەسەریا و مرد. قابیل سەبری کرد تا وەختێ هابیل سەری نابووە سەر بەردێ خەوتبوو بەردێکی ماڵی بە سەریا و کوشتی و لە دوای ئەوە زەرەرمەندی هەردوو دونیا بوو. زەرەر دونیای ئەوەبوو کە مەهتووک و بێ‌حورمەت بوو. تەنیا کەوت و کەس لەگەڵیا ئاشنایی نەئەکرد. زەرەر قیامەتی ئەوەبوو کە نیوەی عەزابی جەهەنم بۆ ئەوە کە یاسای قەتڵی دامەزراند.

دوای ئەوە قابیل نەی ئەزانی چی بکا لە هابیل. پێچای لە کراسێکۆ تا چل شەو گرتی بە کۆڵێۆ بۆ هەرکوێ ئەڕۆیی بە ریوایەتی «ابن عباس» تا ساڵێ هەر بە کۆڵێۆ بوو تا بۆگەنی کرد دوڕندە و تەیر و تیوور چاودێرییان ئەکرد کە داینێ و بیخۆن. دوای ئەوە خوا قالاوێکی نارد کە قالاوێکی‌تری کوشتبوو بە دەنووکی و پای چاڵێکی کەند و لاکی قالاوەکەی تێ‌خست و داپۆشی. قابیل وتی وای بۆ

..........................................................................................

من، که نەمزانی وەکوو ئەو قالاوە بم لە داپۆشین براکەما. قابیل بەو جۆرە براکەی داپۆشی بە خاک لە دوای ئەوە زۆر پەشیمان بوو لەوە کە ئەو موددەتە براکەی ناکۆلی و لەوە کە دایک و باوکی عاجز کرد و ئەوان تەبەرڕایان لێ کردووە، لەوەکە هەموو لەشی رەشۆ بوو بوو. دەنگێکی ئەبیست ئەیوت: تا ماوی هەر لە ترسا بە. دوای ئەوە قابیل بۆ هەرکوێ ئەڕۆیی ئەترسا لەوە لە کوتوپڕا یەکێ پەیا بێ و بیکوژێ. لە ئاخرا کوڕێ کوێر لە نەوەی خۆی کوشتی. بە سەبەبی ئەم قەتلۆ. خودا خۆی ئەفەرموێ: حوکمان نووسی بەسەر بەنیئیسرائیلدا هەرکەسێ بە ناحەق کەسێ بکوژێ بێ قیساس و بەبێ فەساد لەسەر ئەرزا وەکوو ئەوە وایە عالەمی کوشتبێ. فەسادی سەر ئەرز کە کوشتن حەلاڵ ئەکا سێ شتە ١.جەردەیی «رێگرتن»، ٢.کوفر کردن، ٣.زینا کردنی ژنێ شووی کردبێ یا پیاوێ ژنی هێنابێ وە هەرکەس ببێ بە سەبەب مانەوەی کەسێ و تیانەچوونی بەو جۆرە کە لە قیساس عەفووی کا یا مەنعی کا لە قەتل یا رزگاری‌کا لە تیاچوون، وەکوو ئەوە وایە کە بووبێ بە سەبەب بۆ ژیانی هەموو ئینسانێ. مەبەستی ئەم ئایەتە ترساندنمانە لە کوشت و کوشتار و هەڵنانمانە بۆ مانەوەی ژیانی ئینسانی.

* * *

«٥»

## شەدداد

٥- تەرجەمەی تەفسیری حوسەینی سوورەتی «والفجر» ئایەتی ٥و٦و٧ ئەفەرموێ: «ئەی موحەممەد بۆچی تۆ نەتدیوە و نەتزانیوە کە پەروەردگاری تۆ چی کرد قەومی عاد». عادی ئیرەم و ئیرەم ناوی باوەگەورەیان بووە چونکە عاد کوڕی عەوسە، عەوس کوڕی ئیرەمە، ئیرەم کوڕی سامە سام کوڕی حەزرەتی نووحە. دوایی‌یا ئیرەم بوو بە ناو بۆ شارەکەیان کە ئەهلی ئەو شارە زۆر بالابەرز و شەکەت بوون، کە لە شارەکانا وەکوو ئەوان دروس نەبووبوو لە بالا بەرزی و گەورەیی بەدەنا. خۆلاسەی ئەم قسە: بینای شاری ئیرەم ئەمەیە کە عبداللەی کوڕی قولابە شوێن وشترێکا ئەگەڕا لە سەحرای عەدەنا گەیی بە شارێ کە زۆر پایەکەی مەحکەم بوو و بە دەوری ئەو شارا تەنیا ماڵێ بەرز و نایاب بوو، بە دەوری ئەو

و قەسرانا ئەگەڕا بەشکوو کەسێ پەیدا کا بۆ وشترەکەی بپرسێ. کەسی بۆ پەیا نەبوو دەروازەی ئەو شاریە دۆزییۆ و هەردوولاشیپان درگاکە رازابووەوە بە جەواهێری قیمەتی و هیچ‌کەسی تیا نەبوو زۆر بە لایۆ عەجایەب بوو و سەری سوڕما. کە چووە ژوورەوە و زۆرتر سەرسام بوو لەبەر ئەوە کە پایەی ئەم قەسرانە بە سەر کۆڵەکەی زەبەرجەد و یاقووت دانرا بوو، خشتێکی تەڵا و خشتێکی لە زیو بوو، فەرشی جوان و ناسک و رازاوەی بوو لە جێی بەردە وردە مرواریيان داخستبوو کە ئاوی لێ‌ئەتکا لە ئەترافی کۆلانەکان ئەو شارا ئاو رەوان ئەبوو بەسەر لوءلوء و مەرجانەوە. درەختی زۆری تیا بوو کە لقەکانی لە تەڵا و گەڵاکانی لە زەبەرجەد و گوڵەکانی لە زیو بوو. لەبەر خۆیۆ وتی: ئەمە ئەو بەهەشتەیە کە خوا وادەی داوە بەو کەسانە کە لە خودا ئەترسن. کۆڵێ لەو جەواهێر و تەڵایە لەگەل خۆیا هەڵگرت و هاتۆ بۆ یەمەن کە خەڵکی ئەو گەوهەرە جوانەیانە چاو پێ‌کەوت، وتیان: خەزێنەت دۆزیوەتۆ قسەکە دەماودەم کەوت تا حەزرەت موعاویە «خوای لێ رازی بێ» بیستی کە لەو وەختا حاکمی شام بوو کوڕی قولابەی بانگ کرد. تەواوی بەسەرهاتەکەی لە ئەووەڵ تا ئاخری بۆ گێڕاوە، دوای ئەوە لە مەجلیسەکە داینا. «کعب الاحبار» کە گەورەی عالمی ئەو رۆژە بوو بانگی کرد و لێی پرسی کە لە دونیادا شاری وا هەیە کە لە تەڵا و زیو دروست کرابێ و درەختەکانی رازەوە بێ بە جواهێر؟ «کعب الاحبار» وتی: ئەوە شارێکە خودای گەورە لە بارەی ئەوەوە ئەفەرموێ: شاری وا لە شارەکانا دروست نەکراوە کە ئەو شارە شەددادی کوڕی عاد دروستی کردووە، کە شایێ زۆر بە دەستەڵات بووە و حەوت‌سەد ساڵ عومری کردووە لە هەرکوێ تەلایێ زیوێ جەواهێرێکی لای یەکێ سۆراغ کردبێ، کردوویە بە خەرجی ئەو شارە. سەد پالەوانی کردووە بە مەئموور و هەریەکێ هەزار نەفەر نۆکەری خستبووە بەردەستیان بۆ ئەوە شاری ئیرەم دروست کەن بە سێ‌سەد ساڵ جا تەواو بوو. یەک ساڵ تەواو خەریکی رێگە دروست کردن بوون هەموو حاکمەکانی ئەو سەردەمەی کۆ کردەوە و لە پێ‌تەختی خۆیا کە بڕۆن بۆ ئەو شارە رێ‌کەوتن بۆلای شارەکە و رۆژێ رێگەیان مابوو گەیێنە ناو شارەکە، خوای گەورە تاقە مەلایکەیەکی نارد قیڕانی بەسەریانا هەموویان مردن و ئەو شارە لەبەر چاو خەڵکا شاریاوەتۆ. «کعب الاحبار» وتی بە

موعاویە: لە کتێبا دیومە کە لە زەمانی حوکوومەتی تۆدا پیاوێ بەم ناو نیشانە پەیا ئەبێ ناوی عبداللەیە، کۆتا بالایە و چاوی سەوزە، خالێ ها بەروویۆ، نیشانەیە ها بە ملیۆ بە شوێن وشترا ئەگەڕێ ڕێی ئەکەوێتە ئەو شارە بەشکوو ئەو کەسە پەیاکەی. حەزرەتی موعاویە تەماشای کۆمەڵەکەی کرد بەو ناونیشانە عبداللەی دۆزییەوە و وتی: واللە ئەوە ئەو پیاوەیە.

جا ئەم بەسەرهاتە بۆ ئەوە لێرا نووسیومە کە کەسێ بە زۆرداری و کەسداری و عومر درێژی و ساق و سلامەتیا نەنازێ هەروەخت خوا مەیلی بێ وەکوو شەدداد ئەمانپێچێتۆ. با بزانین عاد کە مرد دوو کوڕی لە دوا جێما شەدداد و شەدید بە وەسیەت خۆی ماڵی بۆ بەش کردن مەردە ماڵ بۆ شەدید و زیندە ماڵ بۆ شەداد. شەدید مرد میراتەکەی جێما بۆ شەدداد جا شاری ئیرەمی دروست کرد. دوای حەوتسەد ساڵ عومر ئەویش مرد.

ئێمە دروست بووین هەموو بۆ مردن بۆعیبادەت و بۆتاعەت کردن
زاڵم و مەزڵوم بەران بەر ئەبن لای خوا مەزڵوم بەرەندە ئەبن

***

«٦»

## مووسا و کارەساتی سەرسوڕهێنەر

تەفسیری خازن بەرگی یەک لاپەڕەی ٤٣٩: خەبەر نووس و مێژوو نووسەکان وتوویانە: کە خوای تەعالا وەعدەی دا بە حەزرەتی مووسا «سەلامی لەسەر» کە عەرزی موقەددەس بکا بە جێگە بۆ خۆی و بۆ قەومەکەی. لەو وەختا کە کافرەکان نیشتەجێی ئەوێ بوون. دوایی خوا دەستووری دا بە مووسا لەگەڵ قەومەکەی بڕۆن بۆ «بیت المقدس» و خودا فەرمووی من ئەو شوێنەم نووسیوە بۆ ئێوە کە بیکەن بە ماڵ و قەرارگا بۆ خۆتان. ڕۆیی‌یە دەرۆ مووسا بۆ ئەوێ شەڕ و غەزاکا لەگەڵ ئەو دوژمنانا کە خوا ئەیفەرموو لەوێ من کۆمەکی تۆم و زاڵت ئەکەم بە سەریانا و ئەبێ دوانزە نەفەر لەم قەومتە بکەی بە گەورە و کەفیل لە هەر تایفەیێ نەفەرێ، کە بە وەفا بن لەسەر ئەوە کە ئەمریان پێ کراوە حەزرەت مووسا سەلامی خوای لەسەربێ دوانزە نەفەری هەڵبژارد و لەگەڵ قەومەکەی ڕۆیین تـ

نزیک بوونۆ لە شاری ئەریحا کە شارێ بوو لە شاری کافرەکان. دوای ئەوە ئەو دوانزە نەفەریە نارد کە جاسووسی بۆ کەن و خەبەری بۆ بێننۆ کە چی ئەکەن. کەسێ لەو کافرانەیان پێ‌گەیی کە پێیان ئەوت «عوج»ی کوڕی «عنق» کە عەنەق ناو دایکی بوو و یەکێ بوو لە کچەکانی حەزرەتی ئادەم‌علیه‌السلام، درێژی بالای ۳۳۳۰ زیراع و سێ‌یەکی زیراعێ بووە. «بغوی»ش هەر وای نووسیوە. وەلێ لەم ریوایەتا ئیختیلاف هەیە لەبەر ئەوە حەزرەتی ئادەم وەکوو لە حەدیسا هەیە لە شەست زیراع زیاتر بالای نەبوە و «عوج» خۆی لە ناو هەورا ڕائەگرت و ئاوی هەوری ئەخواردۆ و لە بێخ بەحرا ماسی ئەهانیە دەرۆ ئەیدا بە خۆر ئەی برژاند و لە وەختێ تۆفانی حەزرەتی نووحا کە لە هەموو جێگایێ چل گەز ئاو بوو لە هیچ‌کوێ نەئەگەییە ئەژنۆی وتی: بە حەزرەتی نووح رێم کەروە لە کەشتیەکەتا نووح فەرمووی بڕۆ دەرۆ دوور کەوەرۆ لێم من ئەم ئەمرەم پێ نەکەراوە.

عوج ۳۰۰۰ سێ هەزار سالێ عومری بووە. تا خوا دوایی عومری هێنا لەسەر دەسی حەزرەتی مووسادا‌علیه‌السلام هەلاکەتی بەم جۆرە بوو: بەردێ گەورەی هەڵکەندبوو بە قەی جێی هۆردووەکەی حەزرەتی مووسا کە فرسەخێ بوو لە فرسەخێکا نابووی بە سەریۆ تا بیدا بە سەریانا، خوای گەورە پەپووسلێمانەی نارد کە بەدەنووکی بەردەکەی لەت و پەت کرد وکەوت بەسەر عووجدا. ئیتر کەوت بە عەرزا. حەزرەت مووسا هات بە لایا کەوتبوو کوشتی لەبەر ئەوە کافری حەربی بوو. ئەڵێن وەختێ «عوج» ئەو دوانزە نەفەریە گرت نانیە بن دەستی بردنیۆ بۆلای ژنەکەی و وتی: ئەمەوێ لەقە شێلیان بکەم ژنەکەی وتی: بەرەڵایان بکە با بڕۆنۆ خەبەر بەنۆ بۆ قەوم و کەسیان ئەوە کە بینیویانە وتی: ئەمانە کەسانێکن ئەیانەوێ بمانکوژن. بازێ ئەڵێن دوانزە نەفەرەکەی خستە باخەڵی بردنی بۆ لای حاکم هەڵی رژاندن. حاکم وتی: با بڕۆنۆ بۆلای قەومەکانیان با چییان دیوە بیگێڕنۆ بۆیان.

یەکێ لە عەجایەبات ئەوەبوو کە بۆلەترێیان بوو مەگەر بە کۆمەک پێنج نەفەر لە خۆیان بۆیان بەرزۆ بوایێتۆ، هەناریان بوو دوای لابردن دنکەکانی پێنج نەفەر لە ناویا جێی ئەبووەوە. دوانزە نەفەرەکە گەڕانۆ لە بەین خۆیانا وتیان با ئەوە کە دیومانە نەیگێڕینۆ بۆ قەومەکەمان نەکا بترسێن و ئیتر لە شەڕا کۆمەک بە حەزرەت مووسا نەکەن وەلێ بیگێڕینۆ بۆ حەزرەت مووسا و هاروون. کەچی

خۆیان نەگرت هەموو گێڕایانۆبۆ قەومی خۆیان دوو نەفەریان نەبێ «یوشع» کوڕی «نون» و «کالب»کوڕی «یوحنا». ئەمە نووسراوە بازێکی بە عادەت ئێمە زۆر دوورە لە عەقلۆ وەلێ بە نیسبەت قودرەتی خواوە زۆر سەهلە. جا ئێوە بۆ خۆتان بڕۆن تەماشای تاریخ بکەن و بزانن شتیوا بووە؟!.

* * *

«۷»

## ئەخلاقی جوانی پێغەمبەرﷺ

خوا تاریفی پێغەمبەرﷺ ئەکا و ئەفەرموێ: «تۆ وای لەسەر خولقی گەورە». بۆ نموونە: پیاوێ رۆیی بۆ خزمەت پێغەمبەرﷺ وتی: خەیاڵی زینا کردنم هەیە فەرمووی تۆ دانیشە با چەن پرسیارێکت لێبکەم. فەرمووی: تۆ ژنێکت ببێ حەزئەکەی یەکێ لە گەڵیا زینا بکا؟ وتی: نەخێر. فەرمووی: ئەی لەگەڵ دایکتا وتی: نەخێر. فەرمووی: لەگەڵ خوشکتا؟ وتی: نەخێر. فەرمووی: ئەی لەگەڵ کچتا وتی: نەخێر. فەرمووی لەگەڵ پوورتا؟ وتی: نەخێر، حەتتا دەسیشم بڕوا ئەو کەسە کاری وا بکا ئەیکوژم. فەرمووی: ئەو ژنە کە تۆ ئەتەوێ کاری وای لەگەڵ بکە کەس‌وکاری هەیە و پێیان ناخۆشە و ئەبن بە دوژمنت و دەسیان بڕوا ئەتکوژن نەفەرەکە وتی: زۆر حەز لەو کارە ناباره ئەکەم دۆعام بۆ بکە کە ئەو خەیاڵە بەتاڵ لە سەرم دەرچێ. پێغەمبەرﷺ دەسی پیرۆزی هێنا بە سەر دڵیا و فەرمووی: خوا گەورە ئەو خەیاڵە لە دڵیا لابە و پەرژینی حەیای بکە، نەڕوا بە شوێن ئەو کا ناڕەوادا. نەفەرەکە وتی: کە رۆییم بۆ خزمەتی لە دونیادا هیچێ نەبوو بە قەی ز حەزی لێکەم کە گەڕامەوە هیچێ نەبوو ئەونەی زینا لەبەر چاوم ناشیرین بێ.

وەسەن پەی وەسفی قورئانی کەریم «اِنَّـكَ لَعَلـى خُلُـقٍ عَظـيم»
تۆیش رەسم و یاسای ئەو بەجێ بێنە قۆناغ بە قۆناغ لێی جێ مەمێنە
با لە خزمەتیا بڕۆین بۆ حوزوور بەهەشت وەرگرین بە کەیف وسروور

* * *

«۸»

## خۆشەویستی ئاوا ئەبێ

ئەسحابی پێغەمبەرﷺ پێغەمبەریان لە خۆیان و ماڵیان و منداڵیان خۆشتر گەرەک بووە، بۆ نموونە: یەکێ لە ئەسحاب بە ناو سەوبان کە خزمەتکار پێغەمبەر بووە رۆژێ هات بۆ خزمەتی رەنگ و رووی زۆر گۆڕابوو و لاشەی زۆر لەڕ و لاواز بووبوو، پرسی سەوبان بۆچی وات لێ‌هاتووە؟ عەرزی کرد قوربان هیچ نەخۆشینێکم نیە، کە هەمیشە موشتاقی دیداری تۆم و هەر رۆژێ چەن جار چاوم بە دیدارت شاد نەبێ ئارام ناگرم تا بە خزمەتت ئەگەم بیر لە قیامەت و بەهەشت ئەکەمۆ ئەترسم کە لەوێ بە خزمەتت نەگەم و چاوم پێت نەکەوێ کە تۆ لەگەڵ پێغەمبەرەکانا «لەسەریان بێ سەلام» وای لە مەرتەبەی بەرزا، ئەگەر من بڕۆمە بەهەشت وام لە مەرتەبەی نزما و ئەگەر نەچمە بەهەشت بە ئەبەدی تۆم چاو پێ ناکەوێ. خەمی ئەمە لەڕ و لاوازی کردووم تا وام لێ هاتووە کە ئەمبینی!.

جا بۆ تەجرەبە و تاقی کردنەوەی سەوبان بڕوانە چ فیداکارییێکی کردووە. ئەگێرنەوە: کە وەختێ خەبەری فەوتی پێغەمبەریان پێدا ئەپاڕێتۆ و لە خوا داوا ئەکا هەر دوو چاوم کوێر کە کە دونیای رۆشنی پێ نەبینم. دوای فەوتی حەزرەت. خودا دۆعاکەی قەبوول کرد، ئیتر تا مابوو کوێر بوو خوای لێ رازی بێ. جا خوای گەورە بۆ دڵخۆشی سەوبان ئایەتی ۷۱ی سوورەتی نیسا ئەنێرێ بۆ حەزرەتﷺ کە ئەفەرموێ: «هەرکەس ئیتاعەی خوا و پێغەمبەر بکا ئەوانە وان لەگەڵ ئەوانا کە خوا نیعمەتی بە سەریانا رژاندووە، لە پێغەمبەرەکان و لە بڕوادارەکان و شەهیدەکان و لە ساڵحەکان و ئەم چوار دەسە زۆر رەفێقی باش و عەجایەبن».

ئێمەیش باوەها هەر فیداکار بین ... با ئێمەیش گرۆی نەبی موختار بین
هەروەکوو سەوبان موشتاق دیار بین ... هەروەکوو ئەویش بە ئینتزاربین

❊ ❊ ❊

## زریان و لافاوی نووح

نووحی پێغەمبەر(علیه السلام) ۱۰۴۰ ساڵ عومری بووە. لە چل ساڵەدا بووە بە پێغەمبەر ۹۵۰ ساڵ بە پێغەمبەری لە ناو قەومەکەیا بووە دوای تۆفانەکە ۵۰ ساڵ ماوەتەوە. چوار کوڕی بووە: کەنعان و سام و حام و یافیس، کەنعان مونافق بوو بۆیە بە دەم لەگەڵ باوکیا بووە و بە دڵ لەگەڵ کافرەکانا بووە. باوکی نەیئەزانی کە مونافیقە لەبەر ئەوە کە خوا وەعدەی دابوو کە خاوخێزانەکەی لە تۆفانەکە رزگار بکات وتی: بە کەنعان بێ ناو ئەم کەشتییە با نەخنکێ. وتی: ئەچمە سەر کێوێ بەرز نەجاتم ببێ فەرمووی: ڕۆڵە لە ئیمڕۆدا نەجاتدەر لە ئەمری خوا نیە. هەموو جێیێ وەکوو یەک چل میتر ئاوی بەسەرەوە بووە نەهات بۆ ناو کەشتییەکە و خنکا. جا دوای خنکانی حەزرەتی نووح فەرمووی: خوایا وەعدەی تۆ راسە کەنعانی کوڕم خێزانی من بوو کەچی خنکا! خوا فەرمووی: ئەو کە ئیمانی بە تۆ نەبوو ئەو خێزانی تۆ نیە بۆیە لەگەڵ کافرەکانا لە ئاوەکەدا خنکا. ئەو تۆفانە وەکوو لە کتێبا باسی ئەک شەش مانگ دەوامی بووە لە دەی ڕەجەبا تا دەی موحەڕڕەم. وە بۆ بەقای نەسلی حەیوانات بە ئەمری خوا لە هەر نەوعێ نێر و مێیەکی خستۆتە ناو کەشتییەکە. دوای تۆفانەکە ئەو کەشتیە لەسەر کێوی «جودی» کە وا لە «موصل» گیرساوەتەوە. بۆیە مامۆستا مەلا «عبدالکریم مدرّس»ی بیارە«رحمه الله» نووسیویەتی کە کوردستا بێشکەی دووهەمی ئینسانە. جا دوای تۆفانەکە لە هەر سێ کوڕەکەی حەزرەت «نووح» «سەلامی لەسەر» نەتەوەی ئادەمی پەیا بوونەسۆ. سام باوکی عەرەب عەجەم و فارس و رۆمە. یافیس باوکی تورک و حەزر و سەقلابە. حام باوک هیندو حەبەش و زەنگ و بەربەرە.

تەماشای قودرەت خوا بۆ ناکەی — کە ئیمانی باش بۆ خۆت پەیاکەی
لە نووحی نەبی کەنعان پەیا بوو — لە ئازەر بت تاش خەلیل پەیا بوو

لە ئاخری عومری حەزرەتی نووحا لێیان پرسی دونیا چۆن هاتە بەر چاو فەرمووی: دونیا وەسە ماڵێکی دوو درگا لەمیانۆ بێیتوو لەویانۆ بڕۆیتە دەرەوە.

❊ ❊ ❊

## مزگەوتی مونافقەکان

ئەگێڕنۆ کە تایفەی عەمری کوڕی عەوف وەختێ لە مەدینەی مونەووەرە مزگەوتی قوبایان دروست کرد ناردیان بە شوێن پێغەمبەرداﷺ کە بێ بۆلایان، ئەویش هات و نوێژی کرد لە مزگەوتەکەیانا. ئامۆزاکانیان تایفەی غەنەمی کوڕی عەوف بەخێڵییان برد بەوان، وتیان ئێمەیش لەم نزیکا مزگەوتێ دروس کەین بنێرین بە شوێن پێغەمبەراﷺ بێت نوێژی تیا بخوێنێ و ئەبووعامیری راهیبیش نوێژی تیا بخوێنێ (راهب بە عابیدێ ئەڵێن لە سەر دینی عیسا بێ). وەختێ هاتۆ لە شام ئەو ئەبووعامیری راهیبە کە ئەیوت بە پێغەمبەر لە غەزای ئوحودا هەرکەسێکم دەس کەوێ شەڕکا لەگەڵتا من وام لە گەڵیا بۆ شەڕ کردن لە گەڵتا، هەروا شەڕی ئەکرد لەگەڵ پێغەمبەرا تا لە غەزای حونەینا شکستی خوارد و رای کرد. جا ئەو تایفەی غەنەمی کوڕی عەوفە مزگەوتێکیان لەلای مزگەوتی قوبادا دروس کرد و وتیان بە پێغەمبەر مزگەوتێکمان دروس کردووە بۆ نەخۆش و موحتاج، ئێمە حەز ئەکەین تۆ بێی نوێژێکی تیا بخوێنی بۆمان. پێغەمبەرﷺ فەرمووی ئیستە وام لەسەر سەفەرا ان‌شاء الله هاتمۆ لە غەزای «تبوک» نوێژی تیا ئەکەین. کە هاتۆ لە غەزای تەبووک داوایان لێ کرد بێت بۆ مزگەوتەکەیان. ئەو ئایەتە کە لە دواییدا تەرجەمەکەی ئەنووسین نازڵ بووە سەری. دوای ئەوە فەرمووی: بە وەحشی کە حەمزەی مامی و چەند کەسێکی شەهید کردبوو موسوڵمان بووبوو، لەگەڵ چەند کەسێکا بڕۆن ئەو مزگەوتە بڕوخێنن. ئەهلی ئەو مزگەوتە زاڵمن. ئەوانیش ئەو کارەیان کرد و ئەمری کرد جێگەکەیان کرد بە سەلوێنک و لاکە تۆپیو و ئەشغاڵی تێخەن. ئەبووعامیری راهیب لە شاما مرد. دەقی تەرجەمەی ئایەتەکە کە تەفسیری مەدارک نووسیویەتی لە ئایەتی ۱۰۹ سوورەتی تەوبە ئەمەیە «بازێکن لە مونافیقەکان کەسانێ کە مزگەوتێکیان دروس کرد بۆ زەرەردان لەو ئەسحابانە کە لە مزگەوت قوبادا بوون بۆ جیایی خستن لە بەینی موسوڵمانانا. لەبۆ خۆ ئامادەکردن بۆ شەڕ کردن لەگەڵ خوا و پێغەمبەری خوادا بە کۆمەک ئەبووعامیری راهیب». ئەمە مەدارک لە بارەی مزگەوتی «ضرار»وە نووسیویە. وە عولەما فەرموویانە هەر مزگەوتێ بۆ بەربەرەکانێ دروس کرابێ لەگەڵ موسوڵمانانا یا بۆ ریایی یا بۆ ناو و

شۆرەت، یا بۆ مەبەستێ‌تر غەیری رەزای خوابێ یا بە مالی حەرام دروس‌کرابێ بەر مزگەوتی «ضرار» ئەکەوێ.

مـەلا «ضـرار» و مزگـەوتی «ضـرار»
زەرەریـــان زۆرە لێیـــان کـــە فـــیرار

تـــەماشـــای ئایـــەی ۱۰۹ بکـــە
لـە سوورەی تـەوبە عـەمـەلـی پـێ‌کـە

حەزرەتی رەسوول شای ساحێب ئێقبال
جێی مزگەوتەکەی کرد بە جێی ئەشغال

مزگەوتێ بـینای لـەسـەر تـەقوایـە
هـەر ئـەو مـزگـەوتـە لـەبۆ خـوایە

❋ ❋ ❋

«۱۱»

## ئەوسی کوڕی سابت و خەولەی خێزانی

لە هەوەڵی سوورەی موجادەلە هەوەڵی جزمی بیست و هەشت و تا شەش ئایەت ئەگێرنۆ کە رۆژێ ئەوسی کوڕی سامت ئارەزووی رەفێقی ژنەکەی کرد کە خەولەی کچی سەعلەبە بوو. ئەویش ملی پـێ نـەدا. لـە داخـا وتی: تۆ بـەلای منۆ پشتت وەکوو پشتی دایکم وایە. لەو زەمانا ئەمیانە بە تـەلاقی ئـەبـەدی دائـەنـا. جا خەولە بۆ چارەسەری ئەم کـارە رۆی بـۆ خزمـەتی حـەزرەتﷺ داوای فتـوای لـێ کرد، فەرمووی: حەرام بوی لە سـەری. دەسـی کـرد بـە دەم قاڵـە و وتی: جا خۆ تەلاقی نەداوم. فەرمووی: چارەسەری‌تر نیە و بە ئەبەدی لێـی حـەرام بـووی. لـەبەر زۆری و وردی مناڵـەکـانی و لـە دەسـدانی رەفێقـی چـەن ساڵـەی زۆر خـەمبـار و ناڕحەت بوو. وتی: خۆ تەلاقی نەداوم. حەزرەت فەرمووی: بە ئەبـەدی لێـی حـەرام بووی. جا ژنەکە روی کردە ئاسمان و وتی: خوای گەورە شکات بۆلای تۆ ئەیەنم. دەس‌بەجێ ئایەت هاتە خوارەوە. دەقی ئایەتەکە مەعنای ئەمەیـە: «بـەڕاستی بیستی خوا قسەی ئەو ژنەکە قسەی ئاڕوگۆڕ ئەکرد لەگەڵ تۆ بۆ شووەکەی. کە تۆ ئەتوت لێی حەرام بووی. کە وتوویەتی: پشتت لە پشتی دایکم ئـەچـێ کـە بـەمیانـە ئـەوت زیهار ژنەکە ئەیوت: خۆ تەلاقی نەداوم و ئەو ژنە شکاتی برد بۆلای خـوای خـۆی کە ئەبیسێ وتووێژی ئەوە کە بیسەروبینایـە». ئـەم ئایـەتـە چـەن حـوکمـی لـێ دەر ئەکەوی:

۱. کەسانێ کە ئەڵێن بە ژنەکانیان تۆ لای من پشتت وەسە پشتی دایکم بەو قسەی ئەوانە نابن بە دایکیان. چوون دایکیان ئەوانەن کە لە داوێنیان داکەوتوون. ئەم پیاوانە قسەیە ناشرین و درۆیان کردووە.
۲. خوای گەورە بەخشینی گوناهی زۆرە.
۳. پیاوانێ کە «ظهار» ئەکەن لەگەل ژنەکانیان و لە دوای ئەوە پەشیمان ئەبنۆ لەوە کە وتوویانە کەفارتی ئەوەیە عەبدێ ئازاد کەن لە پێش بە یەک گەیشتنیانا. ئەمە بۆ ئەوەسەکە مۆجگاری وەرگرن. خوا خۆی خەبەردارە کە ئیوە چی ئەکەن.
٤. کەسێ کە دەسەلاتی ئازاد کردنی عەبدی نیە دوو مانگ لەسەریەک بەڕۆژوبێ لە پیش بە یەک گەیشتنیانا.
٥. کەسێ کە نەتوانێ ئەم رۆژووە بگرێ خۆراک بدا بە شەست داماو وە هەریەکێ بەش شەو و رۆژێ. ئەم کەفارەتە بۆ ئەوەسە کە ئیمانی بە خواو پێغەمبەری خوا بێ ئەمە حەدد و حودوودێکە خوا داێناوە. وە بۆ کافران عەزابی ئێشدار هەیە.
٦. ئەمە کە پیاو بە ژنەکەی بلێ پشتی تۆ لای من وەسە پشتی دایکم پێی ئەڵێن «ظهار» هەروایە بە ژنەکەی بلێ دایکمی، خوشکمی، پوورمی، جا ئەم کەلیمە کە حەرام و درۆیە خوای گەورە کەفارەتی بۆ داناوە بۆ تەمیی ئەوانە کە وا ئەڵێن.
حەزرەتﷺ فەرمووی بە ئەوس شووی خەولە: خودا یەکێ لەم سیانەی کردووە بە کەفارەت ئەم زیهارە. ئەوس وتی: قودرەت مالیم نیە بۆ ئازاد کردن عەبد یا خۆراک دان بە شەست نەفەر داماو و قوردەتی بە دەنیشم نیە و خۆم بۆ ڕاناگیرێ دوو مانگ لەسەر یەک بە رۆژوو بم. کە ژنەکە زۆر بێ تاقەتی ئەکرد حەزرەت خۆی فەرموی: خۆم لە خورما کەفارەتەکەت بۆ ئەدەم. خەولە وتی: شاری مەدینە لە ئێمە فەقیرتری تیا نیە. حەزرەت خورماکەی دا بە خەولە بۆ منالەکانی. بڕوانە بۆ ڕەحمی خوا و پێغەمبەر بۆ ئەو ژن و منالە چۆن بوو. جا کەسێ دوای ئەو کەلیمەی زیهارە فەورەن ژنەکە تەلاق دا کەفارەت ناکەوێتە سەری بە مەزهەب ئیمام شافیعی.

خوا لە بەر خاتر خەولە و منالی    تێکی دا ڕەسم و یاسای چەن سالی
بۆ وتن زیهار داینا کەفارەت    کەفارەتی دا لەبۆ ئەوس، حەزرەت

* * *

«١٣»

## تەلاق و جیابوونەوە

حەزرەت عایشە «خوای لێ رازی بێ» فەرموویەتی: لە زەمانی پێش حەزرەتﷺ پیاو هەتا مەیلی بوایە ژنی تەلاق ئەدا هەر ژنێ بۆ هەر وەقت ڕجووعی کردایێتۆ بۆلای خۆی با سەد کەڕەت یا زیاتر تەلاقی بدایە. تا پیاوێ وتی بە ژنەکەی: وەڵلاهی تەلاقت ئەدەم تا نزیکی بە سەر چوونی عیددەکەت ئەووەختە رجووعت ئەکەمۆ. ژنەکە نەویسا و رۆی بۆ خزمەت حەزرەت عایشە. قسەی شووەکەی بۆ گێڕاوۆ. بێدەنگ بوو تا پێغەمبەر هاتۆ و قسەی پیاوەکەی بۆ گێڕاوۆ. ئەویش بێدەنگ بوو تا ئایەت نازڵ بوو ﴿الطَّلاقُ مَرَّتانِ فَامساكٌ بِمَعروفٍ اَو تَسريحٌ بِاِحسانٍ﴾ [1] «تەلاق دوو کەڕەتە دوای ئەوە واجبە لەسەر شووەکەی یەکێ لەم دوانە بکا: یا نگاداری ژنەکەی بە باشی، یا تەلاقدانی بە باشی» واتە ئەگەر پیاوەکە دانەدانە تەلاق ژنەکەی بدات ئەتوانێ تا دووجار ڕجووعی کاتۆ بێ ڕەزایەتی ژنەکە و کەسوکاری. بڵێ وا ئەو ژنمە هێناوۆ بۆلای خۆم. ئیتر ئەتوانن بەیەکۆ وەک جاری جاران بژین. دوای ئەوە کە یەک تەلاقی ماوە واجبە لەسەر ئەو پیاوە کە یا بە باشی ئاگاداری ژنەکەی و تەلاقەکەی بکا یا بە باشی و بێ ئازار تەلاقی بدات با بڕوا شوو بکات بە یەکێکیتر بێ دەردیسەر.

جا با بزانین بە سێ شەرت بۆ ئەو پیاوە ڕجووع دروسە «١. ئەو ژن و پیاوە ڕەفێقییان بووبێ. ٢.«عِدّە» بە سەر نەچووبێ. ٣.یەک یا دوو تەلاقی دابێ، جا لێرا حاجی قادرکۆیە ئەم شیعرانەی لەو ئایەتە وەرگرتووە کە ئەڵێ:

خوا فەرموویە لە قورئان: ﴿الطّلاق مرّتانْ
فَاِمْساکٌ بِمَعروف او تَسْریحٌ بِاِحسْان﴾
بلێین بە قەومی کوردان عەیبە بە حەققی قورئان
ژن هێنان و تەلاق دان ژن هێنان و تەلاق دان

* * *

---

[1]. سوورەی بقره ئایەتی/١٢٩

«۱٤»

## حیکمەتی لوقمان

خوا لە قورئانا ئەفەرمێ: «ئێمە عەتامان کرد بەلوقمان حیکمەت»[1]. واتە دروسکاری. پرسیان لەلوقمان ئەم دروسکاریتە لە کوێ فێر بووی. وتی: لە بێ ئەدبانۆ، هەرچی ئەوان ئەیانکرد و لای خەڵک پەسەند نەبوو ئیرادیان لێ ئەگرتن من نەم ئەکرد تا گەییم بەم روتبە بەرزە.

| | |
|---|---|
| مامۆسای خۆی بوو لوقمان بۆحیکمەت | گەیی بە ڕوتبەی بەرزی سەعادەت |
| ئەدەب تاجێکی شاهانەس بۆ تۆ | بۆ هەر کوێ ئەڕۆی بینێ بە سەرتۆ |
| ڕەفێقی شەخسی بێ ئەدەب مەکە | بۆ خۆت بەد ناوی ئەو پەیا مەکە |

* * *

«۱٥»

## سەرنشینانی کەشتیەکەی نووح

سەرنشینانی کەشتیەکەی نووح بە ژن و پیاوۆ ۸۰ نەفەر بوون لە دوای تۆفانەکە کەشتییەکە لە سەر کێوی «جودی» نیشتووەتۆ. کە خاکی کوردستانە و لە سێ کوڕەکەی نووح «سام» و «حام» و «یافث» بەشەر پەرەی سەندووەتەوە. کەوابێ نووح ئادەمی دووهەمە و کوردستان بێشکەی دووهەمی بەشەرە «سام» باوکی عەرەب و فارس و رۆمە. وادیارە کوردیش لەم نەتەوە بووبن کە لە کەلیمات و حورووفی زۆرا هاوبەشن. «یافث» باوکی تورک و خەزەر و سەقلاب بووە. «حام» باوکی حەبەش و زەنگ و بەربەرە. کەنعان کە نەهاتە ناو کەشتییەکە و ئیمانی نەبوو لەگەڵ «واعیلە»ی دایکیا خنکان. ئەم باسی ئەولادی نووحە تەفسیری حوسەینی نووسیویەتی لە سوورەی «صافّات»ئایەتی ۷٦. حەزرەتی نووح پێغەمبەری نەتەوەی «قابیل»کوڕی حەزرەتی ئادەم بووە وەکوو تەفسیری حوسەینی لە ئەووەڵی سوورەتی نووح نووسیویەتی. ریوایەت کراوە کە سوحوفی ئیبراهیم لە هەوەڵ شەوی مانگی رەمەزانا نازڵ بووە و تەوراتیش لە شەشی رەمەزانا ۷۰۰ ساڵ دوای

---

۱. سوورەی لوقمان ئایەتی/۱۲

..........................................................................................

سوحوفی ئیبراهیم نازڵ بووه و زەبوور لە دوازدەی ڕەمەزانا ٥٠٠ ساڵ دوای تەوڕات و ئینجیل لە هەژدەی ڕەمەزانا ۱۱۰۰ ساڵ دوای زەبوور و قورئان لە بیست و حەوتی ڕەمەزانا ٦٢٠ ساڵ دوای ئینجیل.[1] وە «صفوة التفاسیر» لە بەرگی ۳ سوورەی «الصافات» ئایەتی ۸۳ نووسیویە کە بەینی نووح و ئیبراهیم ٢٦٤٠ ساڵ بووە وە لە بەینی ئەو دوانا هوود و ساڵح بوون. لەسەر هەموویان بێ سەلام. مامۆستا مەلا کەریم لە بارەی سوحوفەکانەوە فەرموویە:

دە لە بۆ ئادەم پەنجا لەبۆ شیس    دە بۆ ئیبراهیم سی لەبۆ ئیدریس

ئەم چوار کتێبە بە سوورەت پەڕە هاتوون بۆیە پێیان ئەڵێن «صحف».

* * *

---

۱. «درّة الواعظین» لاپەڕەی ۱۸ لە کتێبی حەیات

# بەشی دووهەم لە حەدیس وەرگیراوە

«١»

## کەم تەماعی و بەشی زۆر

لە حەدیسا هەیە کە خوای گەورە حەزرەتی سولەیمانی موختار کرد لە بەینی عیلم و پاشاییدا ئەویش عیلمی هەڵبژارد. خوای تەعالا لەبەر شەرافەتی عیلم پاشایی تەواوی دونیایشی پێبەخشی.

سولەیمان عیلمی هەڵبژارد بۆ خۆی     بۆیە حاکمی سەر عەرز سەد ئۆخەی
چونکە بێزانین حاکمی ناکرێ     بێتە سەر ڕێگەی ئەنواعی گرێ

* * *

«٢»

## بێئەمری نەکردنی مێرد و ڕەزایەتی خوا

یەکێ لە ئەسحاب ئەڕۆی بۆ سەفەر، وەسێتی کرد بۆ ژنەکەی لە ماڵی خۆمانا نەچیتە خوارۆ تا من بێمۆ. ماڵی خەزوورەی لە خوارەوە بوو، نەخۆش کەوت وتیان بە ژنەکە: باوکت نەخۆشە بڕۆ بۆلای، وتی: شووەکەم ئیزنی نەداوم. بەینێتر وتیان: هیلاکە بڕۆ بۆلای، وتی: شووەکەم ئیزنی نەداوم، بە هیچ جۆرێ تا شووەکەی نەهاتەوە، نەچووە خوارۆ تا باوکی فەوتی کرد و دوای هاتنەوەی شووەکەی و دوای ئیزنی ئەو ڕۆیی بۆ خزمەتی پێغەمبەرﷺ بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: تۆ خوات لە خۆت ڕازی کردووە و باوکیشت خوا بە بۆنەی تۆوە بەخشیویەتی.

ژنی ئەم زەمانە ئیختیاریان لە پیاو سەندووە و بۆ هەرکوێ مەیلیان بێ ئەڕۆن بۆ پرسەی ناسیاو و نەناسیاو منیش پێیان ئەڵێم:

بێپرسی شووەکەت مەڕۆ بۆ پرسە     لە سوئال و جواب خوا بترسە
بەبێ ئاشنایی و بێ قەومی خزمی     مەڕۆ بۆ هیچ کوێ بۆ بەرزی و نزمی

* * *

«٣»

## ره زایەتی باوک نەک ژن

عبداللەی کوڕی حەزرەتی عومەر «خوایان لێ‌رازی بێ» ژنێکی بوو کە زۆری خۆش ئەویست و لێی رازی بوو، بەلام حەزرەتی عومەر لیی رازی نەبوو، حەزی ئەکرد تەلاقی با، رۆیی بۆ خزمەت پێغەمبەرﷺ بۆ پرس و را، فەرمووی: رەزایەتی باوکت بەجێ‌بێنە، ئیتر تەلاقی دا و ژنێ‌تری هێنا.

*** 

«٤»

## ئەجری باوک

نەفەرێ لە ئەسحاب زۆر لە خزمەت باوکیا بوو، بە جۆرێ وا بێ‌ئەمری نەئەکرد رۆژێ عەرزی پێغەمبەری کرد: لەوانەیە من ئەجری باوکم بەسەرۆ نەمابێ ئەونە دلی بەڕێوە ئەبەم، فەرمووی: بە تەمای ئەوە مەبە کە بتوانی ئەجری بە سەر خۆتۆ لابەی، دۆعای بەخێری بۆ بکە خوا جەزای باتۆ ئەو لە تۆ بۆ تۆ بە خزمەت‌تر بووە، بێجگە لەویشە هەمیشە دۆعای ئەکرد بۆ عومر درێژی تۆ کە زەحمەتەکەی هەر بە سەرۆبێ تۆ ئەگەر بە دەمیش نەیلێی بە دڵ ئاواتە خوازی خوا زەحمەتی ئەوت لە کۆڵ خا.

| | |
|---|---|
| راسی فەرمووە رەسوولی نازار | منالی ئەمرۆ هەر ئێشە و ئازار |
| باشی و بۆشی زۆر بە سەرتۆ ئەکەن | قەرزار و روو زەرد لای خەلکت ئەکەن |
| وەختێ تۆ تەمات بە نان ئەوان بێ | ئەو نانە ئەی خۆی بە زەهری مار بێ |

***

«٥»

## لەخۆ دەرچوون و بێ‌ئەمری خوا

یەک نەفەر لە ئەسحابﷺ بە ناو سەعلەبە بە زۆری حازری جومعەو جەماعەت و مەجلیسی مەعیزە و نەسیحەت پێغەمبەربوو، بەلام زۆر فەقیر و بێ شت بوو، زۆر جار سکالای فەقیری خۆی لە خزمەت پێغەمبەرا عەرز ئەکرد کە دۆعای دەولەمەندی بۆ بکات حەزرەتﷺ ئەیفەرموو: ئەترسم دەولەمەند بی ئەم تاعەت و

عبادەتتە نەمێنێ، هەر فەقیری باشە. زۆر ئیسراری کرد بۆ ئەوە دۆعای بۆ بکات....پێغەمبەرﷺ دۆعای بۆ کرد و دەوڵەمەند بوو، کە حەیوان و ماڵی زۆر بوو کەم کەم حازری خزمەتی پێغەمبەری تەرک کرد و تا دەڵەمەندیەکەی زۆرتر ئەبوو، حازری‌یەکەی کەمتر ئەبوو. تا وای لێ‌هات جەماعەتی تەرک کرد. جومعە و جومعە ئەهات. بەینێ‌تری پێ‌چوو جومعەیشی تەرک کرد و زەکاتی ماڵ و حەیوانی لەسەر واجب بوو، داوای زەکاتی لێ‌کرا ئامادە نەبوو زەکات بدا و خۆی ئەشاردۆ تا رۆژێ کە زۆریان بۆ هانی وتی: ئەمە زەکات نیە لە ئێمەی ئەستێنن ئەمە سەرانەیە کە سەرانەیش هی کافرێکی بێ‌دەنگ و بێ‌وەیە کە لە سایەی ئیسلاما دانیشێ و هەر ساڵێ پوڵێ بدا. لە بەر ناخوشی قسەکەی، پێغەمبەرﷺ قەهری لێ‌کرد و نەیئەنارد بۆلای بۆ زەکات. دوای ئەوە خۆی زەکاتی ئەهانی لێی وەرنەئەگرت. دوای ئەو زەکاتی ئەبرد بۆ خزمەت حەزرەتی ئەبوبەکرؓ وەری نەئەگرت. دوای فەوتی ئەو ئەیبرد بۆ خزمەتی حەزرەتی عومەرؓ وەری نەگرت و ئەیانفەرموو: ئێمە چۆن زەکات لە کە سێ وەرئەگرین کە پێغەمبەر لێی وەرنەگرتووە. ئەڵێن رۆژێ مەعمووری زەکات رۆین بۆ دەوری لە زەمانی حەزرەتاﷺ خۆی کردووە بە ژێر خوری حەیوانەکانیا لە ترسی زەکات، خوا لە بەر ئەوە ئابرووی ببات و پشکیلی دەرخات، بایەکی ناردووە خورییەکە با بردوویەتی و رووتی کردووە لەبەر چاو ئەو خەڵکا. «خوا رەحمی پێ کردبێ بە ئیمانۆ مردبێ ئامین». ئەم ریوایەت و حیکایەتە لە «ریاض الصالحین» وەرم‌گرتووە

ماڵی ئەم دونیا چلکی دەسانە — بەدەس‌هانینی سەهل و ئاسانە
ئیمتحانەکەی سەخت و گرانە — کەم کەس دەرئەچێ لەو ئیمتحانە
پەنا بە خوا لە ماڵی دونیا — کە رسوامان کا لە هەر دوو دونیا

* * *

«٦»

## خۆ ڕاگری لەبەر موسیبەت ئاوا ئەبێ

ئەم باسە لە کتێبی «ریاض الصالحین»دا هاتووە.

یەکێ لە ئەسحابﷺ تاقە کوڕێکی ئەبێ نەخۆش ئەکەوێ، لە حەیبەتا ماڵەکەی لێ‌ئەبێ بە دوژمن، سەرخۆی هەڵئەگرێ ئەچێتە دەرۆ تا ییتۆ کوڕەکەی فەوت ئەکات، کە فەوتی کرد ژنەکەی زۆر بە ئارامی و بە ڕەزامەندی بە بەشی خوا، دای‌ئەپوشێ و خۆی تەمیز ئەکا. شووەکەی کە ییتۆ بە رووخۆشییۆ ئەڕوا بە دەمیۆ بۆ ئەمەکە دەمێکە نانی نەخواردووە نان بخوا و ئیستراحەت بکا، جا پێی بلێ، کە لێی ئەپرسێ کوڕەکە چۆنە؟ ئەڵێ: شوکر ئارام بووە، شووەکە نانی باش ئەخوا و مانووی ئەحەسێتەوە و ئارەزووی ژنەکە ئەکات و ڕەفێقییان ئەبێ، جا ژنەکە ئەڵێ: ئێمە شتێکمان لە دراوسێیێ خواستبێ و بێ داوای کا و بیباتۆ، حەقمان هەیە گلەیی لێ‌بکەین؟ شووەکە ئەڵێ: نەخێر. جا ژنەکە خۆی ناشەمزێنێ و ئەڵێ: کوڕەکەمان ئەمانەتێ بوو خوای گەروە بردیەوە. مێردەکەی تووڕە ئەبێ و ئەڵێ: بۆچی زوو پێو نەوتم؟ ژنەکە ئەڵێ: چەن ڕۆژێ کە تۆ نانی وەهات نەخواردووە، حەزم کرد نان بخۆی و ماندوویت حەسێتۆ و ئەوجا پێت بلێم. خۆیان ئەشۆن و لە دوایيا منالەکەیان ئەشۆن. کە ڕۆژیان لێ بووەوە، پیاوەکە ئەڕوا بۆ خزمەت پێغەمبەرﷺ بەسەرهات خۆیان ئەگێڕێتەوە، حەزرەتﷺ دوعای خێریان بۆ ئەکا و ئەفەرموێ: خوا بەرەکەت بخاتە شەوەکەتان، لە بەرەکەت ئەو شەوە ژنەکە کوڕێکی ئەبێ، کوڕەکەی حەوت کوڕی ئەبێ هەر حەوتیان قورئان خوێن ئەبن و هەموویان تەواو سی جزمەی قورئانیان لەبەر ئەبێ.! چۆن بڕێکی بەرچاو تەنگ و نەزان ئەڵێن ژن خاسیان تیا نیە!؟ کە لەبەر سەبری ئەو ژنە ئەو دۆعایانە بۆ کەوتە کەرەم و ئەو هەمووە کوڕە خاسیانە بوو، خوایان لێ‌ڕازی بێ.

| | |
|---|---|
| ڕازی بە قەزا خۆشەویست خوایە | پەسەندی دەرگای ڕەسول‌اللەیە |
| خۆزگەم بەو کەسە تەبعەن وەهایە | سەبر و خۆگری ئەکا بە مایە |
| کۆمەک خۆگران لە بەر ڕەزایەت | خوای گەورەیە بە نەسسی ئایەت |

* * *

«٧»

## خۆشەویستی دوو خۆشەویست

حەزرەتی عومەرﷺ رۆژێ خوا حافیزی کرد لە پێغەمبەرﷺ کە بڕوا بۆ زیارەتی ماڵی خوا. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لە دۆعای خێر فەرامۆشمان مەکە برا خۆشەویسەکەم. حەزرەتی عومەر ئەیفەرموو: تەواوی دونیایان پێ بدایێم بە قەدەر ئەو کەلیمە پێم خۆش نەبوو.

خەلیفەی دوهەم حەزرەتی عومەر — خوای لێ‌رازی بێ لەگەڵ پێغەمبەر
وەها عادڵ و خۆش رەفتار بووە — بۆیە نموونەی عەدالەت بووە
شوێن ئەوان کەوین با ئێمەیش وا بین — ئوممەتی سەربەرز رەسوولی خوا بین

* * *

«٨»

## کچ بە شوودان بە ڕێگای شەرعی

سوننەتە کەسێ کە نیکاحی ژنێ لە دەسیا بێ پیاوی موناسبی بۆ دۆزێتۆ و بیداتێ. وەکوو پێغەمبەرﷺ لە ساڵی دووهەمی هیجرەتدا فەرمووی بە حەزرەتی عەلی کە بیست و دوو ساڵ عومری بوو، بێ با فاتمەت پێ‌بدەم کە پانزە ساڵە بوو، بۆی مارە کرد و خۆی زەماوەنی بۆ کردن و شەکێکی سەربڕی و کردی بە چێشت بۆ برازاوا. ئێمەیش کە ئوممەتی ئەوین ئەبێ وابین با ئەجر و سەوابمان گەورەتر بێ و سەربەرزتر بین.

* * *

«٩»

## ئاشتی

رۆژێ حەزرەتی عەلی و حەزرەتی فاتمە ناکۆکی کەوتە بەینیان. حەزرەتی عەلی وەکوو تۆراو رۆی بۆ مزگەوت لە ناو خاک و خۆلی مزگەوتا خۆی دا بە عەرزا. لەو وەختا پێغەمبەرﷺ تەشریفی برد بۆ ماڵ فاتمە و پرسی بۆ عەلی. فاتمە وتی: رۆی بۆ مزگەوت پێغەمبەرﷺ تەشریفی برد بە شوێنیا تەماشای

بوویەوە تا بەیانی، خوایا ئەگەر ئەم کارەم لەبەر تۆ کردووە لەم تەنگانە رزگارمان کە. بەردەکە تەکانێکی خوارد بەڵام وا نەبوو بتوانن بێنە دەرۆ، یەکێ تریان وتی: کچێ ئامۆزام بوو زۆر حەزم لێ ئەکرد بە هیچ جۆرێ دەسم لێ گیر نەئەبوو تا وەختێ گرانی و گەدایی زۆری بۆ هانی، هات بۆ ماڵ ئێمە بۆ شت وتم: رێک نەکەوی لەگەڵما هیچت پێ نادەم. برسیەتی ناچاری کرد کە ملم پێ بدا و لەبەردەسما راکشا کە چوومە بەینی دووپای وتی: لە خوا بترسە کلکەوانەیێ کە هی خۆت نیە پەنجەی پیا مەکە، چڵەکەیەکم کردوو لەو خەیاڵە پەشیمانۆ بووم و لیرەکانم پێدا و رۆییم. خوایا ئەگەر ئەم کارەم لەبەر تۆ بووە و لەبەر تۆ ئەوکار خراپەم نەکردووە لەم تەنگانە رزگارمان بکە. بەردەکە تەکانێکی خوارد و بەڵام و نەبوو بتوانن بێنە دەرۆ. سێهەمیان وتی: رۆژێ کرێکارێ زۆرم بوو ئێوارە کە کرێ پێدان یەکێکیان بۆی رێ نەکەوت کرێکەی وەرگرێ یا لەبەرکەمی کرێکە رۆیی ئیتر نەهاتۆ و منیش کرێکەییم خستە گەڕان و کاسپیم پێ کرد و بەرەکەت تێ کەوت و ران و گاگەلێ زۆرم لێ نابەیەکۆ، تا رۆژێ کرێکارەکە لە پڕا پەی بوو وتی: ئەگەر لە بیرت مابێ کرێی رۆژێکم وا بەلاتۆ وتم: بڕوانە ئەو هەمو گاگەل و رانە هەمووی هی تۆیە. وتی: خوا هەڵناگرێ گەمەم پێ مەکە، وتم گەمە ناکەم هەمووی ماڵ خۆتە. هەمووی بردوو رۆی و دانەیەکی لێ جێ نەهێشت. خوا ئەگەر ئەمەم لەبەر تۆ کردووە لەم تەنگانە رزگارمان بکە. بەردەکە تەکانی خوارد بە خۆشی هاتنە دەرۆ و رزگاریان بوو.

| | |
|---|---|
| خودات لە بیر بێ لە وەختی خۆشی | یێ بە فریاتۆ لە وەخت ناخۆشی |
| ئەو سێ نەفەرە چۆن نەجاتیان بوو | رزگاریت ئەبێ تۆش وا زوو بە زوو |
| رەحم بە کز و هەژار و فەقیر | رۆژی تەنگانە ئەبێ بە دەسگیر |

* * *

«١٤»

## زوڵم لە گیانداران

لە حەدیسێکا کە لە کتێبی «ریاض الصالحین»دا هاتووە ئەفەرمێ: ژنێ بە تاوانی کە زوڵمی لە پشیلەیە کردووە چووەتە جەهەننم! بەم جۆرە کە پشیلەیەکی حە

کردووه و مەرەخەسی نەکردووە شتێ پەیاکا بۆ خۆی بیخوا و خۆیشی شتی پێنەداوە تا تۆپیوە. خوا لە تۆڵەی ئەوا خستوویەتە دۆزەخ. بۆیە حەدیس ئەفەرمێ: لە هەر جەرگە تەڕێکا پاداش هەیە.

دانەوێڵە ئەکێشێ مێلوورە بۆ کونەکەی گیانی شیرینی هەیە هەرگیز ئازاری نەدەی
حاڵی تۆ چۆنە لە ژێر پای فیلا مێلوورەیش وایە بۆ تۆ سەبیلا

* * *

«۱۵»

## خزمەتی بێزوان

ئەمەیش حەدیسێکی تر لە کتێبی «ریاض الصالحین»: رۆژێ رێبوارێ لە شوێنێکی چۆڵا لە تینوێتیا چووە ناو بیرێ ئاوی خواردۆ کە هاتەدەرۆ تەماشای کرد سەگێ بە دەور بیرەکەدا هەڵئەسوڕێ لە تینوا قوڕی دەوری بیرەکە ئەلێسێتۆ، بەزەیی هاتۆ بە سەگەکەدا و رۆیی بۆ ناو بیرەکە وکەوشەکانی بۆ پڕکرد لە ئاو تا تەواو تێر ئاو بوو، خوای گەورە لە پاداشی ئەوەدا لە گوناهی خۆش بوو.

* * *

«۱٦»

## زیرەکی زانایانی ئیسلام

لە باسی میعراجا هاتووە کە ئەو شەوە حەزرەتﷺ چوو بۆ میعراج لە ئاسمان چوارەما مولاقاتی حەزرەتی مووسای کرد سەلامیان لەسەر بێ گلەیی کرد و وتی: بۆ وتووتە «علماء أمتي كأنبياء بني اسرائيل»؟ واتە: عولەمای ئوممەتی من وەکوو پێغەمبەرانی بەنیئیسرائیل وەهان. ئەوان کۆمەکی تەوڕات و دینی مووسایان ئەکرد ئەمانیش کۆمەکی قورئان و دینی من ئەکەن. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: با یەکێ لە عولەمای ئوممەتم بانگ کەم جا بۆت مەعلوم ئەبێ. رۆحیانەتی ئیمامی غەزالی بانگ کرد و حەزرەتی مووسا فەرمووی: ناوت چیە؟ وتی: موحەممەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی موحەممەد. مووسا فەرمووی: بۆ ئەوەندە جوابەکەت درێژۆ کرد؟ ئیمام غەزالی«رحمه‌الله» جوابی داوە: کە خوا فەرمووی ئەوە چیە بە دەستۆ فەرمووت ئەوە عاسایە خۆم ئەدەم بە سەریا و گەڵای پێدائەوەرێنم بۆ حەیوانەکانم

و کاری تریشم پێ‌هەیە. ئەتوانی بلێی ئەوە عەسایە بۆ ئەوەندە جوابەکەت درێژۆ کرد؟. ئیتر حەزرەتی مووسا فەرمووی: راستت کردووە مەعلوم عولەمای ئوممەتی تۆیش لایەقی ئوممەتی تۆیان هەیە.

حیکمەتی قسە درێژی هەردووکیان ئەوە بووە کە لەگەڵ خۆشەویستا قسەیان کردووە و حەزیان بە توولی سوحبەت کردووە.

یا خوا بەخێر بێی میوانی ئازیز	یا بە رۆژ بەهار یا شەوی پاییز
با توولی سوحبەت بێ لە بەینا	تا خەم و خەفەت لاچێ لە بەینا

* * *

«۱۷»

## قسە بە گوێرەی عەقڵ

قسەکەن لەگەڵ خەڵکا بە گوێرەی عەقڵ و شوعووری. «حەدیسە»

حەزرەتی عەلی فەرموویە: ئەگەر بەبۆنەی ئەم حەدیسە نەبوایە من ئەموت: قسە کەن لە گەڵ خەڵکا بە گوێرەی نەزانکارییان. هەردووکیان یەک ئەگرن.

* * *

«۱۸»

## حەق و ناحەق

مووسایی‌یێک و موسوڵمانێ مونافیق دەمەقاڵەیەکیان بوو، موسایی‌یێکە وتی: بڕۆین بۆلای موحەممەد. مونافقەکە وتی: بڕۆین بۆلای کەعبی کوڕی ئەشرەف. بە هەر حاڵێ بوو رۆیین بۆ خزمەت حەزرەتﷺ کە قسەیان کرد و حوکم رۆشنۆ بوو، پێغەمبەرﷺ حوکمی کرد بۆ مووسایی‌یەکە کە مونافقەکە بە حوکمەکە رازی نەبوو وتی: بڕۆین بۆلای عومەر با بۆمان رۆشن کاتۆ کە حەق بە کاممانە. رۆیین، موسایی‌یەکە وتی: شەرعێکمان بوو رۆیین بۆ خزمەت حەزرەت موحەممەد حەقی بە من داوە ئەم موسوڵمانە رازی نەبوو بەشکوو تۆ حەقمان بۆ رۆشن کەیتۆ. عومەر فەرمووی بە مونافقەکە وەهایە؟ وتی: بەڵێ. فەرمووی لەگرا بوێسن تا ئەڕۆم بۆ ماڵ. رۆیی شمشێرێکی هانی دای لە گەردنی مونافقەکە و قرتانی و فەرمووی کەسێ کە بە حوکمی پێغەمبەر رازی نەبێ ئەبێ بە شمشێر بیکوژی. لە دەس‌خۆشانەی ئەوا

حەزرەت فەرمووی: ئیساولا بلێن پێی عومەری فاروق کە حەق و باتڵی لە یەک جیا کردووەتۆ.

فەرموویە پێمان سەییدی سەروەر | لە بارەی شان و شەوکەتی عومەر
عومەر کە لە هەر ڕێگەوە ئەڕوا | شەیتان لە ترسا لەو لاوۆ ئەڕوا

* * *

«۱۹»

## گەورەیی سوورەتی ئیخلاس

عینوانی قورئانی کەریم واتە سەراسەر باسەکانی سێ شتە ۱.باسی زات و سیفاتی خوایە ۲.«قِصَص» و بەسەرهاتە ۳.ئەحکام. وە ئەحکامی ئایەتەکانی وەکوو حەدیسەکانی هەریەکی ۵۵۰ دانەیە. جەماعەتێ لە ئەسحاب بە ئیجازەی حەزرەتﷺ ڕۆیین بۆ سەفەر یەکێکیانی کرد بە گەورە و ئیمامیان کە نوێژیان بۆ بکات بە جەماعەت لە سەراسەر ئەو سەفەرە تا هاتنۆ زۆرتر لە نوێژا سوورەی ﴿قل هو الله﴾ی ئەخوێند حەزرە ت لێی پرسی بۆچی واتە کردووە؟ عەرزی کرد: لەبەر ئەوە کە هەر باسی زات و سیفاتی خوا ئەکا زۆر خۆشم ئەوێ حەزرەتﷺ فەرمووی: ئەو مەحەببەتە رات ئەکێشێ بۆ بەهەشت. بۆیە وتوویانە سێ کەڕەت خوێندنی ﴿قل هو الله﴾ ئیحسانی خەتمێکی هەیە کە ﴿قل هو الله﴾ بەشێکی گەورەیە لە سێ بەشەکانی قورئان.

قورئان شەفاعەت ئەکا بۆ ئوممەت | نەجاتی ئەدا لە خەم و حەسرەت
بەو شەرتە ئێمە ئیمانمان پێی بێ | هەروەکوو ئیمام لە پێشمانۆ بێ

* * *

«۲۰»

## بەهەشت و جوانی

ڕۆژێ پیرەژنێ بە خزمەت پێغەمبەرﷺ گەیی و فەرموویی: دایە پیرە ئەزانی پیرەژن ناچێتە بەهەشت؟ دەسی کردە گریان و وتی: نەخەیر نەمزانیوە. بۆ دڵداری ئەو فەرمووی: تا جوان عومر نەبیتۆ و جوانخاس نەبێ و لە جاران باشتر

نەبێ نارِواتە بەهەشت، زۆر پیرەژنی ناشیرین و لێ کەوتوو و چاومژموو هەیە کە جوانترین حۆری بەهەشتن بەبۆن عیبادەتۆ.

عیبادەت تەنیا خزمەت بە خەڵکە — تەزبێح وبەرماڵ تەنیا بێ کەڵکە
خۆ مانوو کردن خۆی عیبادەتە — کەسابەتکردن هۆی سەعادەتە
بەتایبەت ژنان زۆر زەحمەتبارن — بەشەوو بە رۆژ خەریکی کارن

* * *

«٢١»

## خاس و خراپ

ژنێ لە رێگەیەکا دانیشتبوو منالێ ساوای زوان نەگرتووی لە بەردەما بوو، سوارێ جوانخاس و سوارخاس و پۆشتە و پەرداخ بە لایانا رۆیی، ژنەکە وتی: خوایا ئەم منالمە بکە بە یەکێ وەک ئەو پیاوە جوانخاس و سوارخاسە. منالەکە دەمی بەردا لە مەمکەی دایکی و وتی: خوایا مەمکە بە یەکێ وەک ئەو پیاوە. دوای ئەوە ژنێکیان بە لایا برد بە لێدان و قژکێشان و پەت پەتی ژنەکە وتی: خوایا ئەم منالمە مەکە بە یەکێ وەک ئەو ژنە منالەکە مەمکەی بەردا و وتی: خوایا بمکە بە یەکێ وەک ئەو ژنە. دایکەکە پرسی لە منالەکە بۆچی وا ئەڵێیی؟ منالەکە وتی: ئەم پیاوە خەڵک بە باشی ئەزانێت و تاریفی ئەکەن بەلام لای خوا زۆر خراپ و بەدرەفتارە، ئەم ژنە خەڵک بە دز و حیز و خراپی ئەزانن، بەلام لای خوای گەورە زۆر ماقووڵ و باشە، منیش حەز لە باشی حوزووری خوا ئەکەم.

باش بی لە حوزوورخالقیخۆتا — لە قیامەتا یێتۆ بە خۆتا
خراپی تۆ خەڵک بە باشت زانن — دیفاعی عەزاب لە تۆ ناتوانن

* * *

«٢٢»

## خوا خۆی ئاگادارە

حەزرەتی ئیبراهیمی خەلیل ؈ لە وەختێکا کە بە «مەنجەنیق» ئەیانخستە ناو ئاورەکەی «نەمروود» حەزرەتی جوبرەئیل ؈ رۆیی بۆلای و وتی: ئەمرێ کارێ؟ وام لە خزمەتتا. فەرمووی: بە تۆ هیچ کارێکم نیە. وتی: دەی لە حوزووری

خوادا داوات چیه با عەرزی کەم. حەزرەتی ئیبراهیمﷺ فەرمووی: کە خوا خۆی زانایە بە حاڵم بێ ئیحتیاجە لەوە کە من داواکەم و بناڵم. ئیتر خوا ئەمری کرد بە ئاورەکە: ساردەوەبە بە جۆرێ کە ساردیەکە زەرەری لێنەدا. ئیتر بەو جۆرە ساردەوە بوو.

«توکّل» بە خوا بەسە وەک خەلیل    ئیتر تۆیش وەک ئەو قەت نابی زەلیل
بڕوانە هیممەت ئەو شای مەردانە    چەنێ قایم بوو لای ئەو یەزدانە

وەکوو بیستوومە لە مەرحوومی باوکم لە «کشەدەرەی» لای «کێلوو» ئەو ئاورو مەنجەنیقەیان بۆ حەزرەتی ئیبراهیم دروست کردووە و زەوییێ لەویا هەیە پێی ئەڵێن برایم ئاوا.

* * *

«۲۳»

## سەبر و لەسەرخۆیی

حەزرەتی پێغەمبەرﷺ زۆر بە تاقەت و حەوسەڵە بووە. ڕۆژێ عەرەبێ لە چادر نشینەکان ڕۆی بۆ خزمەت حەزرەت، داوای زەکات و خێراتی موسوڵمانانی ئەکرد. زۆر بە توندی وتی: لەو خێراتی موسوڵمانانە بەشی منیشی لێبدە خۆ ماڵ باوک و دایکت نیە بەش ئێمەی لێنەدەی. زۆر بە توندی نەوی لە یەخەکەی بە جۆرێ کە پشت ملی سوورەوە بوو کە خوێنی لێبێ. ئەسحابەکان هەڵسان بۆی لێی بدەن. پێغەمبەرﷺ نەیهێشت و فەرمووی: نەیزانیوە قەی ناکا. دەستووری دا کە لە زەکات و خێرات بەشی بەن.

بڕوانە عیلم و حیلمی ئەو پیاوە    کێ ئەگا بە ئەو ئالەو هەنگاوە
دەرسێکە بۆمان ئەم دەنگ و باسە    بۆکەسێ بەخت و شعووری خاسە

* * *

«۲٤»

## لەگەڵ نەزانان چۆن بین؟

هەر لە باسی بە تاقەتی ئەو حەزرەتا. عەرەبێ چادر نشین ڕۆیی بۆ خزمەتی لەوکاتا لە مزگەوتا بوو. عەیب نەبێ کە گمیزی هات لە ناو مزگەوتەکەدا دانیشت

بۆ گمیزکردن و کردی بە خۆیا. ئەسحابەکان هەڵسان رۆیین بۆلای لێی بدەن. پێغەمبەرﷺ نەیهێشت و فەرمووی: ئەمە تا ئێستە مزگەوتی نەدیوە و نازانێ، ئەبێ کەم کەم فێری کەن. دوای ئەوە دەستووری دا دۆڵچەیێ ئاو بێنن بیکەن بە جێی گمیزەکەیا با چێتە خوارۆ بە خاکەکەدا ئیتر پاک ئەبێتۆ.

چاولێ گەری کەین ئالەو حەزرەتە — دەرسێکی گەورە و زۆر بە قیمەتە
بیگرینە گوێمان مۆچیاریەکانــی — بە کاریەت بۆمان وەختی دامانــی

* * *

«۲۵»

## شکاتی ئاسک لای رەسوولی خواﷺ

حەزرەتی پێغەمبەرﷺ رۆژێ تووش نێچیرەوانێ بوو ئاسکێکی نەچیر کردبوو، ئاسکەکە کە چاوی بە پێغەمبەرﷺ کەوت دەسی کرد بە گریان، فەرمووی: ئەوە چیتە؟ وتی: ئاوا نەچیر کراوم و بەچکەکانم ئیمرۆ شیریان نەخواردووە و گوانم پڕیە لە شیر. فەرمووی: بە نەچیرەوانەکە من زامنی ئەم ئاسکە ئەکەم مەرەخەسی کە با بڕوا شیر با بە بەچکەکانی و جا بێتۆ. مەرەخەسی کرد و رۆیی و هاتۆ نەچیرەوانەکە وتی: قوربان تۆ کێیت؟ وا حەیوانی هەردی ملکەچی فەرمانی تۆن؟ فەرمووی: من موحەممەد پێغەمبەری خوام. دەسی ماچ کرد و ئیمانی هاورد و ئاسکەکەی بە تەواوی مەرەخەس کرد.

هەرکەس سەر نەرمی عیبادەت خوایە — سەرگەرمی زیکر و فکر و دۆعایە
ئەبێ گشت عالەم ملکەچی ئەو بن — گوێ قولاخ دەستوورفەرمانی ئەو بن

* * *

«۲٦»

## پارێزەر تەنیا خوایە

لە رۆژێ لە رۆژەکانا حەزرەتﷺ لە کاتی منالیا داوای کرد لە دایکی شیری _حەزرەتی «حەلیمە»_ کە ئیجازەی بدا لە گەڵ منالان بڕوا بۆ سەحرا تە دەرودەشت و جوانی سروشت تەماشاکا. حەلیمە ئیجازەی پێدا بە شەرتی ئەوە ک دوور نەکەوێتۆ لە کچەکەی کە ناوی «شیما» بوو. حەزرەتﷺ شەرتەکەی قەبووڵ

کرد و ئەیوت: من دەسی خوشکە شەیما بەرنادەم. بەرلەوە کە لە ماڵ بڕۆنە درۆ حەلیمە گەردن بەندێکی کردە مل حەزرەتﷺ کە منداڵ بوو، بۆ ئەوە کە بیپارێزێ لە هەموو شەڕێ. پرسیاری کرد دایە ئەمە چیە؟ دایکی وتی: ئەمە گەردن بەنێکە کردوومەتە ملت تا بتپارێزێ لە هەموو دەرد و بەلایێ. حەزرەتﷺ بەو منداڵییە گەردن بەنەکەی توورڕدا و فەرمووی ئەو کەسە کە منی دروس کردووە لە هەموو دەرد و ئازار و بێزارێ ئەمپارێزێ. ئەمیە فەرموو و پێکەنی و رای کرد بەرەو سەحرا و دەشت و دەر.

دەرسی تەوەککول ئەڵێ بە ئێمە — هەر خوا بناسین لە دەشت و خێمە
هیچ دەرد و بەلا بەبێ ئیزنی ئەو — نایێ بۆلامان بە رۆژ و بە شەو
تەوەککول قایم بەسین لە سەری — ئەژین بە خۆشی و بێ دەردی سەری

* * *

«۲۷»

## کار کردن عیبادەتە

دینی ئیسلام دینی عیبادەت و کارکردنە. وەلێ بازێ لە موسوڵمانان لەم کارە بێخەبەرن. ئەگێڕنۆ کە حەزرەت پێغەمبەرﷺ رۆژێ رۆیی بۆ مزگەوت بۆ نوێژی بەیانی. تەماشای کرد پیاوێ لەوێ عیبادەت ئەکا کە بۆ نوێژی نیوەڕۆ هاتۆ ئەو پیاوە هەر لەوێ بوو نەرۆیبوە دەرۆ لە مزگەوت. کە بۆ نوێژی مەغریب هاتۆ چاوی پێکەوت کە سەرگەرمە بە عیبادەتۆ وەک جاران. لێی پرسی لەوە ئەچێ تۆ لە بەیانێو وای لەم مزگەوتا نەچوویتەسە دەرۆ بێجگە عیبادەت کارێترت نیە؟ ئەو پیاوە جوابی داوە: من هەمیشە عیبادەت ئەکەم بۆ خوا بەشکوو بمخاتە بەهەشت کە زۆر حەزی لێئەکەم. پێغەمبەرﷺ پرسیاری کرد کێ بژیوی خێزانەکەت بۆ بەڕێوە ئەبا؟ وتی: براکەم، وەلێ ئەو وەکوو من خەریک عیبادەت نیە. خۆزگە ئەویش وەکوو من وابوایێ. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەو بەبۆن کارۆ لە تۆ لە بەهەشتا بەشدارترە. لەبەر ئەوە کە کارکردن خۆی عیبادەتە.

پێنج فەرزە بکەو خەریکی کار بە — لە منەتی خەڵک ئیتر رزگار بە
دەس کاریگەری ماچ کردووە حەزرەت — بۆ ئەوە ئێمەیش بکێشین زەحمەت

.........................................................

کەسابەت بۆ خۆی هەر عیبادەتە     باعیس سەربەرزی گەل و میللەتە

***

«۲۸»

## کەرامەتی ئەولیا حەقە

لە کتێبی حەدیسا هاتووە: لە زەمانی خەلافەتی حەزرەتی عومەرا ﷺ لە دەوری کێوی ئەلوەندا لە «هەمەدان» کافرەکان لە پەسادا ئەبن کە کێوەکەیان بگرن. حەزرەتی عومەر ﷺ لەو وەختا خوتبە ئەخوێنێ لەسەر مینبەر لە مەدینەدا چاوی تێیانۆ ئەبێ بانگ ئەکا لە سەرکردەکەیان «یاساریةُالجَبَلَ». واتە: ساریە فریای ئەو کێوە کەون کە وا لە پشتتانۆ. هۆردووی ئیسلام کێوەکە ئەگرن و کافرەکان ئەشکێنن.

ئەمە سێ کەرامەتی واتیا ١.ئەمە کە حەزرەتی عومەر ﷺ چاوی تێیانۆ بوو. ٢.دەنگی کەوتووەتە گوێی ساریە. ٣.«ساریە» دەنگەکەی بیستووە و حالی بووە.

مەعلووم کەرامەت ئەولیا حەقە     مونکیریان قسەی رەدد و ناحەقە
هەتا ئەتوانی دووریان لێکە     وەک ئەوان تۆخۆت تاوانبارمەکە

***

«۲۸»

## دەس و دڵ باز و تەماعکار

لە حەدیسا هەیە هەموو بەیانیێ کە رۆژ ئەبێتۆ دوو مەلائیکە لە ئاسمانۆ یێن بۆ سەر زەوی هەریەکی دۆعایێ ئەکەن ئەویان ئەلێ ئامین یەکێکیان ئەلێ: خوایا هەرکەسێ هەسی و دەسی تێ‌ئەچێ خەرجی ئەکا هەمیشە جێگەداری بۆ بنێرە با هەمیشە دەسی پڕ بێتۆو پەکی نەکەوێ. ئەویان ئەلێ: ئامین. ئەویش ئەپاڕێتۆ و ئەلێ: خوایا هەرکەسێ هەسی و دلی نایێ خەرجیکا هەمیشە خەسارەت و تەلەفاتی بۆ بنێرە، ئەویان ئەلێ ئامین. جا تۆ تەجرەبەی بکە هەمیشە هەروایە.

رزق وەکوو ئاوی کانی وەهایە     تا ئەمیە نەڕوا ئەوی‌تر نایێ
بەرگیری مەکە با هەروا بڕوا     پەکت ناکەوێ پێم بکە بڕوا

***

«۲۹»

## تووڕە مەبن

پیاوێ لە ئەسحاب ڕۆیی بۆ خزمەت حەزرەت پێغەمبەرﷺ وتی: من چی بکەم باشە؟ حەزرەت فەرمووی: تووڕە مەبە چەن ڕا پرسیارەکەی تەکرار کردۆ لە جوابا هەرفەرمووی: تووڕە مەبە. وا دیارە عەیبی هەر تووڕەیی بووبێ. لە حەدیسێترا هەیە کە لە وەختی تووڕەییا شەیتان گەمە ئەکا بەوکەسە کە تووڕەیە، وەکوو منال گەمە ئەکا بە تۆپی بازی و بە شەق بۆ هەرکوێ مەیلی بێ ئەیبا. بڕوانە بۆ تووڕەکە کە چۆن سوورۆ ئەبێتۆ. ڕەگ ملی هەڵەسێ. کە شیددەت پەیا ئەکا هەموو بەدەنی ئەلەرزێ. جا کە شەیتان لە ئاور دروس کراوە ئاور بە ئاو ئەکوژێتۆ عەلاجی ئەو تووڕە ئەوەیە کە بە ئاو چڕو چاوی بشۆرێ. دەسنوێژ بشۆرێ باشترە و سوننەتە چوون بە پاوۆ ئامادەیی بۆ دەس وەشاندن زۆرترە دانیشێ کە بە دانیشتانۆ بوو ڕاکشێ کە بەمانە چاک نەبوو ئەو شوێنە بەجێی بێڵێ با لە ماڵ خۆیشیانا بێ.

تووڕەیی لابە مەیکە بە پیـــشە ئارام و سالم ئەبی هـــەمیشە
تووڕە دڵی خەڵک نابا بەڕێوە بۆ دڵ نەوایی هەروا بە ڕێوە

* * *

«۳۰»

## هاوسێی خراپ و ئەخلاقی جوان

پێغەمبەر خۆمانﷺ هاوسێیەکی کافری ئەبێ کە زۆر ڕقیەبێ لە حەزرەت. هەموو ڕۆژێ ئیسراحەت لە خۆی ئەشێوێنێ و خەوش‌وخاڵ و خۆڵ و بووڵ کۆ ئەکاتۆ تا ئێوارە و شەو خەو لە خۆی حەرام ئەکا تا فرسەت بێنێ لە بەیانی زووا کە حەزرەتﷺ ئەڕوا بۆ نوێژ، خەوش‌وخاڵ و خۆڵ و بوولەکە بکا بە سەریا. کە ئەم کارە زشتە ئەنجام ئەدا تەبعی حەزرەتﷺ ئاوا ئەبێ کە بە ئارامی تێپەڕ ئەکا و هەرچی تۆز و گەردی لێ‌ئەنیشێ ئەیتەکێنێ و هیچی پێ‌نالێ، تا وەختێ کە هاوسێکە نەخۆش ئەکەوێ و بەینێ دیار نابێ ئەزیەتی کا. حەزرەتﷺ بۆی ئەپرسێ لە کوێیە؟ ئەڵێن نەخۆشە. ئەفەرمێ: حەقی هاوسێتی وابە سەرمۆ ئەڕۆم بۆ

هەواڵ پرسینی. کە ئەڵین موحەممەد هات بۆلات ئەترسێ لە دڵ خۆیا ئەڵێ: ئێستە کە لانم زەبوونە و کزە رەنگە بۆ تۆڵە سەندنەوە هاتبێ. کە بە زوانی خۆش و شیرین هەواڵ پرسی ئەکا زۆر خەجاڵەتی ئەیگرێ و ئەڵێ ئەم خوولق و خووە جوانە کە ئەم زاتە هەیەتی خوا پێی داوە و پیاوی عادی و ئاسایی وا نیە حەتمەن ئەمە پێغەمبەری خوایە. بە زوانیش ئەڵێ گەورەیی تۆم بۆ دەرکەوت و بۆم روونۆ بوو کە تۆ پێغەمبەری خوای. حەزەکەم ریگەی دین و ئیمانم پیشان بدەی و موسوڵمان ئەبێ. هاوسێیەک حەقی هەیە کە موسوڵمان بوو ئەبێ بە دوو حەق. کە خزمیش بێ ئەبێ بە سێ حەق لە حەدیسا هەیە ئەگەر حەقی خزمایەتی لە پێشۆ نەبوایە ئەبوا میراتی هاوسێ هاوسێ بیبردایە.

ئاوسێ وەزەنی مەکە تا ماوی     ڕوو ناکەنە تۆ کزی و داماوی
ئەو شەڕ فرۆشە و بیانوگەرە     بە گەورەیی خۆت بیانوی بڕە
تا بێ عیزەتت بەوە زیاد ئەکا     بۆ هەردوو دونیا سەربەرزت ئەکا

* * *

«۳۱»

## منالێکی خۆشبەخت

رۆژێ پێغەمبەر سەلامی لەسەر تێپەڕئەکا بە لای کۆمەڵێ منالا کە بە خۆشی و شادی گەمەیان ئەکرد. یەکێ رووتەڵە و فەقیریان لە دوورۆ بە کزێکۆ دانیشتبوو پێغەمبەرﷺ رۆیی بۆ لای و لێی پرسی بۆچی تۆ رووتوقووتی؟ بۆ نارۆی لەگەڵ ئەوانا گەمە بکەی؟ وتی: من باوکم لە غەزای ئیسلامدا شەهید کراوە. ئەونە داماوم هیچ کەسم نیە دەسم گرێ و خەرجیم کێشێ و هیچ خۆشییەک لە دڵما نیە کە گەمە بکەم. وە ئەگەر منالان شەڕکەن لە گەڵما کەسم نیە لەسەرم کاتۆ، بۆیە لێرا بە کزۆ دانیشتووم. پێغەمبەرﷺ دەسی گرتوو بردیۆ بۆ ماڵۆ و فەرمووی: تۆ ڕازی ئەبی بەوە کە من بم بە باوکت، عایشە خاتوون بێ بە دایکت، عەلی بێ بە مامەت، فاتمە بێ بە خوشکت، حەسن و حوسەین بن بە برات؟.کە لەگەڵ خۆی بردیۆ ئەمانەتی سپارد بەوانﷺ ئەوانیش بە هەموویان زۆر نازیان ئەکێشا. لباس وخواردن و خۆراکی زۆر لە باوکدارەکان باشتر بوو ئەمجارە زۆر

به شانازیۆ ئەڕۆی بۆ ناو منالآن بۆ گەمە و ئەیوت: مـن پێغـەمبـەر باوکمـە و عایـشە خاتوون دایکمە و عەلی مامەمە و فاتمە خوشکمە و حەسەن و حوسەین برامن. ئیتر منالآن ئاواتیان پێ ئەخواست ئەونە بەکەیف وخۆش حاڵ بوو.

ئێمەش با ئاوات خوازین لەوکوڕە  که بوو بە باوکی ئەو دەریا دوڕە
ئەو خوشک و برا و مامە و دایکیە  کەسوکاری وا لە هیچ کوێ نیـە

❊ ❊ ❊

«۳۲»

## کەس لە خێر خۆی لا نادا با دەوڵەمەنیش بێ

حەزرەتی داوود پێغەمبەر باوکی سولەیمـان «سـلاوی خوایـان لـەسـەر» لـە ساڵی ۱۰۱۰دا لەپێش مەسیح لـە دایـک بـووە وکتێبی زەبـووری لای خـواوۆ بـۆ هاتووە. زۆریش دەوڵەمەن بووە. لەگەڵ ئەوا ڕۆژێ لە شوێنێ چۆڵا خۆی ئەشۆرێ تەماشا ئەکا لە دوورۆ شتێ وەک تەلا بەرق ئەداتۆ بەو ڕووتەڵییە ئەڕوا بۆی تەماشـا ئەکا پەیکەرێکە لە شێوەی کولە. ئەیخاتە ناو لیباسەکانی تا دوای خۆشـۆرینەکـەی ئەیباتۆ بۆ ماڵۆ. دوای ئەوە خوا لێی ئەپرسێ: خۆتۆ دەوڵەمەنی، بۆچی بەو ڕووتەڵییە ڕۆیت ئەو تەلاتە هانی بۆ خۆت؟ لە جوابا وتی: کەس لە خێر و بەرەکەت تۆ تێری نەخواردووە و تێر ناخوا.

راسـی فـەرمـووە حـەزرەتی داوود  سەلامی لێ بێ سەلامـی مەعبوود
لـە خێروبێری خـوا ئیتـر خـواردن  بۆ هیچ‌کەس نیە، تا کاتـی مـردن
وەختێ کە مردین، دەم پڕبوو لە خاک  دەرگانەی تەمەع ئەبەسرێ سەرپاک

❊ ❊ ❊

«۳۳»

## بێ ئەمری دایک و دۆعای شەڕی

عابیدی ناوی جورەیج بوو لە غارێکا خوا پەرەستی ئەکـرد. ڕۆژێ دایکـی حەزی کرد لە دیدەنی ڕۆی بۆلای و بانگی لێ‌کرد وتی: خوایا من نوێژ ئـەکـەم و دایکیشم بانگم ئەکا نوێژی دابەست و جوابی دایکی نەداوۆ چەن ڕۆژێ هەروا بوو دایکی ئەڕۆی و جوابی نەئەداوە و دایکی دڵی ئێشا و دۆعای لێ‌کرد و وتی: خـوا

........................................................................................................

تووشی ژنی بێ‌حەیا و بێ‌ئابڕووت کات. خوا دۆعاکەی قەبووڵ کرد و شەوێ لە ماڵێکا تاریف جورەیج و چاکی خواپەرەستی ئەویان ئەکرد، ژنێ بێ‌دین وتی: من بە داو و تەڵەیێ ئەتوانم تووشی بێ‌دینی بکەم بە گرەو. وتیان: ئەگەر تۆ بتوانی ئەو کارە بکەی ئەوەندە ئاڵتوونت پێ ئەدەین، چوو بۆ دەور غارەکەی، هەرچی بانگی کرد جورەیج جوابی نەداوە و هەرچی وتی: درگام بۆ کەرۆ بۆی نەکردۆ. رۆی شوانێکی بەگیر هاورد لەگەلیا رێکەوت و عەیب نەبێ نای لە خۆی. منالێ لە سکیا پەیا بوو. وەختێ دەرکەوت، وتی: ئەم منالە هین جورەیجە جایزەکەی سەند و رۆیین بۆ جورەیج بە پەت پەتی هانیانە خوار و زۆر بێ‌حورمەتیان کرد و لێیان دا، وتی: بۆچی وام لێ‌ئەکەن؟ وتیان: تۆ پەنت داوە بەو ژنە و ئەو منالە تازە بووە هی تۆیە، جورەیج وتی: لێم خایەنن تا دوو رکات نوێژ ئەکەم جا بمکوژن. دوو رکات نوێژی کرد، و پرسی لە منالەکە تۆ کوڕی کێیت؟ جوابی داوە من کوڕی فلانە شوانم. هەموو بە جارێ کەوتنە خاک و پای جورەیج و وتیان: ماڵەکەت لە زیو و تەلا بۆ دروست ئەکەینۆ لێمان ببوورە. وتی: ماڵەکەم هەروەک خۆی لێ بکەنۆ بۆم ئیتر هیچم ناوێ. ئەمەیش دۆعای دایکم بوو ئەمەی بەسەر هانیم حەقمە.

دۆعای دایک و باوک وەک تیر ئەبڕێ — نان و قسمەت و حورمەت ئەبڕێ
جورەیج بەو هەموو عیبادەتۆ بوو — لە دۆعای دایکی رزگاری نەبوو

* * *

## بەشی سێهەم لە فەرمایشی زانایان وەرگیراوە

«١»

### فەقێ و خادم

مەلا شێخ مەعرووفی کوڕی شێخ موستەفا باوکی حاج کاک ئەحمەد لە نۆدێ لە قەزای چوارتا لە ساڵی ١١٧٥مانگیدا لە دایک بووە و لە ساڵی ١٢٤٥ لە سلێمانی وەفاتی کردووە و مەرقەدی وا لە سلێمانی گردی سەیوان، لای مەرقەدی سلێمان پاشای بابان. دەسەیێ شیعری عەرەبی زۆر چاکی نووسیوە بۆ تەئریخی مزگەوتی جامیعەی سنە، بە کاشی‌کاری لە دالانی مزگەوتەکەدا دایان‌کوتاوە و ئێستەش بازێکی ماوە. حاجی کاک ئەحمەدی سلێمانی کوڕی شێخ مەعرووفە لە سلێمانی لە ساڵی ١٢٠٨مانگی لە دایک بووە و لە ساڵی ١٣٠٥ لە سلێمانی وەفاتی کردووە و مەرقەدی وا لە مزگەوتەکەی خۆیانا لە سلێمانی کە مەشهوورە بە مزگەوتی گەورە.

ئەگێڕنەوە کە فەقێکانی باوکی حاجی کاک ئەحمەد ئەڕۆن بۆ مزگەوت تەماشا ئەکەن سەگێ وا لە ناو مزگەوتەکەدا دەرگای مزگەوتەکە ئەبەسن و سەگ بە مزگەوتی پێ‌کەن، لە ترسا خۆی پیس ئەکا و فەرشەکانی مزگەوت تەواو پیس ئەبن. دوای ماوەیێ دەرگای بۆ ئەکەنۆ خادیمەکە دێت و ئەڕوانێ مزگەوت هیچی نەماوە. خادم ئەڕوا بۆ شکات بۆ خزمەت شێخ مەعرووف کە فەقێکانت سەگیان بردووەتە ناو مزگەوتەکە و هیچی نەماوە هەمووی پیس بووە. مامۆستا دەستوور ئەدات کە نابێ ئەو فەقێ تاوانبارانە لەگرا بین و ئەبێ هەموویان بڕۆن، فەقێیش زۆر ناڕەحەت ئەبن کە مامۆسای وایان دەس‌ناکەوێ، ناچار ئەڕۆن بۆ خزمەت حاجی کاک ئەحمەد کە تکایان بۆ بکات کە دەریان نەکات، حاجی کاک ئەحمەد ئەڕوا بۆ خزمەت باوکی بۆ تکا، باوکی ئەفەرموێ: من فەقێی وام بۆ چیە، کە سەگ بێنێتە ناو مزگەوت سەگەڕاوی پێ‌بکات و مزگەوت پیس‌کا. حاجی کاک ئەحمەد ئەڵێ: خادیمەکە درۆی بۆ فەقێکان کردووە، سەگ نەبووە و تانجی بووە. ئەفەرمێ: کە وابێ بڕۆ فەقێکان ئاشتۆکە با نەڕۆن. وا دیارە شێخ مەعرووف ئا لەم لێبووردنا چوار کاری گرینگی کردووە.

.............................................................................

١.خۆی گێل کردووه که تانجی سەگ نیه. ٢.نەسیحەتی فەقێکانی کردووه که رایێتر کاری وا نەکەن. ٣.حاجی کاکه ئەحمەدی دڵخۆش کردووه که تکای لێقەبووڵ کردووه. ٤.خادیمەکەی بێدەنگ-دڵخۆش کردووه که ئەو هەموو زەحمەتەی بۆ بەجێماوه.

* * *

«٢»

## فەقر و جەهالەت

حەزرەتی عەلی فەرموویەتی: لەگەڵ هەر زۆرداریکدا زۆران بازی کەم ناترسم پشتم بدا له عەرز. وەلێ له فەقر و نەزانی ئەترسم که پشتم بدەن له عەرز و لەوانەوه تووشی گوناهـ ببم.[١]

***

«٤»

## حەقی دراوسێ

ئیمامی حەنەفی له ساڵی ١٥٠ی قەمەری له عومری ٧٧ساڵید لەو ساڵا ئیمامی شافیعی له دایک بووه، وەفاتی کردووه. بۆیه وتوویانه: «ئیمامێ فەوتی کرد و ئیمامێ له دایک بوو» ئیمامی حەنەفی ٤٠ ساڵ لەسەر یەک نوێژێ بەیانی به دەسنوێژی عیشاوه خۆندووه. تا بەیانی خەریکی عیبادەت و عیلم پەروەری بووه. هاوسێیەکی ئیمام حەنەفی ئارەق خۆر بووه، تا بەیانی له خزمەتی ئارەق خواردنا ئەبێ. تا رۆژێ مەعموور حکوومەت ئەیگرن و ئەیخەنه زیندان. دوای چەن رۆژێ بۆی ئەپرسێ ئەڵێن حکوومەت زیندانی کردووه. ئەڕوا بۆ سەرای حکوومەت بۆ بەردانی. حاکم ئەبینێ ئیمامی حەنەفی تەشریفی هێناوه بۆ سەرا و تا ئێسته شتی وەها نەبوه. به پێخاوسی ڕا ئەکا به دەمیۆ و دەستی ماچ ئەکا و ئەڵێ قوربان زۆر عەجایبه تەشریفت هێناوه بۆ ئێره؟! ئەفەرمێ موشکلێکم هەیه بۆیه هاتووم ئەڵێ: قوربان سفارشت کردایێ ئەهاتمه خزمەتت. ئەفەرمێ: من کارم به تۆیه ئەبێ من بێم، ئەڵێ چی؟ ئەڵێ: وام له خزمەتتا. ئەفەرمێ: فلانکەس دراوسێی ئێمەیه و

---

١. له کتێبی «احیاء علوم الدین» ئیمام غەززالی وەرگیراوه.

مەعمووری تۆ گرتوویانە. ئەمەوێ ئازادی کەن. فەورەن حاکم دەستوور ئەدا ئازادی ئەکەن و ئیمام لەگەڵ خۆی ئەیباتۆ. لە ڕێدا عەرز ئیمامی حەنەفی ئەکا من لایەق ئەم لوتفە نەبووم تۆ بۆ واتە کرد؟! فەرمووی: بە شەرعی ئیسلام هاوسێ حەقیان بەسەر یەکەوە هەیە. منیش حەق خۆم بەجێ هانی. ئەویش ئەڵێ: ئیسلام کە ئەونە دینێ پاک و جوانە ڕێگەی تەوبەم نیشان دە، با تەوبە بکەم. لەسەر دەستی ئیمام ئەوبوحەنیفەدا تەوبە ئەکا و بەڕێوەی ئەبا و ئەبێ بە پیاوێ خاس و موسوڵمانێ باش.

ئەر لە بەر قەومی و کەسی نەئەبوو　　　هاوسێ میراتی بۆ هاوسێ ئەبوو
ئێستەیش کە بمرێ و واریسی نەبێ　　　میراتی لەبۆ موسوڵمان ئەبێ
«بیت المال» ئەیبا بۆ موسوڵمانان　　　سەرفیەکا لە ڕێی مەسڵەحەت ئەوان

❊ ❊ ❊

«۵»

## چاوێ بۆ خوا نەبێ نەبوونی باشە

شێخ حەسەنی بەسری لە تەمەنی لاویا تەبیعەتی زۆر هەڵە و هەرزە بووە. بەیانیێ لە خەو هەڵسا و وتی: ئەبێ ئەمڕۆ لەم شاری بەسرە ژنێ زۆر جوان پەیاکەم. ژنێ کەوتە بەرچاوی دوور و نزیک بە بازاڕ و کۆلانا کەوتە شوێنی تا لە ناو شار دەری کرد. ژنەکە رووی کردە تاقە ماڵێ. تەماشای کرد هەر ها بەشوێنیۆ کە گەرەکیبوو بچێتە ژوورۆ وتی: برا تۆ چیت لە من ئەوێ و بۆچی کەوتوویتەسە شوێنم؟ وتی: ئەو چاوانتە شێتی کردووم و ناتوانم بەجێیان بێڵم. وتی: دەی لێرەدا ماتڵ کە ئێستە چاوەکانم یێن بۆلای تۆ، لە دڵ خۆیا وتی ئەوە قەولی پێداوم بێ بۆلام. زۆر دڵی خۆش بوو. ژنەکە چووە ژوورۆ هەردوو چاوی دەرهانی و خستیە سەر سینییێک و وتی بە کارەکەرەکەی: بیانبە بۆلای ئەو کوڕە لە دەرۆ وێستاوە، پێی بڵێ چاوێ کە موشتەری وەکوو ئەوم بۆ پەیداکا نامەون بیبا بۆ خۆی، حەسەنی بەسری چاوی کەوت بەو دوو چاوە کە لە ترسی خوا ئەو ژنە دەری هێناوە زۆر خەجاڵەتی رووی تێکرد و زۆر گریا و تەوبەی کرد ئیتر تا مابوو بەردەوام بوو

.....................................................................

لەسەر تاعەت هەتا ئاوا ناوی دەرکرد بە شێخ حەسەنی بەسری و بوو بە یەکێ لە ئەولیاکانی خوا.

تا دونیا ماوە ناوی هەرماوە   لە بیر ناچێتو ناوی ئەو پیاوە
هەرتاکوو مابین با ئێمەیش وا بین   ئێمەیش لە سایەی ئەو پیاوانا بین

❊ ❊ ❊

«٦»

## پیری تەریقەت ئاوایە

خوالێخۆش بوو حەزرەتی غەوس «قدس سرّه» لە ساڵی ٤٧٠ دا لە دایک بووە و ٩١ ساڵ عومری کردووە. شاهی نەقشبەند دوای ئەوە کە سێ مورشیدی گۆڕیبوو کە یەکێکیان ئەمیر کەلال بووە و هەموو مورشیدەکانی یەک لە دوای یەک فەوتیان کردبوو، لە دەرسی تەریقەتا موشکلێ رووی تێئەکا و بە ئەولیای زینووی ئەو رۆژە بۆیان حەل نابێ. ناچار شاهی نەقشبەند پەنا ئەبا بە مەرقەدی حەزرەتی غەوس دوای ۲۰۰ ساڵ رووی تێئەکا و ئەڵێ:

ای پیر دستگیر دست مرا گیر   دست مرا چنان‌گیر که توگویند دست گیر

حەزرەتی غەوسیش لە قەبرەکەیا جوابی داوەتۆ و فەرموویەتی:

ای شاه نقشبند نقش مرا ببند   نقش مرا چنان ببندکه توگویند نقشبند

نەخشێ وەها لە دڵیا پەیدا ئەبێ کە موشکڵەکەی حەل ئەبێ و ئێستەیش هەرکەسێ موریدی تەریقەت نەقشەبەندی بێ ئەبێ ئەو نەخشەیە پێوە بێ.[1]

شای نەقشبەند و غەوسی گەیلانی   پیر و مرید بوون ئەگەر ئەیزانی
فیتنەیی مەکە لە بەین ئەوانا   با روو زەرد نەبی لە رووی ئەوانا
وەک یەک موریدی هەردووکیان نەبی   زەرەر لێکەوتووی دوودونیا ئەبی

❊ ❊ ❊

---

١. لە کتێبی «طبقات» وەرم گرتووە.

«٧»

## پیری راستەقینە ماڵی دونیای بۆ خەڵکە

مەلا ئەبووبەکری موسەننیف چۆڕی «رحمەالله» لە کتێبی «ریاض الخلود»ا لە باسی مورشیدا ئەفەرمێ: شێخێ بوو کە زۆر کەرامەتدار و مورید و مەنسووبدار و خۆشەویستی عولەما و پیاو ساڵحی ئەو رۆژە، لەگەڵ ئەوا زۆر دەوڵەمەند بوو هەر لە رەسەنی ئەسپ و ماینا حەفتا و پێنج دانەی بوو. یەکێ لە پیاو خواکان رێی کەوتە ئەو خانەقایە کە تەماشای سەڵتەنەتی ئەکرد لە دڵ خۆیا وتی: شێخیەتی و ئەم سەڵتەنەتە!؟. با تەجرەبەی بکەم بزانم تا چەنێ عەلاقەی بە ماڵ دونیاوە هەیە؟ رۆیی بۆ نزیک شێخەکە و وتی: نەخۆشم و دەوایەکیان بۆ داناوم مەگەر لای تۆ دەسم کەوێ. وتی چیە؟ وتی: ئەبێ ئەسپێ سەر برم و بە مەغزەکەی خۆم بناووم. دەستووری دا بە مەیتەرەکان هەر ئەسپێکی ئەوێ بیدەنێ. ئەسپێکی سەر بڕی لە دواییدا وتی: ئەو رەنگە کە من ئەمەوێ ئەمە نیە. شێخ دەستووری دا یەکێتری بۆ سەربڕن. هەروا یەکە یەکە ئەسپی سەر بڕی تا دوانزە ئەسپ رۆیی. دوایی شێخ دەستووری دا تا تەواو ئەسپەکانی گەرەکبێ بۆی سەربڕن. جا میوانەکە وتی: ئەسپ زۆر خۆشەویستە و منیش تەجرەبەی تۆم کرد بزانم عەلاقەی دڵت بە ماڵ دونیاوە زۆرە؟ لە ئیمتحان دەرچووی. شێخ فەرمووی: مێخ زەنجیر ئەو ئەسپانەم بە گڵا چەقاندووە نەک بە دڵا.

| | |
|---|---|
| تۆ دەوڵەمەندبە و تۆسەروەتداربە | سەر بەرزو رووسوور رووی رۆزگاربە |
| ئەگەر کۆی کەیتۆ دەین بێتە ملت | ئەبێ بە تەوق و ئەچێتە ملت |
| زەخیرەی نەکەی لەبۆ قیامەت | ئەبێ بە مایەی شەڕ و نەدامەت |

* * *

«٨»

## داپۆشینی عەیب و لە خۆ بوردن

ئیمامی غەزالی لە باسی جەوانمەردیدا دوو باسمان لە ئیحیادا بۆ ئەگێڕێتەوە.

١. ئەفەرمێ: حاتەمی ئەسەم کە عالمێ گەورە بووە ژنێ بۆ پرسیارێکی شەرعی ئەچێتە خزمەتی. خۆی کۆئەکاتۆ کە پرسیارەکەی بکا، بایەکی لێ ئەبێتەوە. حاتەم خۆی ئەکا بە کەڕ. ئەفەرمێ: بە دەنگ بەرز قسە بکە من کەڕم نابیسم. ژنەکەیش زۆر حەز ئەکا لە دڵ خۆیا ئەڵێ ئۆخەی گوێی لێ نەبووە. دوای ئەوە بە حاتەمی ئەسەم ناو بانگ دەرئەکا. یانێ: حاتەمی کەڕ.

٢. ئەڵێن پیاوێ ژنێکی مارەکرد بە تەمابوو بیگوێزێتۆ چاوی ژنەکە کوێر ئەبێ. لەبەر ئەوە کە ئەو ژنە دڵی مەن نەبێ، ئەویش ئەو چاویە ئەکا بە کوێر تا بیست ساڵ بەو جۆرە بە یەکۆ ئەبن. لە دوای ئەوە کە ژنەکە ئەمرێ و ژنێ‌تر یێنێت ئاشکرای ئەکا کە چاوم کوێر نەبووە هەر لەبەر دڵ ئەو ژنە خۆم کردبوو بە کوێر.

دڵداری دڵی فەقیر و هەژار        خێرەکەی زۆرە لای خودای غەففار

* * *

«٩»

## زیادەڕەوی

حاتەمی ئەسەم لەگەڵ جەماعەتێ رێ‌کەوتن بۆ حەج. رۆێنە شاری رەی. حاتەم بوو بە میوانی قازی رەی، کە رۆیی بۆ دەور ماڵیان تەماشای کرد وەک سەرای حکوومەتی نۆکەر لە خواجە نشینا ویساون و لە ئەترافی ماڵیشیانۆ نۆکەر راوێشکان ئەکەن. خەبر قازی پرسی، وتیان: نەخۆشە، ئیجازەی مولاقاتی گرت و چوو بۆ خزمەتی نیوە هەڵسانێکی کرد لە بەری و وتی: لەوە زیاتر ناتوانم هەڵسمۆ. لەبەر چاویا دوای مانوو حەسانەوە دەسنوێژێکی شۆری چوار دەفعە ئاوی دا بە دەم و چاویۆ قازی وتی: سێ دەفعەیە. سێ مەکە بە چوار، ئیسرافە. حاتەم وتی: تۆ ئەم هەموو ماڵەت کۆ کردووەسۆ ئیسراف نیە، بۆ مشتێ ئاو من ئیسرافە، زانی کە مۆجگاری ئەکا ئەونەی‌تر باری گران بوو. دوای ئەوە کەمتر دونیای کۆئەکردۆ.

* * *

«١٠»

## ماڵی دونیا و تەقوا کامیان

هەر لەو سەفەرا بوو بە میوان قازی هەمەدان، تەماشای کرد لە هەموو ناز و نیعمەت دونیا لە ماڵیا هەیە. وتی: قازی تۆ لە ئایەت و حەدیس و شەریعەتی ئیسلاما بیستووتە یا دیوتە کە هەرکەس ماڵی دونیا و کەلەپووری زۆرتر بێ لای خواوە پاداشی زۆرتر ئەبێ وتی: نەوەڵلا وتی: ئەی چۆنت بیستووە؟ وتی: شەریعەت ئیسلام و ئایەت و حەدیس وایان داناوە کە هەرکەسێ تەقوا و عیبادەتی زۆرتر بێ لای خوا بەشی قەوی‌ترە، قازی زۆر خەجاڵەتی گرتی و گریا. لە حەدیسا هەیە هەموو کەسێ لە قیامەتا نایەڵن پا بنێتە بەر پێ تا چوار سوئالی لێ‌نەکەن: ١.ئەڵێن ئەم بەدەنە لەزیزتە لە چیا پرتووکانووە ٢.ئەم عومرە عەزیزتە لە چیا فەوتانووە ٣.ئەم ماڵ دونیاتە لە چیەوە بەدەس هانیوە ٤.ئەم ماڵی دونیاتە لە چیا خەرج کردووە. هەموومان هەر لە ئیسەوە لە جوابی ئەو چوار سوئالا داماوین با وەلامیان بۆ حازر بکەین.

❊ ❊ ❊

«١١»

## ماڵی مەدینەیی

هەر لەو سەفەرا حاتەم ئەسەم چووە مەدینەی مونەووەرە پرسی بۆ ماڵی پێغەمبەر و چوار خەلیفە و ئەسحابەکانی، جێ ماڵەکەی ئەوانیان نیشان ئەدا ئەویش ئەیوت ئەمانە لە ماڵی فیرعەن و شەدداد و نەمروود ئەچێ کەی ماڵی ئەوان وابووە خەبەریان دا بە حاکمی وەخت وتی: بی‌هێنن کە روو بە روو بوون حاکم وتی: تۆ ئەڵێی چی؟ وتی وەکوو ئێمە لە کتێبا دیومانە پێغەمبەر و ئال و یارانی زۆر فەقیر و سەبوور بوون و ئێوە ناتەواوییەکتان نیە حاکم وتی: راس ئەکەی

ئیستە تەماشای مەدینە بکە زۆرتر لە حاتەم ئینکاری بکە

❊ ❊ ❊

«١٢»

## خواردنی ماڵی هەتیو

پیاوێکی بە عیبادەت و پیاوچاک فەوتی کرد. خەڵکێ بەتەما بوون کە وەزعی ئاخیرەتی زۆر باش بووبێ. لە خەوا چاویان پێکەوت کە زۆر داماو و لێقەوماو بوو، ئەو نەفەرە خەوەکەی بەلای مەلایەکەوە گێڕایەوە کە زۆر لە حاڵی ئاگادار بوو وتی: لەوانەیە ئەم خەوە زۆر راس بێ کە من ئەزانم ماڵی هەتیوی خواردووە.

ماڵ هەتیو مەخۆ گوناهـ کەبیرەس خەیانەت بە ماڵ بێکەس و بێدەس

* * *

«١٣»

## خۆشەویستی مناڵ

حەزرەتی «عبدالقادر گیلانی» وەکوو لە مەناقیبا نووسراوە هەموو رۆژێ مەجلیسی مەوعیزەی بووە موریدەکانی تا ماوەیێ زۆر کۆ ئەبوونۆ مەوعیزەی بۆ ئەکردن و دەرسی دائەدان. رۆژێ لەو وەختا خەبەریان بۆ هانی کە کچ وکوڕێت هیلاکن. هەر مەوعیزەکەی نەشێوان تا لەسەر خۆی بە عادەتی خۆی مەوعیزەکەی تەواو کرد جا دەستووری دا کە بیان شۆرن و بیانێژن وا دیارە لەبەر مەحەببەتی خوا نەیپەرژاوەتە سەر مناڵەکانی.

دەیسا با ئێمەیش هەروەک ئەو وابین سەرگەرمی حوبب و رەزای خودا بین
ماڵ و مناڵ گشت زینەت دونیایە سەرمایەی گشتمان رەزای خوایە
ماڵ و مناڵیش بەیـن لە رێی رەزا بۆ روتبەی بەرزی رەزا بە قەزا

کەچی ئێمە مناڵێکمان تاوێ یاو بیگرێ دونیامان لێ تاڵ ئەبێ و دونیا ئەنێینە یەک.

مناڵ بێوەفاس وا نەبین باشە تەجرەبە دەرسێ گرنگ و باشە

* * *

«١٤»

## جیرەی موشکل گوشا

باڵوولی دانا برای هاروونەڕەشید بووە. هاروونەڕەشید پاشا و باڵوول دەرویش‌مەسلەک بووە. ڕۆژێ وتیان بە باڵوول ئەوە بۆچی هاروون جیرەیەکت بۆ نابڕێتەوە کە دڵ ئارام و بێ‌خەم بی؟ وتی: من جیرەی کەسێکم ئەوێ کە ئەم وەسفانەی تیا بێ:١.بزانێ کەی من ئیحتیاجم هەیە بە شت. ٢.بزانێ لە کوێ ئیحتیاجم هەیە. ٣.بزانێ بە چەنێ ئیحتیاجم هەیە. ٤.بە نافەرمانی من لەگەڵ ئەودا جیرەکەم نەبڕێ. ئەو کەسە تەنیا خوایە تەوەککول ئەوە بووە کە باڵوول بوویەتی.

ئێمەیش تەوەککول بەسین بە خودا دەست بەردار ببین لە گشت ماسیوا
خوامان بەسە بیکەین بە وەکیل بو هەموو کارێ ئەبێ بە کەفیل

* * *

«١٥»

## کار کردن بۆ خوا

پیاوێ لە غارێکدا خەریکی عیبادەت بوو عەلاقەی لەگەڵ خەڵکا قەتع کردبوو، هاتووچۆی بۆ هیچ جێیەک نەئەکرد. تا بیستی کە دارێ لە جێیێکدا هەیە کە وەکوو «بت» عیبادەتی بۆ ئەکەن. غیرەتی دینی زۆری بۆ هانی هاتەدەرۆ لە غارەکەی و تەورێکی نا بە شانێو بڕوا دارەکە ببڕێ شەیتان زۆری پێ ناخۆش بوو چووە سەر ڕێگەکەی و وتی: تۆ چیت داوە لە بڕین ئەو دارە و چ زەرەرێکی داوە لە تۆ کە ئەیبڕی؟ وتی: بوونی ئەم دارە زەرەری زۆری بۆ من و هەموو موسوڵمانان هەیە، حەتمەن ئەیبڕم. شەیتان زۆر پاڕاوە کەڵکی نەبوو وتی: کەوابێ بە زۆر نایەڵم بی‌بڕی. هەڵچوون لە یەک، سێ جار شەیتانی دا بە عەرزا دوایی شەیتان وتی: وازبێنە لەم دارە هەموو بەیانیێ چوار لیرە ئەنێمە ژێر بەرماڵەکەت. عابد بە پارەکە فریبی خوارد و تەورەکەی ناوۆ بە شانێو ڕۆییێو بۆ غارەکە تا چوار ڕۆژ شەیتان هەموو بەیانیێ چوار لیرەکەی ئەخستە ژێر بەرماڵەکەی. ئیتر قەتعی کرد چوار ڕۆژ دوای بڕینی تەورەکەی ناوۆ بە شانێو و ڕێکەوت بۆ بڕینی دارەکە دووبارە شەیتان هاتە بەر ڕێگەکەی و وتی: بۆ کوێ ئەڕۆی؟ وتی: ئەڕۆم دارەکە

ئەبرم زۆر پاڕاوە کەڵکی نەبوو ئاخری شەیتان وتی بە زۆر نایەڵم بیبڕی. لە یەک هەڵچوون و سێ جار شەیتان دای بە عەرزا و بە زۆر نەیهێشت دارەکە ببڕێت و بەردەوام عیبادەتی بۆ ئەکرا عابیدەکە وتی: بە شەیتان جێی سەرسوڕمانە ئەوەڵڕا من سێ جار تۆم دا بە عەرزا کەچی ئەم جارە تۆ سێ جار منت دا بە عەرزا! ئەویش وتی: تۆ ئەوەڵ جار بۆ خوات ئەکرد سێ جار منت دا بە عەرزا ئەمجارە بۆ لیرەکانی منت ئەکرد دەرەقەتم نەهاتی. شەیتان لە عومریا ئەم راسیە وتووە.

هەرکارێ ئەکەی با بۆ خودا بێ　　　دوور لە تەماع و عوجب و ریا بێ

خوا کۆمەکتە مەترسە لە کەس　　　هەروا تۆ بڕۆ تا ئاخر نەفەس

❊ ❊ ❊

«١٦»

## عەداڵەتی عومەر

حەزرەتی عومەرﷺ نموونەی عەداڵەت بووە. لە غەزایێکا کە دەسکەوتی لە بەینی ئەسحابەکانا بەش ئەکرد پێیان ئەوت غەنیمەت. بەشی عەبدوڵلای کوڕی کەمتر لەوان دانا پرسیاریان لێ کرد بۆچی وا ئەکەی؟ فەرمووی: با لە قیامەتا خەجاڵەت نەبم. وە هەروەها عادەتی وابوو بە شەو ئەگەڕا بە شاری مەدینەدا بزانێ وەزعی شار چۆنە کێ لێی قوماوە و کێ رازییە لەو و کێ نارازییە، تووشی ماڵێ فەقیر بوو پیرەژنێکی تیا بوو زۆر فەقیر بوو لێی پرسی حاڵت چۆنە وتی: وام لە ئەو پەڕ فەقیری و داماوییا وتی: بۆچی ناچی بۆلای عومەر کە ئەڵێن عادڵە بەشی خۆت بێنی؟ وتی: لەوە ناچێ عادڵ بێ بۆیە حاڵ من نازانێ. حەزرەتی عومەر لە شەوی داهاتوودا کۆڵێ زەخیرە و خۆراکی بە شانی خۆی بۆ برد و پیاوێکیشی لەگەڵ خۆیا برد و وتی: لە تەرەفی عومەرۆ ئەممە بۆ هانیوی. زۆری پێ خۆش بوو وتی: حەز ئەکەم رەزایەت نامەیێ بۆ عومەر بنووسی. وە هەموو مانگێ بێ لە «بیت المال» بەشی خۆت بەە. بۆی نووسی و پەنجەمۆری کردوو حەزرەتی عومەر فەرمووی: ئەم رەزایەتنامە خەنە تۆی کفنەکەم با خەجاڵەت لای خوا نەبم لە بارەی ئەو پیرەژنۆ.

❊ ❊ ❊

«١٧»

## کاری بەجێ

یەکێ‌تر لە عەدالەتی حەزرەتی عومەرﷺ و دڵ داری خەڵک ئەمە بوو ڕێبوارێ چووە خزمەتی وتی: ڕێبوارم و وشترێکم هاپێ لەبەر زەخماری پشتی و رانی پەکی کەوتووە و زەکاتم پێ‌ئەشێ لە وشتری زەکات وشترێکم بدەنێ پێی بڕۆمۆ بۆ ماڵۆ. باوەڕی پێ‌نەکرد و وشتری نەدایێ، ڕێبوارەکە ڕۆیی، یەکێکی خستە شوێنی بزانێ ئەڵێ چی. گوێی لێ‌گرت بەدەم ڕێوە سێ نیوە شێعری عەرەبی ئەخوێنێتۆ کە ئەمە مەعناکەیەتی: سوێنی خوارد باوکی حەفسە کە عومەرە کە ئەو وشترە نە پشتی زەخم بووە نە لاڕانی، خوا لە عومەر خۆش بە ئەگەر ئەم سوێنیە کەوتبێ (حەزرەتی حەفسە کچی حەزرەتی عومەر بووە و حەرەمی حەزرەتی پێغەمبەر سەلامی خوایان لەسەر) ئەو کەسە کە بە شوێن ڕێبوارەکەوە بوو، هات و وتی: ڕێبوارەکە بە دەم ڕێوە ئەمانیە ئەخۆندۆ، ناردی بە شوێنیا و مەعزەرەت خوازی لێ‌کرد و وشترێکی پێ‌دا و بە ڕەزامەندی ڕەوانەی کرد.

❋ ❋ ❋

«١٨»

## ئەگەر ئەتەوێ باش بی ئەمانەتدار و ڕاست بە

موریدێ ڕۆییە خزمەت مورشیدەکەی گلەیی لێ‌کرد کە من زۆر خەریکی بەڕێوە بردنی دەستووراتی تۆم بۆچی هیچم لێ‌حاڵی نابێ؟ ئەویش وتی: سنۆقێکت پێ‌ئەدەم لەسەر ئەم بەحرۆ ببیە بۆ فلانکەس بە شەرتی ئەوە کە سەری سنۆقەکە نەکەیتۆ تا ئەیدەیتە دەستی و دۆعایێکیشی نیشان دا و پێی وت: بی‌خوێنە و ئاو بەحرەکە دات نادا و بێخەم بە سەر بەحرەکەدا بڕۆ، بوو بە وتوویرەی دڵی کە ئەم سنۆقە چی تیا بێ! خۆی نەگرت و سنۆقەکەی هەڵچڕی دوو مشکی لێ‌دەر پەڕی و نەیتوانی بیانگرێتۆ. بە خاڵی هەڵی‌گرت و ڕۆیی تا گەییە خزمەت ئەو فلانەکەسە وتی: من لە تەرەف فلانکەسۆ هاتووم بۆ خزمەت تۆ ئەم سنوقەی ناردووەتە خزمەت تۆ. وتی: بەخێر بێی ئەو سنۆقە دوو مشکی تیا بوو بۆ تەجرەبەی تۆ دابوویە دەست، بزانێ ئەتوانی ئەمانەت بەڕێوە بەی. لە تەجرەبە دەرنەهاتی و

نەتتوانی دوو مشک بێخەیانەت گەیێنیتە بەرۆ، چۆن بە کار ئەوە دێی کە ئەسراری خوا و تەریقەت بدرێتە دەستی تۆ. هاتۆ بۆلای مورشیدەکەی ئەویش هەروای پێوت.

❋ ❋ ❋

«۱۹»

## پیرشالیار کێیە؟

کورتەیێ لە نووسینی ئاغەگەورەم جەنابی مەلا «عبدالله»ی مەردۆخی مودەڕڕیس و ئیمام جومعە و جەماعەتی هەورامانی تەخت لە بارەی پیرشالیار و زەماوەنەکەیۆ. پیرشالیار ناوی موستەفایە،کوڕی سەیید مەعرووفە کە بە پانزە پشت ئەچێتۆ سەر ئیمام جەعفەری سادق «خوایان لێ‌رازی بێ» ئەم گەورە پیاوە و سەیید «عبیدالله»ی کۆسەی هەجیج و سەیید ئیسماعیل موحەددیس لە ئەسپەرێز و سەیید ئیسحاق لە ناحیەی دواوی پاوە، برای ئیمام رەزای مەشهەد بوون و هاجەرە خاتوون لە سنە خوشکیانە. هەموویان لە کوردستانا جێ‌گیر بوون و سەیید موستەفا خۆی و باوک و باپیری و مامەی سەیید موحەممەد یۆسف لە هەورامان تەختا ماونەتۆ بۆ خزمەت بە دینی ئیسلام و موسوڵمانان.

وەکوو لەم کتێبانا بۆمان دەرئەکەوێ وەک: «بەحرالانساب» سید «عبدالصمد» تواری و مەشاهیری کورد بابەشێخ رۆحانی کوردستانی و بنەماڵەی زانیارانی مامۆستا مەلا عبدالکریم مودەڕڕیس دەماودەمیش هەروا بیسراوە کە: ئەم پیاوە گەورە هەر لە منالیا دایک و باوکی لەدەس داوە و لە ژێر چاودێری مامەیا سەیید موحەممەد یۆسف بەخێو بووە. دوای خوێندنی قورئان و خۆندنی کتێبە وردەکان بە کوردستانا بۆ خۆندن گەڕاوە و دوای تەواو کردنی خۆندن رۆییوە بۆ بەغدا. لە ژێر چاودێری حەزرەتی غەوسی گەیلانیدا کەسبی تەریقەتی کردووە. دوای ماوەیێ زۆر، بە ئیجازەی ئەوۆ گەڕاوەتۆ بۆ هەورامان بۆ ئیرشادی موسوڵمانان. وە تا ئاخری عومری کۆششی زۆری بۆ نەشری شەریعەت و تەریقەت کردووە بە جۆرێ کە مەشهوورە نزیکەی یەک‌سەد نەفەر لە موریدەکانی گەییون بە درەجەی کەماڵی ئیرشاد. پیرشالیار خۆی زەردەشت و زەردەشتی نەبووە وەلێ

نەفەرێ زەردەشتی بە ناو شالیارە سیاوە هاتووەتە خزمەتی و خۆی باش تەسلیمی کردووە و ماوە تا بووە بە یەکێ لە پیرانی هەورامان کە لە غەربی دێی هەورامانی تەختا لە قەبرسانێکا بە ناو ئەوۆ ناو نراوە دەفن کردووە.

هەورامان تەخت لە باری جوغرافیاییۆ لە مەنتیقەیەکی حەساس و لە هاوسێتی عیراقۆ هەڵکەوتووە لە تەرەفی باکوورەوە(جنوب). مەرکەزە بۆ هەورامان ژاوەرۆ و شامیان و لە توولی تاریخا ولاتێکی قایم بووە و لە دەستدرێژی دوژمن پارێزراو بووە و قەلایەکی شکست نەخواردوو بووە. ئێستەیش ئاساری قەلای هەورامان دیوارێ مەحکەمی ماوە بە پاوە. لە بارەی مەزهەبۆ دانیشتووانی هەورامان هەر لە هەوەڵی دینی ئیسلامۆ لە قەرنی هەوەڵۆ بە گیان و دڵ دینی حەنیفی ئیسلامیان قبوڵ کردووە و بە رێیانۆ بردووە. هاتن ئەو پیاوە گەورانە بۆ هەورامان بووە بە پشتیوانەیێ گەورە بۆ زۆرتر ئاشنایی ئەوان لەگەڵ ئوسووڵ و فرووع و دەستووراتی دینی ئیسلاما. تا ئێستە دین و رسوومات و ئادابی موسوڵمانانەی هەورامان کەمتر کەوتووەتە بەر هێرشی فەرەنگی خارجی شەرقی و غەربی.

لەبەر ئەمنیەت تەبیعەتی هەورامان بووە کە ئەو ئیمامزادانە دوای هیجرەت لەم هەورامانا حەساونەتەوە و بوون بە چرای رۆشن. خەڵکی ئەم ولاتە جەزایان داونەتۆ کە رێز و ئیحتیرامیان لێ گرتوون بە زۆری موسوڵمانان حەقشناسی هەورامان لەبەر ئەو خزمەتە گەورە کە سەیید موستەفای پیرشالیار بەوان و باپیرانی ئەوانی کردووە لە حودوودی ٩٥٠ ساڵ لەمەوپێش تا ئێستە هەموو ساڵێ چیرۆکی جەژنی زەماوەنی پیرشالیار گیریاوە لە چەند مەرحەلەیێکا: ١.لە ١٥ی رێبەندانندا هەموو ساڵێ بە شێوازێکی تایبەتی بە حەیوان سەربڕین و بەش کردنی گۆشتەکەی لە بەینی خەڵکا. ٢.شەوی جومعەی ئەو حەوتە مەجلیسی دانیشتنی زیکر و تەهلیلە ئەگرن لەماڵی دانیشتنی تایبەتی ئەو پیاوە گەورەدا کە لە دێی هەورامانی تەختا بە ناوی شەوی «نشست» یانێ شەوی زیندەداری. ٣.حەفتەی دوایی ئەڕۆن بۆ زیارەتی قەبری منالەکانی پیرشالیار لە قەبرستانێ کە وا لە جنووبی هەورامان تەختا کە پیر شالیاریش لەوێ نێژراوە بە زیکر و تەلیلە. وە بە فری سەری قەبرەکە ئەماڵن. بە تەجرەبە دوای ئەوە هەوا خۆش ئەکا. ئەمیشە پێی ئەڵێن توربەت روبی. ٤.لە نیوەی مانگی گولاندا هەموو ساڵێ ئەڕۆن بۆ زیارەتی پیرشالیار و مەجلیسی زیکر و تەلیلە

ئەگرن و خواردن ئەبەن بۆ ئەو میوانانە کە وان لەوێ و ئەیدەنە دەرخوادیان و ناوی ڕۆژی کوسانیە (کۆمسا) ڕۆژی بەرد شکاندن. ئەو بەردە هەموو ساڵێ زیاد ئەکا و لەو کاتا ئەیشکێنن. کەڕامەت ئەم پیاوە گەورە ئەوەیە کە ئەم مەراسیمانە نەفەوتاون هەر بەڕێوە ئەبرێن. ئەمە کورتە باسێک بوو لەم بارەوە. ئەگەر تەواو بینووسین کتێبێ تەواوی ئەوێ.

## ژن هێنان و زەماوەن پیرشالیار

وەختێ لەتەرەف قوتبی تەریقەت کە حەزرەتی غەوسە خوا پاداشی خێریان باتۆ ئیزنی ئیرشاد بە پیرشالیار ئەدرێ و یێتۆ بۆ هەورامان زۆر بە باشی خەریکی خزمەتی شەریعەت و تەریقەت ئەبێ بە جۆرێ کە شۆرەتی بە هەموو لایێکا بلاو ئەبێتەوە، کچی حاکمی خەلخال تابیعی ئازەربایجان شەرقی دوچاری زوان بەسیاوی ئەبێ کە ناتوانی نقە بکا. دوکتور ئەو ڕۆژە ناتوانن عەلاجی بکەن بە ناچاری کە باوکی ناوی چاکە و عیبادەت و تەقوای پیرشالیاری بیستووە بە خالیدی خالۆی کچەکە ئەلێ ئەم کچە «شەهبارە خاتوون» لەگەڵ خۆت ببە بۆ خزمەت ئەو پیاوە گەورە بەشکوو بە بەرەکەت و دۆعای ئەو چاک بێتۆ. ئەگەر بە دۆعای ئەوان خوا شفای بۆ نارد لە وەکیلی منۆ بۆی مارە بکە. تا ئەو وەختە ژنی نەهانیوە کە تەرکی دونیای کردبوو. دوای ئەوە خالۆ خالید لەگەڵ شەهبارە خاتوون و چەن نەفەرێکا ئەڕۆن. بێ دەنگ ئەبێ تا ئەگەنە ۲۰۰ میتری ناو دێی «بلبەر» کە چەند کیلومیتری ئەمێنێ بۆ هەورامان تەخت لە ڕۆژهەلاتی هەورامانەوە. لەو نزیکی بلبەرا لە سێبەر بەردێکا دائەنیشن بۆ ئیسراحەت لە کوتووپڕا کچەکە یێتە قسە و بە خۆشیۆ ئەلێ خەریکم خۆش ئەبمەوە لێی ئەپرسن کە نەخۆشی و گرفتاری تۆ چی بوو چۆن خۆشەوە بووی؟ لە جوابا ئەلێ دوو جنۆکە دەوری منیان دابوو ئەیانوت قسە بکەی زوانت ئەبڕین ئێستە یەکێ لەوانە ڕای کرد و بە زوانی ئەوشوێنە ئیسە بەو جێگە ئەڵێن «تەوەنە و سروی» یانێ بەردێ کە لە پاڵ ئەوا ئەو کچە چاک بووەتۆ. دوای ئەوە ئەکەونە ڕێ بۆ هەورامان کە ئەگەیێنە ڕوو بە ڕووی هەورامان لەلای شەرقۆ کچەکە خۆشحاڵی دەرئەبڕێ کە نەفەری دووهەم ئاوری گرتوو ڕای کرد بۆ ئەو شیوە، منیش تەواو خۆشۆ بووم. ئەوشوێنە ئیستە بە زوانی ئەوشوێنە پێی ئەڵێن «تەنوورە و دێوا».

دوای ئەوە هاتنە ناو دێ ئەبن بە میوان پیرشالیار، دوای چەن رۆژێ لێیان ئەپرسێ بۆچی هاتوون وکارتان چیە؟ حاڵ و ئەحواڵ خۆیان ئەگێڕنۆ پیرشالیار ئەفەرمێ شوکر بۆ خوای گەورە کەن کە خۆشۆ بووە و بڕۆنۆ بۆ ماڵ خۆتان. خالـۆ خالید ئەڵێ ئەم کچە تەواو دوکتۆر لە عەلاجی ناتەوان بوون ئیستە کە خوا بە بەرەکەت دۆعای تۆ شفای بۆ ناردووە بە وەسیەت باوکی حازرین لێرە بمێنینۆ و بە وەکالەت باوکی ئەم کچیە بۆت مارە ئەکەم. پیرشالیار ئەفەرمێ: خودا شیفای بۆ ناردووە من هیچ دەخالەتێکم نەبوە، وەکوو ها لەبەر چاوتانا خواردنی ئێمە زۆر سادەیە نانمان زەڕاتە و پێخۆرمان گیای ئەو هەردەیە، ئەم کچە هیچ وەخت ناتوانێ لەگەڵ منا ژیان بەسەر بەرێ، بە سەلامەت برۆنۆ بۆ ماڵ خۆتان، کچەکە ئەڵێ من لە زوۆ تووشی ئەم نەخۆشی و بەڵایە بووم و خوا لە هەموو لایێ حازرە لە ولاتی خۆمان شیفای بۆ نەناردم! ئەزانم کە تۆ پیاوی سالح و بە عیبادەتی و بە دۆعای خێری تۆ شیفای بۆ ناردووم. حازرم دەس لە زەرق و بەرقی دونیا هەڵگرم و لەگەڵ تۆدا ژیان بەرمە سەر. ئیتر خالۆ خالید بە وەکالەت باوکی، «شەهبارە خاتوون» مارە ئەکا بۆ پیرشالیار و خۆیشی لای خوشکە زاکەی ئەمێنیتەوە لە ژێر چاودێری پیرشالیارا خەریکی تاعەت و عیبادەت ئەبێ تا ئەبێ بە یەکێ لە ۹۹ پیرەکانی هەورامان. وە ئێستە مەرقەدی وا لە شەرقی هەورامان و بەسەر کێوێ بەرزۆ لە بەرابەر دێی «سەرپیر». وە تایفەی داود خالە کە عەشرەتێ زۆرن لە هەورامان تەختا لە نەتەوەی ئەون. دوای ئەو مارە کردنە کە پیرشالیار ماڵ و و دارایی نەبوە و حەزی نەئەکرد بیبێ، نەوەک ببێ بە هۆی دڵ پەرێشانی ئەهلی ئاوایی، کەوتنە رێ خستنی هۆی زەماوەن بە پێک هانینی خۆراکی ئەو رۆژە هەر یەک لە ماڵی خۆیۆ.

دوای فەوتی ئەو پیاوە بەرزە کە ۹۵۰ ساڵە تا ئێستە هەموو ساڵێ بەڕێوە براوە وەکوو لەوە پێش نووسیمان. مەلا عبداللە مردۆخی۱۳۸۰/۱۱/۱۶ شمسی.

***

«۲۰»

## نووسەرانی قورئان

کتێبی «خواص نماز»، دانراوی ئاغە و گەورەم «سیّد عبدالحمید حیرت سجّادی» لاپەرەی ۵۳ نووسەرانی قورئانی کەریم: پێغەمبەرﷺ چەن نەفەر نامە نووسی بووە کە قورئانیان بۆ نووسیوەتۆ. لە وەختی نازڵ بوونی کە بە ناوی نووسەری وەحی مەشهوور بوون. لە ناو ئەوانا ۱۲ نەفەریان لێرائەنوسین: ئەبووبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی و زوبەیر و خالید و سەوبان و عەلای حەزرەمی و ئوبەیی کوڕی کەعب و مەعازی کوڕی جەبەل و ئەبوودەڕدا و زەیدی ئەنساری خوایان لێ ڕازی بێ.

* * *

«۲۱»

## چۆن قورئان جەم کراوەتۆ

لە پاش فەوتی پێغەمبەرﷺ لە وڵاتی یەمامەدا نەفەرێ بە ناوی موسەیلەمەی کەززاب (فرە درۆزن) داوای پێغەمبەرایەتی کرد و دەستەیە زۆری گومراهـ کرد حەزرەتی ئەبوبەکر لەشکرێ دە هەزار نەفەری نارد بۆ سەریان و شەڕێ قورس لە بەینا رووی دا. موسوڵمانی زۆر شەهید کران لە ناو ئەوانا حەفتا نەفەریان قورئانیان لەبەر بوو. زەیدی کوڕی سابت ئەڵێ بۆ راسپاردەیی رۆییم بۆ خزمەتی حەزرەتی ئەبووبەکر، حەزرەتی عومەر لەوێ بوو وتی بە حەزرەتی ئەبوبەکر: لە شەڕی یەمامەدا زۆرتر لەوانە کە قورئانیان لەبەر بوو شەهید بوون. ئەترسم باقییەکانیش هەریەک لە جێیەکا شەهید ببن و قورئان بفەوتێ، من وا بە باش ئەزانم لە ئیسێوە دەس کەین بە کۆکردنەوەی قورئان. حەزرەت ئەبووبەکر فەرمووی: چۆن ئەبێ من کارێ بکەم کە پێغەمبەرﷺ نەیکردبێ. حەزرەتی عومەر سوێنی خوارد کە ئەمە کارێکی باشە ئەبێ بکرێ. حەزرەتی ئەبووبەکر فەرمووی: دوای ئەوە کە حەزرەتی عومەر دەسبەردار نەبوو، چەن کەڕەت ئەم مەبەسیە دوو قات کردۆ تا منیش خوا دڵمی لەسەر ئەم خەیاڵە دامەزران و لەگەڵ ئەوا هاو بیر بووم. زەیدی کوڕی سابت ئەڵێ حەزرەتی ئەبووبەکر دەستووری دا بە من کە تۆ گەنج و عاقڵ و بێفیز و

دەماری و لە زەمانی حەزرەتا هەرچی قورئان ئەهاتە خوارۆ ئـەتنوسـی ئێستەیـش بگەڕە بە شوێن قورئانا کۆی کەرۆ. زەید ئەفەرموێ: قەسـەم بـە خـوا گوێزانـەوەی کێوێ لە کێوەکان قورستر نەبوو بـە لای منـۆ لـەو کـارە کـە ئـەبووبـەکـر ئـەمری پێ‌کردم، قورئان کۆ کەمۆ کە نووسراوە لە پارچە کاغەز و لەتە بەرد و ناو کاسە و سینەی قورئان زانەکانا. وا گەڕام بە شوێن قورئانا کە لە سوورەی تەوبە ئایەی ﴿لَقَد جائَکم رَسُولٌ مِن اَنفُسِکُم...﴾ تا ئاخر سوورەت تەوبە تەنیـا لای ئـەبووخـوزەیمـەی ئەنساری پەیام کرد.

ئەو قورئانە کۆکراوۆەتا کاتی فەوتی ئەبووبەکـر لای ئـەو بـوو. دوای ئـەو لای حـەزرەتی عومەر بوو. دوای ئەو لای حەفـسەی کچـی حـەزرەتی عومـەر کـە حەرەمی پێغەمبەرﷺ بوو، تا رۆژێ حوزەیفەی یەمان هات بـۆ خزمـەت حـەزرەت عوسمانی کوڕی عەففان و وتی: فریای ئەم ئوممەتە بکەوە بەرلەوە لە کتێبێ خوادا ئیختیلاف و جیاوازییان ببێ وەکوو یەهوود و نەسارا لە کتێبەکانیانا ئیختیلافیان پەیـا کرد. دوای ئەوە حەزرەتی عوسمان راسپاردەیەکی نارد بۆلای حـەزرەتی حـەفـسە کە ئەو قورئانە کۆکراوە بنێرە بۆم تا چەن نوسخەیێکی لێ بنووسمۆ و بـۆی بنێرمـۆ حەزرەتی حەفسە بۆی نارد و حەزرەتی عوسمان چوار نەفەری کرد بە مەئموور بـۆ نوسخە نووسینەوە لەو قورئانە. زەیدی کوڕی سابت و «عبدالله»ی کوڕی زوبەیـر و سەعیدی کوڕی عاس و «عبـدالرحمن»ی کـوڕی حارسـی کـوڕی هیشام، تـا لـەو قورئانە چەن نوسخەیێ بنووسن. وە ئەگەر ئیختیلافێ لە بەینا بوو بە زوانی قورەیش بینووسن. چوون قورئان بە لەهجەی ئەوان هاتووەتە خوار. (ریوایەتـەکـەی سـەججادی تەواو بوو).

وەکوو بۆمان مەعلوومە ئەو نەفەرانە قورئانیان ئەنووسییۆ شەش نوسـخەیـان نووسی و بەم جۆرە بلاویان کردۆ و هەریەکێ لـە یـەکـێ لـەم شـارانا دایانـنا: لـە مەدینەی مونەووەرە و مەککەی موعەززەمە و شام و کووفە و بـەحـرەیـن و میـسر. قورئانی ئێستە لەگەڵ ئەوانا هیچ فەرقـی نیـە. حـەزرەتی وەحـشی کـە یـەکێـک لـە ئەسحاب بوو موسەیلەمەی کوشت و هۆردووەکەی شکا و لەبەین چوون.

❊ ❊ ❊

«۲۲»

## خوا مەیلی نەبێ بە زۆرداری نابێ

حاکمێ زۆر زۆردار و دەوڵەمەند بوو، کە بە سەروەتی خۆی و کۆمەکی رەعیەتەکەی قەسرێکی زۆرچاکی دروس کرد، بە چەن ساڵێ کە تەواو بوو. دوایی هات کە بچنە ناوی دەعوەتێکی عەجایەبی ساز کرد لە هەموو لایەکەوە خەڵکێ زۆری دەعوەت کرد. خوا ئارەزووی کرد کە خۆی لەو دەعوەتە نەخوات حەزرەتی «عیزرائیل»ی کردە مەئمووری گیانکێشانی و لە سوورەتی دەروێشێ کەشکۆڵ لە شان رۆیی بۆ ماڵەکەی، لە وەختی سفرە داخستنا «تق الباب»ی کرد، رۆیین بە دەمیۆ وتیان چیت ئەوێ؟ وتی: ساحێب ماڵم ئەوێ. رۆین بۆلای حاکم. وتیان: دەروێشێ بەو جۆرە هاتووە ئەڵێ حاکمم ئەوێ. حاکم وتی: ئاخۆ چی ئەوێ برۆن بیدەنێ. هاتن بۆلای وتیان: چیت ئەوێ تا پێتی بدەین؟ وتی: هەر حاکمم ئەوێ بێ بۆلام. حاکم بە توورەییەوە وتی: چەنێ بێ شەرمە من چۆن ئەرۆم بۆلای ئەو. دەروێشەکە «تق‌الباب»ی کرد تەواوی ماڵەکە زیرانی وەخت‌بوو هەموویان لە ترسا زیرە بکەن. وتی: من عیزرائیلم بۆ گیان کێشانی ئەو هاتووم ئیتر مۆڵەتی نەدا تا نانەکەی بخوا گیانی کێشا و مرد.

* * *

«۲۳»

## ریگای بەهەشت

حاکمێ‌تر بە دڵ و بە گیان بە نەقشەی موهەندیسی ئەو زەمانە بە پرس و رای پیاو عاقڵەکانی قەسرێ عالی دروس کرد. ئەونە بەبێ عەیبی ئەزانی لەسەر درگاکەی نووسی کەسێ ئیرادی لەم ماڵە دۆزییەوە ئەوەندەی خەڵات ئەکەم. تا پیاوێکی خوا رێی کەوتە ئەوێ و وتی: من دوو عەیبی تیا ئەبینم، رۆیین بۆلای حاکم وتیان یەکێ پەیا بووە و ئەڵێ ئەم ماڵە دوو عەیبی واتیا. حاکم وتی: برۆن بیهێنن. کە هات وتی: عەیبی ئەوەیە کە ئەم ماڵە ئەرووخێ و ساحێبەکەی ئەمرێ. وتی: ماڵێ شک ئەبەی نەرووخێ و ساحێبەکەی نەمرێ؟ رێبوارەکە وتی: بەڵێ

بەهەشت ناڕووخێ و ساحێبەکەی نامرێ. وتی: ڕێگەی ئەو بەهەشتەم پێ‌نیشان بە. وتی: ئیمان و عەمەڵی ساڵح. حاکم ئیتر تا مابوو ئەورێگەیە گرتەبەر.

بەهەشت واله ژێر پێی دایک و باوکا — کەسێ کە ژێرە خۆی هەڵە ناکا

دڵیان تا ماوە ئەبات بە ڕێوە — ئەڕوا بۆ بەهەشت هەروا لە ڕێوە

❊ ❊ ❊

«٢٤»

## بوختان و بەخێلی

ئیمامی غەزالی خوای لێ‌رازی بێ کتێبی «احیاء علوم الدین»ی دانا بۆ زیندوو کردنەوەی عیلمەکانی دین. عالمێ ڕەقیبی بوو دەسی کرد بە تەبلیغاتی خراپ بۆ لابردنی کتێبی «احیاء علوم الدین». حاکمی ئەو وەختەی کرد بە هاودەس خۆی و دەسیان کرد بە کۆکردنەوەی ئیحیا کە بی‌سوتێنن. ئەو شەوە قەرار بوو بەیانی بیسوتێنن ئەو عالمە لە خەویا بە خزمەتی پێغەمبەرﷺ گەیی، خولەفای ڕاشیدین و جەماعەتێ لە خزمەتیا بوون. کوتووپڕ حەزرەتی غەزالی پەیا بوو «احیاء علوم الدین» لە بن دەسیا بوو عەرزی حەزرەتی کرد: من شکاتم هەیە لەم مەلا کە بوختانی بۆ من کردووە. فەرمووی: بیخەن دار حەددی لێ‌بدەن خستیان و پێنج شەلاقیان لێ‌دا زیرەی ئەگەییە عەرشی ئەعلا. ئیمامی غەزالی تکای بۆ کرد ئیتر بەسیەتی. دەسیان سرەوان کە خەبەری بووەوە هەر ئێشی هەیە تا پێنج ساڵی‌تر هەروا بوو، تا بە خزمەتی پێغەمبەر و حەزرەتی ئیمامی غەزالی گەیی بە تکای حەزرەتی غەزالی پێغەمبەرﷺ دەسی هێنا بە پشتیا ئیتر ژانەکەی سرەوت. بۆیە حەدیسێ ئەفەرمێ: هەرکەس بوختان بکا دار حەددی لێ‌نەدرێ لە دونیا دا، لە قیامەتا لەبەر چاو ئەو هەموو عالەما دار حەددی لێ ئەدەن.

بوختان چی مەبە لە بۆ بێ‌تاوان — خۆت مەکە بە تووش مەینەت و تاوان

لێت ئەدەن دار حەدد لە ڕۆژی جەزا — گــرفتار ئەبی بە ئەنواع سزا

❊ ❊ ❊

«۲٦»

## پیاوی چاک ئاوایە

لە باسی زیارەت و دۆعای پیاو ساڵحانا ئەگێڕنۆ کە حەزرەتی عومەر هەروەختێ لە تەرەف «یمن»ۆ پیاوان ئەهاتن بۆ کۆمەک بە موسوڵمانان ئەیپرسی لێیان «ئووەیس»ی کوڕی عامیرتان واتیا. بۆی پەیا نەبو تا دەسەیێ هاتن ئووەیسیان تیا بوو. پێی وت تۆ ئووەیسی کوڕی عامیری؟ وتی: بەڵێ. فەرمووی: لە تایفەی موراد و لە قەرەنۆ هاتووی؟ وتی: بەڵێ. وتی هەموو گیانت نەخۆشی بەڵەکی پێوە بووە و خۆشۆ بووە غەیری جێگەی تاقە قەرانیە نەبێ؟ وتی: بەڵێ. وتی: دایکت ماوە؟ وتی: بەڵێ. عومەرﷺ فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیستووە فەرمووی: چەن نەفەرێ لە یەمەنۆ یێن بۆ کۆمەکی موسوڵمانان ئووەیسی عامیرییان وا لەگەڵا کە لە تایفەی بەنی مورادە لە قەرەنەوە دێن ناو نیشانی ئەوەیە کە نەخۆشی بەڵەکی پێوەیە و هەموو لەشی خۆشۆ بووە جێگەی قەرانیەکی نەبێ و دایکی هەیە کە زۆر باش دڵی ئەبا بەڕێوە و داوای هەرچی ئەکا لە خوا قبووڵی ئەکا. عومەر ئەگەر توانیت داوای دۆعای خێری لێبکە بۆ ئەوە کە خوا لێت خۆش بێ. عومەر وتی: ئووەیس گیان دەی دۆعام بۆ بکە بەشکوو خوا لێم خۆش ببێ: ئەویش دۆعای بۆ کرد. عومەر وتی: ئووەیس بۆ کوێ ئەڕۆی؟ وتی: بۆ «کووفە». عومەر وتی: با بۆت بنووسم بۆ کاربەدەسەکان بە قەی کیفایەت شتت بەنێ. ئووەیس وتی: هەر حەزەکەم لەگەڵ فەقیرانی ئەوێدا لە ناو خاک و خۆڵا بم. کە ساڵی داهاتوو هاتە پێشۆ یەکێ لە پیاو ماقووڵانی کووفە هات بۆ حەج. حەزرەتی عومەر خەبەری ئووەیسی پرسی. وتی: من لە ماڵۆ هاتم کەم دەس و رەش و رووت بوو لە حاڵ و ماڵا. عومەر وتی: بیستوومە لە پێغەمبەرﷺ ئەیفەرموو: ئووەیسی کوڕی عامری یێ بۆ لاتان لە یەمەنۆ لە تایفەی مورادە و لە قەرەن هەموو لەشی بەڵەکی بووە و خۆشۆ بووە جێگەی تاقە قەرانێکی نەبێ، دایکی ماوە و زۆر چاکە لەگەڵ دایکیا داوای هەرچی لە خوا بکا ئەیداتێ ئەگەر توانیت داوای دۆعای خێری لێ بکەی بیکە کە هاتۆ بۆلای ئووەیس و داوای دۆعای خێری کرد و دۆعای بۆ کرد ئووەیسﷺ وتی: وادیارە تازە لە سەفەری حەج هاتبیتۆ تۆیش دۆعای خێر و لێبوردن بکە بۆ

ئێمە. ئوەیس وتی: چاوت بە عومەر کەوت؟. وتی: بەڵێ. ئوەیس دۆعای خێری بۆ عومەریش کرد کە زانی خەڵک پێیان زانیوە لەوێ نەما.

* * *

«۲٦»

جەماعەتێ لە کووفەوە بە تایبەت یێن بۆ خزمەت حەزرەت عومەر یەکێکیان تیا ئەبێ لەوانە کە گەمەیان بە حەزرەت ئوەیس ئەکرد پرسی کەسێ لە قەرەنتان واتیا؟ ئەو پیاوە هاتە پێشەوە. جا حەزرەتی عومەرﷺ وتی: لە پێغەمبەرم بیستووە کە فەرموویەتی: ئوەیسی کوڕی عامری یێ بۆ لاتان لە یەمەنۆ لە تایفەی مورادە و لە قەرەن هەموو لەشی بەڵەکی بووە و خۆشۆ بووە جێگەی تاقەرانێکی نەبێ دایکی ماوە و زۆر چاکە لەگەڵ دایکیا داوای هەرچی لە خوا بکا ئەیداتێ ئەگەر توانیت داوای دۆعای خێری لێ بکەی بیکە.

* * *

«۲۷»

**باشترینی تابیعین**

دووبارە حەزرەتی عومەرﷺ لە بارەی ئوەیسۆﷺ فەرموویەتی کە لە پێغەمبەرم بیستووە باشترینی تابیعینی کەسێکە پێی ئەڵێن ئوەیس کە دایکێکی بووە زۆرچاک بووە لەگەڵیا و نەخۆشی بەڵەکی پێوە بوو. لێی پاڕێنۆ دۆعای خێرتان بۆ بکا با خوا عەفووتان کات. لە بەر ئەوەکە لە کتێبەکەدا ئوەیسی نووسیوە منیش ئوەیسم نووسی ئەگەرنا ئێمە بە کوردی و کورتی ئەکەینۆ و ئەڵێین «وەیس»ﷺ. حەزرەتی وەیس بە ئیجازەی دایکی رۆییوە بۆ مەدینە بۆ خزمەت حەزرەت لە ماڵا نەبووە بە خزمەتی بگاتو بێ بە ئەسحاب. لەبەر ئەوە کە دایکی ئەمرێ پێ کردووە شەو ئەمێنێتۆ. کە بەخزمەت ئەسحاب گەییوە بووە بە تابعین. خوا لە هەموویان رازی بێ.[1]

* * *

۱. تا ئێرە کە باسی حەزرەتی وەیسم کرد لە «ریاض الصالحین»دا دەرم هێناوە.

.....................................................................

«٢٨»

## وەیس لە کوێیە؟

٢٨- ئەڵێن لە وەختێکا حەزرەتی وەیس﷛ فەوتی کردووە چوار تایفە لە سەر جەنازەکەی شەڕیان بووە، کە هەر دەسەیێ بیبا بۆ ناو وڵاتی خۆی. دوای شەڕ و هەرایێ زۆر وتوویانە با ئێمە شەڕ نەکەین. چوار تابووت لە دەوری جەنازەکەی دانێین شەو خۆی چووە ناو هەرکامیان بیبەنوو بڕۆن. هەرکس کە بەیانی یێت تەماشا ئەکا چووەسە ناو تابووتەکەی. خوا دڵ کەسیان عاجز ناکا بە خۆشی هەموویان ئەڕۆنۆ. ئیسە عەینی ئەم وەیسی لای ئێمە کە وا لە نزیکی شاری ڕەوانسەر لە کرماشان، لە تورکیە و سووریە و قەڕەنا هەیە. خوای لێ ڕازی بێ. لە ئەسەمۆڵ لە مەنزڵی خوا لێخۆش بوو شێخ عوسمانی بیارەدا بووین عەکسی مەرقەدی وەیسی تیا بوو وتم: ئەمە عەکسی مەرقەدی وەیسی خۆمانە لە ئێران. وتیان: نەخەیر ئەمە عەکسی مەرقەدی وەیسە لە تورکیە. لە چوار جێگەدا وەیس مەرقەدی هەیە یەک لە ئێران، دوو لە تورکیە، سێ لە سووریە، چوار لە قەڕەن. وە زۆر کەس لە عولەمای شەرع و تەریقەت زیارەتیان کردووە و بەرەکەتیان لێ وەرگرتووە.

| | |
|---|---|
| بەنەزەر قودرەت خودا ئەم کارە | زۆر سووک و سەهل و سادە و ساکارە |
| تو فتۆکوپی بەرگێ کە ئەیکەی | لەگەڵ ئەسڵەکەی فەرقی پێ ناکەی |
| هەر بەرگێ لە دەفتەرێ دایئەنێی | بۆ ئیدارەیێ خوکمی پێ ئەکەی......... |

* * *

«٢٩»

## بێبەش نەکردنی دزیش!

لە گوڵستانی سەعدیدا «رحمه الله» هەیە ئەیگێڕێتۆ: شەوێ دزێ ڕۆیی بۆ ماڵ دەرویێشێ بۆ دزی هەرچی هەوڵی دا شتێکی بەر پەل نەکەوت. دەروێشەکە خەبەری بوویەوە تاقە بەڕیکی بوو لە سەریا خەوتبوو خستیە بەر پێی دزەکە تا بە نائومێدی نەچێتە دەرۆ.

| | |
|---|---|
| بڕوانە هیممەت ئەو پیاوە بەرزە | دوژمنی ڕەزا کروە بەو تەرزە |

............................................................

ئێمەیش وەهابین بۆ دۆس و دوژمن		با سەرمان بەرز بێ لای دۆس و دوژمن
دونیا هیچ ونیە هیچی نامێنـــێ		هەر پیاوەتیە بۆ خۆی ئەمێنـــێ

❊ ❊ ❊

«۳۰»

## بیارە و مەڵبەندی عیلم و تەریقەت

مامۆستا مەلا کەریم «رحمەالله» لە کتێبی «علماؤنا»دا نووسیویەتی: لە پێش شێخانی نەقشبەندی بیارەدا حەوسەد و پەنجا ساڵ بیارە جێگەی مەدرەسە و علوومی دینی بووە. بیست و پێنج پشت لەسەریەک مودەڕڕیس بیارە بوون لە مزگەوتی پشت خانەقادا. ئاخرینی ئەوان مەلا «عبدالله» ناوێ بووە کە فەوت ئەکا کوڕێکی ئەبێ بە ناو مەلا جەلال کە خۆنەوارییەکی وای نابێ، کەیخوا و ریش سپی دانیشتووی پرسەکە گەمەی پێ ئەکەن و ئەڵێن خەممان نیە مەلا جەلال لە جێگەی باوکیا دائەنیشێ و نایەڵێ فەقێکان باوکی پەردەوازە بین. ئەم قسە ئەبێ بە ئێشێکی زۆر لە دڵیا و دوای ئەو مەجلیسە ئەڕوا بۆ خوێندن تا ئەبێ بە مەلاییەکی زۆر چاک نایێتۆ. ئەونە مەلا خاسە ئەبێ مەولانا خالید لە خزمەتیا ئەخوێنێ. جا مامۆسا ئەڵێ: وەختێ مودەڕڕیس بیارە بووم ئەڕۆییم بۆ مزگەوتەکە حوجرەیێ دوانزە میتری بوو، پڕ بوو لە کتێبی پرتووکاوەی ئەو زەمانە، بە ترسۆ دەسم پیا ئەکرد کە نەکا مارێ، دووپشکێکی تیا بێ. تا وەختی ئیرشادی شێخی «ضیاءالدین» ئەو مزگەوتە جێی ئیرشادی شێخ «سراج الدین» و دوو کوڕی بووە، شێخ «بهاء الدین» و شێخ «ضیاءالدّین». دوای شێخ عومەر خانەقای بیارەی دروس کرد و ئیسەیش هەر ماوە، وەلێ گرۆیێ بە ناو «جند الاسلام» داگیریان کرد لە ساڵی ۱۴۲۲ ق و تائێستە کە ۱۴۲۳یە. جا بزانین خوای گەورە چییان پێ ئەکا.

هــەزار ســاڵ ئـەبـێ نـاودێی بیـارە		جێی فیکر و زیکری پیاوی هوشیارە
جێی فەقێ و مەلا و خوێندنی دینە		جێگەی خزمەتی شە رعـی موبیـــنە
جێگەی تەلیلە و خوێندن قورئـانــە		جێگەی تایـفەی شـێخی عـوسمانە

❊ ❊ ❊

«٣١»

## هیدایەت بە دەستی خوایە

رۆژێ ئیمام رەزای مەشهەد سەلامی لەسەر ئەڕوا بۆ بازاڕ کۆمەڵێ لە ئەولیا و عولەما و سەیید لە خزمەتیان ئەبن. لە کوتووپڕا تووشی پیاوێ رەش و ناشرینی زەڕەتاڵ و پرتووکاو ئەبێ. کە کوڕێ حەوت ساڵەی لەگەڵ ئەبێ لە ڕێوە لێی ئەپرسێ: نۆکەری ناکەی؟ ئەڵێ: بەڵێ، ئەو پیر و مناڵە لەگەڵ خۆی ئەباتۆ بۆ ماڵ و یەک نەفەر عالم و سەیید و سالح کە درگاوان ماڵەکەی ئەبێ لای ئەباو ئەو پیرە ئەنێتە جێگەکەی. تەواو کەسان و موریدەکانی لەم کارا سەراسیمە و حەیران و دڵ پێشاو ئەبن. لە پیرەکە ئەپرسن ناوت چیە؟ ئەڵێ: خۆم فەیرۆز کوڕەکەم فیرووزان. پرسیاری جێگە و مەزەبی لێ‌ئەکەن، ئەڵێ: ئەهلی کەرخم «کەرخ ناوی گەڕەکێکە لە بەغدا» مەزەبم ئاور پەرەستییە. زوانم فارسییە. هەموو موریدەکان کۆئەبنەوە مەشوەرەت ئەکەن و ئەڵێن ئیمام رەزا حاڵی ئەم پیرە نازانێ ئەگەرنا چۆن ناموسی خانەدانی نوبووەت ئەنێتە بەردەسی ئەم پیاوە مەجووسییە زوان نەزانە. دوای پرس و ڕایەکی زۆر ڕوو هەڵچراوێ ئەنێرن بۆ خزمەتی ئیمام حاڵی پیرەکەی عەرز ئەکەن کە بە کار ئەو جێگە نایێ. ئەفەرموێ: من لە کار و باری ناوماڵی خۆمانا ئیختیاری تەواوم هەیە، کەسێکم ناوێ موجگاریم بکا. دوای یەک حەفتە پیرەکە یێتە خزمەت ئیمام و ئەڵێ: نووری ئیمان لە دڵما ئەسەری داناوە، ڕێگەی ئیمان و ئیسلامم نیشان بدە با بە شانازیۆ بم بە موسوڵمان. ئیمام رەزا مەرج و ئەرکانی ئیسلامی فێر ئەکا و ئەفەرموێ: مناڵ لە ئیمانا تابیع باوکیە ئیسە کە تۆ موسوڵمان بووی کوڕەکەیشت حوکمی موسوڵمانی هەیە بیبەخشە بە من با دەرسی پێ بڵێم و بیکەم بە کوڕی خۆم. پیاوە پیرەکە گوێڕایەڵی ئەکا و کوڕەکەی ئەبا بۆ خزمەتی و ناوی ئەنێ مەعرووف و خۆی دەرسی شەریعەت و تەریقەتی پێ‌ئەڵێ. لە ماوەیەکی کەما ئەو مناڵە زەردەشتییە ئەبێ بە شێخ مەعرووفی کەرخی. کە مەولانای جامی لە «نفحات الانس»دا فەرموویەتی: چوار نەفەر لە ئەولیا بە ئیجماعی ئەولیا لە مردنا وەکوو زیندوویەتی تەسەڕووفی تەواویان هەیە: شێخ

مەعرووفی کەرخی، غەوسی گیلانی، شێخ عوقەیل مینەجی، بایەزیدی بوستامی «قدس الله ارواحهم».

ئەم بەسەرهاتە مودرریسی کوردستانی لە کتێبی «تعدیل درشریعت و طریقت» لە لاپەڕەی ٦٥ دا نووسیویەتی. شێخ مەعرووفی کەرخی کە موراد بووە وا بە ئاسانی پێگەییوە. وەکوو وتوویانە:

خوا ئەرحەز بکاعەبدیکیخۆیبکاخوشنوود ئەنێرێ بۆی لەرێگەی دوورەوە گەوهەری مەقسوود
وەکوو فیرووزان ئەبێ بە مەعرووف بە عیلمی شەرع و تەریقەت مەوسووف
خوا بمانخاتە ژێر سێبەر ئەوان با کەوینە بەر شەفاعەت ئەوان

* * *

«٣٢»

## تەماع چی نەکردا

حەزرەتی مووسا﷤ لەگەڵ پیاوێ بوون بە هاوڕێ بۆ تۆشە سێ کولێرەیان پێ بوو. دایە دەس هاوڕێکەی، کە برسییان بوو فەرمووی: با کولێرەکان بخۆین، یەکێ کولێرەیەکیان خوارد و ئەویان هاوڕێکەی هەڵی گرت و دوای ماوەیێ برسییان بوو فەرمووی: با کولێرەکەی‌تر بخۆین، وتی: نەماوە. فەرمووی: کێ خواردی وتی: نازانم. بەحرێ کەوتە بەریان بۆ ئەوەی دەورە نەدەن بە دەوریا دەسی هاوڕێکەی گرت و فەرمووی: بە ئیزنی خوا با بڕۆین بە سەریا کە ڕۆین ئاوەکە دای نەدان، فەرمووی: قەسەمت ئەدەم بەو خوا کە ئەم موعجیزەیە نیشانی تۆ دا کولێرەکە کێ خواردی؟ وتی: نازانم. کە گەیینە وشکی حەزرەتی مووسا﷤ سێ کۆگا خۆڵی کۆکردۆ و فەرمووی: ببن بە تەلا کە بوون بە تەلا فەرمووی: ئەمیانە بۆ من ئەویانە بۆ تۆ ئەمیشە بۆ ئەوکەسە کە کولێرە کەی خوارد. جا وتی: من خواردم. کە ئیقراری کرد فەرمووی: هەرسێ کۆگاکە بۆ تۆ من تۆم تاقی کردۆ لە کڵ دەرنەهاتی.

حەزرەتی مووسا ڕۆی و ئەم دانیشت بەلای تەلاکانۆ. سێ نەفەر هاتن بۆلای وتیان: ئەم سێ کۆگا تەلا هین تۆیە؟ وتی: بەڵێ. وتیان ئێمە کە بە شەریک خۆت. وتی: شتی وا ئیمکانی نیە. تەپیان دا سەری و کوشتیان. دوای ئەوە وتیان: با یەکێکمان بڕوا بۆ بازاڕ کەمێ نان و خۆراک بێنێ. یەکێکیان ڕۆیی خۆی نانی

.........................................................

خوارد و خۆراکەکەی زەهراوی کرد و بۆ ئەمانیشی هانی کە بمرن و تەلاکە بە تەنیا بۆ خۆی بێ. تا هاتۆ ئەمانیش تەگبیریان کرد کە بیکوژن و سێ کۆگا تەلاکە بۆ ئەوان بەجێ بمێنێ. کە هاتۆ لە ڕێوۆ کوشتیان، دوای ئەوە نانەکەیان خوارد و دەس بەجێ هەردووکیان مردن. دوای ماوەیێ حەزرەتی مووسا ڕێی کەوتە ئەوێ تەماشای کرد چوار لاشە لای ئەم سێ کۆگا تەلا دا کەوتووە، بە موعجیزە بە بەسەرهاتەکەی زانی و گێڕایەوە بۆ خەڵک. ڕۆیی بۆ سەر کۆگا تەلاکان و فەرمووی: ببنەوە بە خاک و خۆڵ با کەم کوشت و کوشتار لە سەرتان بکرێ ئیتر بوونۆ بە خۆڵ.

| | |
|---|---|
| ئەو چوار نەفەرە بۆ تەماع دونیا | کەوتنە ناو قەتڵ و مەینەت و بە لا |
| هەتا ئەتوانی تەماع کەمۆکە | مەینەت و بەلا لە خۆت کەمۆکە |
| نەفس کە بیگری پڕی مشتێکە | ئەگەر بەریدەی پڕی دەشتێکە |
| مەگەر قەناعەت چاری دەردت کا | وا نەبی دوچار هەزار دەردت ئەکا |

* * *

«۳۳»

## مردن مۆڵەت ناخوازێ

حەزرەتی مووسا عليه السلام لە جێیەکی چۆڵ و هۆلا و دوور ولاتا بوو، خوای گەورە حەزرەتی عیزرائیلی نارد گیانی بکێشێ کە خۆی لێ ئاشکرا کرد وتی: بۆ گیان کێشان تۆ هاتووم. حەزرەتی مووسا فەرمووی: بەشکوو بە لای خواوە مۆڵەتم بۆ بخوازی لە بەر دوو شت. یەکێ منالەکانم ورد و بێکەسن و با بە ناز بەخێویان کەم. دوو لەم عەرزە دوور و چۆلا بمرم کەس پێم نازانێ لاشەکەم قەل و داڵ ئەیخوا. خوا فەرمووی: بلێ بە مووسا: من رازقم و منالەکانی بۆ بەخێو ئەکەم لە خۆی باشتر، وە مەلائیکە ئەنێرم لاشەکەی بە ئیحتیرامۆ بنێنە ژێر خاک و عومری تەواو بووە و مۆڵەتی نادەم. ئیتر هەر لەویا عیزرائیل گیانی کێشا. دوای ئەوە بە ئەمری خوا مەلائیکە هاتن لەویا کفن و دفنیان کرد. قەبرەکەی وەکوو خۆی ڕێکی عەرزەکەیان کرد. ئیسە قەبری حەزرەتی مووسا بۆ کەس مەعلووم نیە.

| | |
|---|---|
| مردن فەرزێکە لە سەر هەموو کەس | پەس و پێشی تیا نیە یەک نەفەس |

وەختێ کە مەئموور هات بۆ گیان کێشان | چارێ‌تر نیە غەیر مل راکێشان
حەزرەتی مووسا بەو گوساخییە | ئاساری قەبری هەر دیار نیە

* * *

«٣٤»

## ناشوکری مەکە

رۆژێ سەعدی شیرازی «علیه‌الرحمه» بە بیابانێکا ئەڕۆیی کەوشی نەبوو، دڕک و داڵ زۆر ئەیدا لە پێی و زۆر ناڕاحەتی ئەکرد. ئەڵێ کە رۆیمە ئەولاترۆ پیاوێکم دی پای نەبوو زۆر شوکری خوام کرد کە من پام هەیە وکەوشم نیە، ئەو نە پای هەیە و نە کەوش بۆیە وتوویانە: خوای گەورە بەش شوکری هەر تیا پێلێتۆ.

ئەم نیعمەتانە هەریەک لە جێی خۆی | زەرەری زۆرە شوکرانەی نەکەی
شوکرانەی نیعمەت، نیعمەت زیاد ئەکا | کوفر نیعمەتت لە دەس دەر ئەکا

* * *

«٣٥»

## مێلوورە و سولەیمان

رۆژێ حەزرەتی سولەیمان مێلوورەیەکی گرت و لێی پرسی چەنێ بەش زەخیرەی ساڵێکت ئەکا؟ وتی: دنکێ گەنم. خۆی و دنکێ گەنمی خستە ناو گۆزەڵەیێ. دوای ساڵێ تەماشای کرد نیوەی دنکە گەنمەکەی خواردبوو وتی: زوو بە ساڵێ دنکە گەنمێکم تەواو ئەکرد ئەمزانی لە بیری خوا ناچم ئیمساڵ دەسم پێوە گرت کە تۆ بووبووی بە سەبب رزقم، وتم نەکا لە بیر تۆ بچم و پەکم بکەوێ.

لە مێلوورەوە فێر تەوەککول بە | ئیعتیماد لەسەر رازقی خوابە
وەک دوێکەئەمرۆیش رزقت پێ ئەگا | هەتا هەتایە هەر پەکت ناخا

* * *

«٣٦»

## دۆستی چاک

ئیمام جەعفەری سادق «خوای لێ رازی بێ» بۆ دۆسی راستەقینە پێنج شەرتی داناوە:

.......................................................................................

١.ئەبێ لە ئاشکراو پەنامەکی دڵی لە گەڵتا وەکوو یەک وابێ. ٢.خاسی تۆ بە خاسی خۆی بزانێ و خراویت بە خراپی خۆی. ٣.دەوڵەمەنی و دەرەجەداری نەیگۆڕێ لە گەڵتا. ٤.هەرچی دەسی ئەڕوا لە تۆ دریغی نەکا. ٥.لە تەنگانەدا بە تەنیا جێت نەیەڵێ.

ئەم شەرتانە دۆس ئەکا بە عەنقا — دەس کەس ناکەوێ ئالەم بێ‌بەقا
گشت ئەم شەرتانە کەوەختێ فەوتا — بۆت ئەدۆزمۆ بە باروو بە تا

* * *

«٣٧»

## قورئان بۆ هەموان و هەموو کاتە

پیاوێ پرسیاری کرد لە ئیمام جەعفەری سادق «خوای لێ‌رازی بێ» بۆچی قورئان هەمیشە تەڕ و تازە و جوانە؟ فەرمووی: لەبەر ئەوە کە قورئان بۆ زەمانێ نیە و بۆ زەمانێ‌تر نەبێ، بۆ دەسەیە نیە و بۆ دەسەیەکی‌تر نەبێ، بەڵکوو قورئان بۆ هەموو زەمان و بۆ هەموو کەسێکە. لەبەر ئەوە لە هەموو زەمانێکا تازەیە و لە پێش چاو هەموو کەسێکا جوان و شیرینە.

قورئان ئیمامە، قورئان ڕەهبەرە — بێ‌ئەو هەرچی کەین هەر بێ سەمەرە
هەرکەس ڕەفتارکا بە دەسوور قورئان — پێش‌کەوتوو ئەبێ لە هەموو دەوران
با پشت و پەنا بە ئەو ببەستین — ڕێگەی شەیاتین لە خۆ ببەسین

* * *

«٣٨»

## حازر جوابی

«مەنسوور» ڕۆژێ لە خزمەت ئیمام «جەعفەری سادق»دا وتوویژی ئەکرد بە هەموو تەعزیم و ئیحتیرامۆ. مێشێ نیشت بە دەم و چاو و لوتیۆ، دووکەڕەت سێ کەڕەت دەری کرد هەرهاتۆ، تا عاجز بوو بە دەسێۆ. پرسی لە ئیمام نازانم خ

................................................................................

ژچی مێشی دروست کرد؟! فەرمووی: بۆ ئەوە لوتی زاڵمانی پێ زەلیل کا.
ەنسوور لەم جوابە زۆر نارەحەت بوو سکووتی کرد و هیچی نەوت.

حازر جوابی هەروەکوو ئیمام     زۆر زەروورییە بۆ جوابی نەفام
تا بتۆزێتۆ لووتی ئەو کەســـە     کە زۆر زاڵم و هەوا پەرەســـە

❋ ❋ ❋

«۳۹»

## نوێژ

ئیمام عەلی‌ﷺ لە خوتبەی «نهج البلاغه»دا لە بارەی نوێژۆ ئەفەرمێ: نوێژ گرنە گەردن خۆتان و هۆشتان بێ مەیفەوتێنن. نابیسن جوابی ئەوانە وان لە جەهەننما لێیان ئەپرسن ئێوە بۆچی چوونەسە جەهەننم؟ ئەڵێن لەبەر ئەوە کە نوێژ نەکەر بووین. حەزرەت پێغەمبەرﷺ نوێژی تەشبیهـ کردووە بە ئاوی گەرمۆ کە لە درگای ماڵی پیاوێکا بێ هەموو شەو و رۆژێ پێنج جار لەو ئاوە خۆی شۆرێ عەقڵ بڕوا ناکا کە هیچ چڵکی پێوە بمێنێ. نوێژیش پێنج فەرزە دەوام کەین لە سەری چڵکی گوناهـ نایێڵێ بە سەرمانۆ.

نوێژکە بە دوام هەر مەیفەوتێنە     هەموو گوناهت بە نوێژ فەوتێنە
چاکە خراپە حەتمەن لائەبـــا     نەسسی ئایەتە شکت لائەبـا
بەهەشت بۆ کەسێ نیە کار نەکا     لەدەس موحتاجی خۆی رزگارنەکا

❋ ❋ ❋

«٤٠»

## خوا حەقی مەزلووم ئەسێنێ بەلام...

کەسێ زوڵمت لێ‌بکا بەو شەرتە خوا حەقت بۆ ئەسێنێ کە دەست ناڕوا، خۆت کزکەی لە بەردەستیا و حەواڵەی خوای کەیت و خۆت هیچ پەلە قاژە نەکەی، غەیبەتی نەکەی، جوێنی نەدەیتێ و نیوە ناوی بۆ دروس نەکەی. خۆلاسەی کەلام بەم نەوعە کارانە هەقی خۆت نەسێنی، ئەگەرنا حەقت نەما. خوای گەورە حەقت بۆ ناسێنێ. مامۆسایەکی زانا و دەوڵەمەن لە دێیەکدا موودەڕڕیس و ئیمام جومعە و جەماعەت بوو، بێ‌تەماع خەرجی فەقێکانی خۆی ئەیدا و دەرسی جوانی

پیَ ئەوتن. ئەهلی ئاوایی لە باتی خاسی لیّی بەرپا بوون. لە داخی ئەو مزگەوتیَتریان دروس کرد و زوڵمی زۆریان لیَ کرد. وەها زۆریان بۆ هانی ماڵ و موڵک و حوجرە و فەقیَ و مزگەوتی بەجیَ هیشت. رۆیی بۆ دییَتر بوو بە مودەرریس. هەموو جاریَ ئەیفەرموو: ژنەکەم نایێڵیَ خوا حەقم بۆ بسێنیَ ئەونە خراپی ئەهلی ئەو دیَ ئەڵیَ، بگرە ئێمە قەرزار ئەوان بووبین. ئیتر خوا چۆن هەقمان بۆ سێنیَ.

هەرکەس هەقی بیَ بەسەر کەسێکۆ — حەواڵەی خوایکا باش‌تر یەتە سوو
دێرگیرەوسەخت‌گیرخوای گەورەمان — تەوبە کەین لەلای بۆ گوناى گەورەمان
بەشکوو خۆش بیَ لە خەتاکانمان — بە عەفووی گەورەی بدا پەنامان

* * *

«٤١»

## یادی خوا بە دڵ ئاوا ئەبیَ

مەلا قادر ناویَ گەرمیانی لە بیارە فەقیَ بوو لە خزمەت مەلا «عبدالكريم مودەرریس»دا هیچ برِوای بە تەریقەت نەبوو و ئینکاریشی ئەکرد. سۆفییەکان لە خزمەت شێخی «علاءالدين»دا شکاتیان لیَ ئەکرد. ئەیفەرموو: مەلا قادر چاک ئەبێت. تا بە تەبیعەت وای لیَ‌هات لە خۆیۆ رۆی بۆ خزمەت شێخی «علاءالدين» تەریقەتی وەرگرت و حوجرەی تەرک کرد و رۆییە خانەقا و بوو بە سالیک. وە لەو حالا کە لە خانەقەدا بوو فەوتی‌کرد و بردیان بۆ شۆرین دڵی هەر تەکان تەکانی ئەکرد. وتیان نەمردووە. رۆین بۆ خزمەت شێخی «علاءالدين» وتیان: مەلا قادر لاشەی مردووە و دڵی هەر تەکان تەکا، چۆنی لیَ کەین؟ فەرمووی: مەلا قادر مردووە ئەسپەردەی خاکی کەن دڵی هەروا لە زیکرا ئەبیَ نامریَ.

دڵ بە زیکری خوا کەوتە تەکان — خۆزگەم بەو دڵە هۆز و بەرەکان
ئێمەیش با هەروەک ئەو مەلا وابین — هەمیشە خەریک زیکری خودا بین

* * *

«٤٢»

## چاوێ خوای تیابێ ئاوایش ئەبینێ...

ئەڵێن وەختێ مەلا ئەبووبەکری موسەننیف چۆڕی«رحمەالله» لە مزگەوتە سوورەی بەرقەڵای مەریوانا مودەڕڕیس بووە کەوا دیارە لە دەورەی ساڵی ۹۹۰ تا ساڵی ۱۰۰۰بووبێ. لەوەختێکا لە حوجرەدا دەرس بە فەقێکانی ئەڵێ بە چاو مەعنەوی تەماشا ئەکا میری سوور لە دێی خۆی لە شارەزوور ئاو پەموو ئەدێرێ. بۆ شۆخی دەس ئەبا ئاوەکەی ئەشکێنێ. هەڵیەبەسێتۆ و ئەیشکێنێتۆ. تا چەن ڕا هەڵیەبەسێتۆ. جا تەماشا ئەکا مەلا ئەبووبەکر لەو حوجرەوە دەسی ڕائەکێشێ بۆ داخستنی ئاوەکەی. ئەویش بێڵێ قوڕ هەڵئەگرێ بیخا بۆیان مەلا ئەبووبەکر تا هاوار ئەکا لە فەقێکانی کتێبەکان بپێچنۆ بێڵەقوڕەکە ئەدا بە ناو حوجرەکەیانا. بۆ کەسێ کە ئیمانی و باوەڕی بە مەعنەوییات بێ ئەمانە لای خوا ئاسانە.

ئەمە کەرامەت ئەولیا بووە  ئالەم نەوعانە زۆرتر زۆر بووە
چوون بە ئیمان و بە تەقوا بوون  خەریکی پارێز لە گوناهـ بوون

***

«٤٣»

## خوا مەیلی بێ ئاوایش ئەبێ و مومکیناتە

یەکێ لە پاشا بێدین و بێبڕواکان، نۆکەرێ دیندار و بڕواداری بوو، هەروەختێ ئەیوت خوای گەورە ساتێ نەکەی بە ساڵێ و ساڵێ نەکەی بە ساتێ. پاشا لەم قسە ئاڵۆز ئەبوو، ئەیوت ئەمە چیە تۆ ئەیڵێی؟. تا وەختێ ئەو پاشا بۆ موشکڵێ کە لە بەینی ئەو و موسوڵمانان بوو دەعوەتی عولەما دینیەکانی ئیسلامی کردبوو بۆ حەل کردنی ئەو موشکڵە. یەکێ لەوانە وتی: بە شا تۆ لەشت گرانە ئەبێ خۆت بشۆری جا موشکڵەکە حەل ئەبێ، شا لە گەڵ نۆکەرەکەیا ڕۆیین بۆ سەر ئاوێ خۆی شۆرێ نۆکەرەکەی دووبارە وتی: خوای گەورە ساتێ نەکەی بە ساڵێ و ساڵێ نەکەی بە ساتێ. شا وتی ئەمە چیە تۆ ئەیڵێی؟! کە چووە ناو حەوزەکە بە نیەت لابردن لەش گرانی خۆی کرد بە ئاوەکەدا تەماشای کرد بووە بە ژنێ بە لەش رووت وا لەلای بەحرێکا. شوانێ بە ڕانەکەیۆ وا لەویا و شوانەکە هات بۆلای.

هاواری لیٚ کرد: رووتم مەیێ بۆلام. کەرەکەکەی داکەند و جێی هێشت و هات کردیە بەری. ئێوارە لەگەڵ شوانەکەدا رۆینۆ بۆ ماڵ. لەگەڵ شوانە رێ کەوتن و شووی پێ کرد. تا ساڵێ بە یەکۆ بوون منالێکیان بوو. رۆژێ لە دەوری بەحرەکەدا ژنەکە رۆییە ناو ئاو و خۆی شۆرێ خۆی کرد بە ئاوەکەدا سەری بەرزۆکرد تەماشای کرد نۆکەرەکەی بە جلەکانیۆ ویساوە. جلەکانی کردە بەر و وتی: زۆرم پێ چوو؟ نۆکەرەکە وتی: کەمێ لە جاران زۆرترت پێ چوو. جا وتی: تۆ راس ئەکەی خوا ساتێ ئەکا بە ساڵێ و ساڵێ ئەکا بە ساتێ. ئەمە کەرامەتی ئەو نۆکەرە و ئەو پیاوە ساڵحە بووە کە خوای گەورە نیشان ئەو پاشایەی داوە و ئەویش گێراویەتۆ بۆ خەڵک. جا هاتۆ بۆ ناو مەجلیسەکە و گوێڕاگری مەلاکان بوو و موشکیلەکەی حەل بوو بە سەهل و ئاسان.

ساتێ بۆ ئەو شا بووە بە ساڵێ | لەو و لە شوانێ بووە منالێ
ساڵێ تەواوی لێ‌بوو بە ساتێ | کە هاتۆ جێی‌خۆی بە وادەی ساتێ

* * *

«٤٤»

## رق خواردنەوە و بەخشین

زینەتی ئینسان وا بە عیلم و حیلمۆ. رۆژێ یەکێ لە ئیمامەکان «خوایان لێ‌رازی بێ» لە مەجلیسێکا دانیشتبوو یەکێ لە پێش خزمەتەکانی کە غولامی بوو، خوانەیێ پڕ لە چێشتی گەرمی کە بە دەسیۆ بوو داکەوت بە سەر ئیماما. لە ترسا و لە تەریقییا وتی: پیاوی خوا کەسێکە رقی خۆی بخواتۆ. ئیمام فەرمووی: وا رقی خۆمم خواردۆ. دووبارە غولامەکە وتی: پیاوی خوا ئەو کەسەیە وەکوو رقی خۆی ئەخواتۆ لە گوناهی خەڵکیش چاوپۆشی بکا. فەرمووی: وا چاوپۆشیم لێ کردی و ئازادم کردی ئەمە ئیشارەیە بە ئایەتی ٢٨ی سوورەی موبارەکی «بقرە».

هەرکەس لە تاوان‌چاوپۆشی ئەکا | خوا لەگوناهی چاوپۆشی‌ئەکا
رەفتاری ئیمام دەرسە بۆ ئێمە | بیبەن بە رێوە نەفعە بۆ ئێمە

* * *

«٤٥»

## سەرجێیی هاوجووت

ئیمامی غەزالی «خوای لێ‌رازی بێ» لە «احیاء»دا ئەفەرمێ: «هیشام»ی کوڕی «عبدالملک»ی کوڕی «مروان» کە پاشای وەختی خۆی بوو، چوار ژنی بووە، بە چل شەو جارێ رەفێقی یەکێکیانی کردووە، لە ساڵێکا نۆ جار، لێیان پرسی بۆ وائەکەی؟ وتی: رەفێقی کردن لەگەڵ ژنا من بە حاڵەتی شێتی ئەزانم تا ئەو حاڵەتمە کەمتر بەسەرا بێ بە باش‌تری ئەزانم. ئەمە کە وتوویە لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامدا ڕێک ناکەوێ، لەبەر ئەوە شەرعەن سوونەتە کەسێ ژنی ببێ لە چوار شەو زیاتر بەینی رەفێقی ژن نەخا چوون ئەگەر چوار ژن بوون یەکێ شەویکیان ئەکەوێ لە چوار شەوا.

ژن هێنان سەبەب بەقای ئینسانــــە　　ژن هێنان لە بۆ بەقای ئیحسانە
خۆ شەهوەت‌ڕانیش ئیحسانی واتیا　　نەکا چێ بەشوێن نامەحرەمێکا

* * *

«٤٦»

## رازی ژنان

حەزرەتی ئادەم ﷺ وەختێ لە بەهەشتا دەرکرا کە خۆی و منداڵەکانی زەوی ئاوەدان بکەنۆ لەگەڵ حەووای دایکمانا هەریەکێ کەوتنە جێیێ. جا کەوتنە گەڕان بە شوێن یەکدا ئادەم بە ڕۆژ بێ وچان ئەگەڕا حەوا بە ڕۆژ و بە شەو ئەگەڕا تا لە خاکی عەرەفاتی مەککەدا کە حاجییەکان دیویانە لە یەک ئاشکرا بوون. حەزرەت ئادەم فەرمووی: لەو ڕۆژۆ لە تۆ بڕاوم بێ‌وچان بە ڕۆژا بۆ تۆ گەڕاوم. حەوا وتی: لەو ساوۆ من لەم جێی خۆما دانیشتووم و لەجێیی خۆما نەجووڵاوم. کەوابوو ئەم ناڕاسی ژنانە لەگەڵ مێردا بە میراتی لە دایەگەورەمانۆ هاتووە.

لە پەراسووی چەپ حەزرەتی ئادەم　　حەوا درووس بوو بە وتەی خاتەم
پەراسوو لارە بۆت راسۆ نابێ　　کە شکا ئیتر بۆت خاسۆ نابێ
ژن ئەگەر لەگەڵ لاری نەگەڕێ　　بە شوێن دەردی سەر خۆتا ئەگەڕێ

* * *

................................................................................

«٤٧»

## مەلا ئەبێ لە شێخیش روودەربایسی نەکا

مامۆسا مەلا «عبدالقادر» مەشهوور بە مەلای گەورەی بیارە کە لە سالی ١٣٣٨ق فەوتی کردووە وەختێ کە مودەڕڕیس بیارە ئەبێ و شێخی «ضیاءالدین» کە لە سالی ١٣١٨ق فەوتی کردووە کەفیلی خەرجی خۆی و فەقێکانی ئەبێ، رۆژێ بۆ پرسی مەسەلەیێ ئەڕوا بۆ خزمەتی مامۆسا. هەوری هەورێشم ئەبەسێتە ملی و پرسیارەکەی ئەکا لە مامۆسا. مامۆسا ئەفەرمێ: هەورێشم بۆ پیاو پۆشینی حەرامە تا ئەو هەورێشمە لە ملتا بێ جوابت نادەمۆ. شێخیش ئەفەرمێ: هەر ئەمەم لە تۆ ئەویست ئەگەر تۆ وانەبوایی من تۆم لە ناو ئەو هەموو مەلادا هەڵنەئەبژارد. کەچی لە ٢٧ مانگی ئەووەڵی هاوینی ١٣٨١ دەسەیێ وەهابی پەیا بوون کە دوو ساڵە بە تایبەتی ناوچەی لهۆنی عێراقیان داگیر کردووە و شێخانی نەقشەبەندی کە وان لەویا واتە «شێخی سراج الدین»ی گەورە و وەچە و نەوەکانی لەو تاریخا دەسیان کرد بە دەرهانینی تەرمی پیرۆزی ئەو شێخانە لە بیارە و لە باخەکۆنا، لە جەریمەی ئەوا کە موددەتی دووسەد ساڵ خزمەتکاری دین و قورئان و شەریعەتی ئیسلام بوون. خوا خۆیان و ئەوانەی هاوکارییان کردن و کۆمەکەکانیان لە ناوبا. ئامین

| | |
|---|---|
| مەلا کە لە شەرع لانەدا بە موو | لەبۆ فەرمانی مل کەچن هەموو |
| شێخیش هەرئەبێ وەک مەلا وابێ | تەسلیمی شەرعی رەسوولی خوابێ |
| مامۆسای گەورە و شێخ «ضیاءالدین» | جەزایان باتۆ خوای دونیا و دین |
| کە رێگەی شەرع و وەرع و تەریقەت | نیشانیان داوە بە خەیرە ئومەت |

* * *

«٤٨»

## شەیتان و فیرعەون

رۆژێ شەیتان رۆی بۆلای فیرعەون کە لەو وەختا خەریک ترێخواردن بوو. پێی وت: ئاخوم کەسێ وابێ کە بتوانێ ئەم بۆڵە ترێی تۆ بکا بە مرواری فیرعەون وتی: من کەسێ وا شک نابەم. شەیتان بە سیحر بۆڵە ترێکەی کرد بە مرواری. فیرعەون وتی: تۆ مامۆسای زانا و هۆشیاری. شەیتان شەپلاخەیەکی لێ د

وتی: من لە تۆ باش‌ترم من بەم هەموو مەهارەتۆ ئیددیعای خواییم نەکردووە و نایکەم تۆ بەو هیچ نەزانی خۆتۆ داوای خوایی ئەکەی!؟. حەقیقەتی هەس یا هەر وتراوە.

پیاوی وا هەیە لە ناو ئینسانا | وە ها ئەکەوێ بەختی شەیتانا
---|---
کە شەیتان مەنع و لۆمەی ئەو ئەکا | کە ئەونە گەوجە بە گویی ئەو ئەکا

* * *

«٤٩»

## کفن دزین و حەیا

خوالێخۆش بوو مەلا ئەبووبەکری موسەننیف چۆڕی «رحمە الله» لە کتێبی «ریاض الخلود»دا نووسیویەتی: لە زەمانی زووا پیاوێ بووە کە ئیش و کاری هەمیشەیی مردوو دەرهانین بووە لە قەبرا بۆ تەمای کفنەکەی، چون گرانی بووە، کفنەکەی فرۆشتووە بۆ بەڕێوە بردن گوزەرانی. لەوکات و ساتا کچێکی زۆر بە حەیا و حورمەت و بە دین و جوان بووە، خەفەتی زۆر سەری تێکردووە کە زۆر لەڕ و لاواز و باریکی کردووە، کەسوکاری ئەپرسن تۆ لەوە ئەچێ مەراقێکت بێ کەوا خەفەت‌کوژ بویی. ئەڵێ: راسەکەن لەوساوۆ ناو ئەو کفن دزمە بیستووە خەفەت وای لێ‌کردووم کە هیچ خەو وخواردنێک و ئارامم نیە، ئەترسم بمرم و ئەو کفنەکەم گریتۆ عەورەتم دەرکەوێ. وەکوو ئەڵێن: هەرکەسێ بترسێ لێی ناخەلەسێ. وا رێ ئەکەوێ ئەمرێ وکفن دزەکە ئەڕوا کفنەکەی لێ بگریتۆ کە دەسی ئەبا بە لای عەورەتیۆ دەسی ئەلکێ بە گۆشتیا هەرچی خەریک ئەبێ دەسی بۆ بەر نابێ ترسێکی زۆر ئەنیشێتە سەر دڵی و زۆر خەجاڵەتی رووی تێ‌ئەکا و دڵی دائەچڵەکێ و قیامەت دیتە بەرچاوی، تەوبەیێ خالیسانە ئەکا و زۆر لە خوا ئەپاڕێتۆ دەسی بەر ئەبێ. دوای ئەوە تا ما تەرکی کفن دزینی کرد بە بەرەکەت ئەو کچە موسوڵمانۆ. بە تەمیزی کفنەکەی تێوە ئەپێچێتۆ و دایئەپۆشێتۆ وەکوو جاران.

کفن، داپۆشین عەورەت مردووە | تەماشای نەکا ئەوەی زینووە
---|---
ئەو کفن دزە جەسارەتی کرد | بەو کچە پاکە خەسارەتی کرد
باش بوو بە سەبەب بۆ تەوبە کردن | بردی بە رێوە تا کاتی مردن

* * *

«۵۰»

## دزی و دەس بڕین

کەسێ دزی بکا و شتێ بدزێ کە قیمەتی چواریەکی لیرەیێ بێ لە جێی تایبەت خۆیا بی‌جوولێنێ ئەبێ دەستی راسی لە موچیا ببڕێ. کەڕەتێ‌تر دزێ کرد پای چەپی لە قولەپەیا ئەبڕێ. کەڕەتێ‌تر دەسی چەپی. کەڕەتر پای راسی چەپ و راسیەخەن. دوای ئەوە تەعزیری ئەکەن، واتە تەریقی ئەکەنۆ هەرجۆر ئیمکانی بێ. حاجیێ وتی: لە «مەککە»دا چاوم کەوت بە پیاوێ لە دزیبا هەردوو دەستی بڕا بوو سوالی ئەکرد، لەم زەمانا ئەم حوکمە بەڕێوە ببرێ چوار پەلدار کەم ئەبێ. بە تایبەت لە دەسەلاتدارا. لە زەمان حەزرەت پێغەمبەراﷺ پیاوێ دزی کردبوو دەسووری دا دەسی ببڕن. کەسدار بوو و دەوڵەمەند بوون گەرەکیان بوو بە تکا و پارە دەسی نەبڕێ. ڕۆیین بۆ خزمەت حەزرەتﷺ وتیان: تکامان بگرە هەرچی ئەفەرمووی لە پارە واین لە خزمەتتا. فەرمووی: قەسەم بە خوا فاتیمەی کچم دزی بکا دەسی ئەبڕم و ئەمری خوا ناخەمە زەوی بۆ هیچ کەس.

| | |
|---|---|
| دەس بڕینی دز لەبۆ عیبرەتە | بۆ تەمێی هۆز و بەرە وعەشرەتە |
| دەس بڕینی دز نەسسی قورئانە | تەغییری نابێ لە هیچ زەمانە |
| ئەمری خودایە ناخرێتە زەوی | بۆ ئەمری خودا زەوی دانەوی |
| کەسێ‌تر ئیتر جەسارەت نەکا | خۆی تووشی‌هەتکی‌دەس‌بڕین نەکا |

* * *

«۵۱»

## مەلا نابێ بترسێ

مەلای چاک و بە دین بۆیە جێگەدار حەزرەتن لە فەرمانی شەر دەرناچن. بۆ نموونە مەلایێ لە خزمەتیا ژنێ تەلاق درابوو، ئەبوا سێ حەیز بشۆریایێ جا شووی کردایێ. دوو حەیزی شۆری بوو. مەلایێ نەزان‌حاڵ مارە کردبوو. هاتن بیبەن بە بووکی خەبەریان دابوو بەو مامۆستا کە لە لایا تەلاق درابو مەئمووری کردبووە سەر ساحێب ژنەکە کە مارەی نەهاتووە و یەک حەیزی ما نابێ بیدا بە دەسیانۆ. شێخی ریش سپییان ناردبوو بۆ تکا، وتبووی: جا حەیزێ چ

بیکه بەخاتر من مامۆستا. فەرمووی: خۆ بە دەس‌من بوایێ هەرسێ حەیزەکەم ئەکرد بەخاتر تۆ. چی‌بکەم لە شەرع، دەسێ شەرع بیبڕێ خوێنی نیە. ئیتر زەماوەنەکە پەکی ئەکەوێ.

مەلا جێ‌داری رەسوولی خوایە مەراقی ئەنجام شەرعی خوایە
لە شەرعی ئیسلام لا نادا بە موو ئیستاش هەروایە، زووتریش وا بوو

❊ ❊ ❊

«۵۲»

## درێژی تەمەنیش زۆر باش نیە

ئەڵێن خوای گەورە بە حەزرەتی جوبرەئیلا ئاوی حەیاتی ناردبوو بۆ حەزرەتی سولەیمان. فەرمووی ئەگەر مەیلت لەسەر بێ بی‌خۆرۆ با عومرت درێژ بێ، ئەگەر نەیخۆیتۆ هیچ گوناحت ناگا، بۆ پرسی ئەم کارە لە هەموو گیانداریکی کۆکردۆ و فەرمووی: بە عەقڵ ئێوە بی‌خۆمۆ باشە یا نە، هەموویان وتیان بی‌خۆرۆ با خۆمان و ئەولادمان لە خزمەت تۆدا بین. تەماشای کرد ژیژوو نەهاتووە، ئەسپی نارد بە شوێنیا نەهات، سەگی نارد بە شوێنیا جا هات. پرسی کرد بە ویش جوابی داوۆ: من وا ئەزانم نەیخۆیتۆ باشە تا عومرت درێژ بێ خەفەتی دەورە و زەمانە و ناجۆری قەوم و بێگانە و نەخۆشین و تەنگانە زۆرتر رووت تێ‌ئەکا. با هەر وەخت خوا مەیلی بێت بت‌باتۆ بۆلای خۆی. سولەیمان قسەکەی وەرگرت و نەیخواردۆ. لێی پرسی بۆچی ئەسپم نارد نەهاتی سەگم نارد هاتی؟ وتی: لەبەر ئەوە کە سەگ بەوەفایە و دڵم نەشکاند. وە حەزرەتی سولەیمان سەلامی لە سەر دوای ۵٤ ساڵ عومر دونیای بەجێ هێشت.

حەزرەت سولەیمان بەو دەسەلاتۆ کە خوا بۆلای خۆیی ئەباتۆ
ئێمە بەم دونیا چۆن دڵمان خوشەکەین دڵمان بە خەفەت‌چۆن‌پرلە جۆش‌کەین

❊ ❊ ❊

«۵۳»

## خێر و ئیحسان و درێژی عومر

پیاوێ لە خەویا چاوی کەوت بە مەلائیکەیێ وتی: چەن ساڵ عومرتە؟ وتی: چل ساڵ. مەلائیکەکە وتی: خوای گەورە چل ساڵ عومریتری بۆ تۆ نووسیوە، بیست ساڵی زۆر دەوڵەمەن و خۆشحاڵ ئەبی بیست ساڵی فەقیر و بەدحاڵ ئەبی، جا خۆت سەرپشکی کامیان بخەیتە بەرۆ؟ وتی: ژنێکی ژیر و هاوڕاز و نیازم هەیە با پرسێکی پێبکەم بزانم کامیان خەمە بەرۆ. پرسی پێکرد وتی: با خۆشیەکەمان لە پێشۆبێ تا بیست ساڵ خوا ئەمێنێتۆو مولکی. دوای ئەوە دەوڵەمەنی زۆر باری بە سەریانا. ئەوانیش دەسیان کرد بە خێروخێرات لە مزگەوت و پرد و حوجرە و فەقێ و مەلا و فەقیر و هەژار و لێ قۆماو، میوانداری و لە باقی خێریتر درێغیان نەکرد و هەتا ئەیانتووانی لە خزمەت دین و میللەتا بوون. تا بیست ساڵەکە تەواو بوو ئیتر تەمایەر ناخۆشی بوون. لە خەوا چاوی کەوتۆ بەو مەلائیکە وتی: ئەو بیست ساڵە خۆشیتانە لەبەر ئەوە کە لە خێروخێرات درێغتان نەکرد خوای گەورە ئەو بیست ساڵەکەیتر بە خۆشی بۆ نووسیون، بڕۆن هەروەها بن هەتا ماون.

خێرو خێرات کە هەتاکوو ماوی فریات ئەکەوێ لە ڕۆژ داماوی
هیچ درێغ مەکە لە خێر و خێرات سەبتە لە دەفتەر،ڕۆژی عەرەسات

❊ ❊ ❊

«۵٤»

## پیاوانی خوا

ئیمام «موسی کاظم» مەرقەدی وا لە بەغدا ئیمامی حەوتم بووە. لە نەتەوەی حەزرەتی عەلییە «سەلامیان لەسەر» منالی زۆری بووە و زۆرتریان کوڕ بوون. ک هاروونەرەشید زۆریان بۆ ئێنێ لە سالی دووسەدی هیجری قەمەرییا لە ناچاری منالەکانی پەردەوازە ئەبن حەوتیان یێن بۆ ئێران ۱.سەیید ئیسحاق کە مەرقەدی لە شێخان لای نەسوود. ۲.سەیید «عُبیداللّه» ناسراو بە کۆسەی هەجیج کە وا لە دێ هەجیج. ۳.سولتان ئیسماعیل لە دێی ئەسپەرێز. ٤.پیر عومەر لە شاری سنە، مەرقەد وا لە پاڵ مزگەوتێکا مەشهوورە بە مزگەوتی پیرعومەر. ۵.هاجەرە خاتون لە س

.........................................................

٦.ئیمام رەزا لە مەشهەد. ١٠.فاتمە خاتوون کە مەشهوورە بە مەعسومە خانم لە قوم کە لە جوان عومریا لە سالی ٢٠٢ ق، فەوتی کردووە. ئەمانە کە هاتوونەتە ئێران هەمووکەس ڕێز و ئیحترامی لێ گرتوون بە تایبەت هاجەرە خاتوون لە شاری سنە کە مزگەوتێ وا لە پاڵ مەرقەدەکەیا لە وەختێکا ئەردەڵانی حاکم بوون لە کوردستانا هەر جەردە و دز و درۆزن و قاتڵێ لە زیندانا رای کردایێ دەسی گرتایێ بەو زەنجیرەوە کە وا بە درگای لای قیبلەیۆ و ئیسەیش هەرماوە ئازاد بووە. لەبەر حورمەت هاجەرە خاتوون لە زەمانی رەزاشادا بە دەسووری ئەو قورئانەکەی نگڵیان برد بۆ تاران لە بیرەوەری منا، خەڵکی نگڵ رۆین بۆ مزگەوتی هاجەرە خاتوون مانیان گرت و وتیان تا ئەو قورئانەمان پێ نەدەنۆ ناڕۆینۆ، ناچار قورئانەکەیان پێ دانۆ و لەگەل خۆیانا بردیانۆ بۆ نگڵ. ئەڵێن چەن پەڕەیەکی لە هەوەڵ و ئاخرۆ نەماوە.

| | |
|---|---|
| قورئان شافیع بێ لە رۆژی مەحشەر | بۆ گوناهباری ئوممەت پێغەمبەر |
| بەشکوو رزگار بین ئا لەو تەنگـــانە | لە بەر حورمەتی ئا ئەو قورئانە |

* * *

«٥٥»

## کۆسەی هەجیج

ئێمە لەگرا بازێ لە بەسەرهاتی کۆسەی هەجیج ئەنووسین وەکوو لە فەرهەنگی «عەمید»ا نووسراوە. هەجیج واتەیێ عەرەبییە، واتە دەرەقوولە. هەجیج وا لە چەمێ قوولا، دیێ وا لە خوارێۆ بە ناو دەرەقوولە. کۆسەی هەجیج لە عومری ١٨ساڵیا کە ئاوارە بووە لە بەغدا و رۆییوەتە دێی شەڕەکان و لەوێ بووە بە شوان. رۆژێ ساحێب حەیوانەکان دوور و نزیک ئەکەوێتە شوێنی بزانێ چۆن شوانێکە، تەماشا ئەکا روو بە قیبلە دانیشتووە نوێژ ئەکا و حەیوانەکانیش بە دەوریا ئەلەوەڕێن. ئەترسێ رۆژێ ئەم شووانە تازە بێخەم بێ لەم حەیوانانە گورگ بیانخوا. ئیتر جوابی ئەکا. ئەویش ئەڕوا بۆ نوێن. لەگەڵ پیاوێکا ئەبێ بە شوان، ئەویش لێی عاسی ئەبێ ئەڕوا بۆ ئەو هەردە لەبەینی دوو شاخا ئەشکەوتێ بەدی ئەکا. لەویا

..............................................................

دەس ئەکا بە عیبادەت و گیا خۆری. گۆزەڵەیەکی ئەبێ بۆ دەسنوێژ و ئاو خواردنەوەی. حەوت نەفەر نۆدشی ئەڕۆن بۆ راو، سەرێ ئەکێشنە ناو ئەو ئەشکەوتە. کە تەماشا ئەکەن نەفەرێ وا لەویا نوێژ ئەکا دەسەکەن بە گەمە وگاڵتە پێ کردنی. ئاو گۆزەکەی ئەخۆنۆ هەرتەواو نابێ ئەیشکێنن. ئیسەیش تایفەی گۆزەماڕ هەر هەن لە نۆدشەدا. دیاریان ئەوەیە چاویان کەوەیە. کەئەڕۆنۆ بۆ نۆدشە ئەگەنە شوێنێ پێی ئەڵێن مەحمووی سەرەواڵە هەر حەوتیان کوێر ئەبن. هەرجۆر ئەبێ ئەڕۆنۆ بۆ نۆتشە و قەوم و کەس لییان‌کۆ ئەبنۆ پێیان ئەڵێن: بۆچی واتان لێ هاتووە؟ کوێرەکان ئەڵێن: نەفەرێ نوێژکەر لەو ئەشکەوتا بوو لەو هەردە کە ئێمە ڕۆیین بۆلای گەمەمان پێ کرد و گۆزەڵەکەیمان شکان. وا دیارە بە دۆعای ئەوکوێر بووبین. ئەڕۆن ئەکەونە خاک و پای خوا بە دۆعای ئەو چاویان پێ ئەداتۆ. ئیتر خەڵک ئاشنا ئەبن بە کەڕامەتی. حەوت نەفەر موریـد کۆ ئەبنۆ دەوری یەکێکیان هاو شوانەکەی نوێنی ئەبێ، یەکێتریان کەرەم ناوێ ئەبێ. ڕۆژێ تینوویەتی زۆریان بۆ ئێنێ، ئەپاڕێنۆ لە کۆسەی هەجیج، ئەویش ئەپاڕێتۆ لە خوا لەو هەردووبەردە ڕەقا خوای گەورە کانییێکیان بۆ هەڵ ئەقوڵێنێ کە ئیسەیش ناو دێی هەجیج و باخچەکانی بەو پاراو ئەبن. من خۆم لە ساڵی ۱۳٦۸ ش کۆسەی هەجیجم زیارەت کردووە و لە مزگەوتەکەیا نوێژم کردووە. خەڵوەخانەی وا لە پاڵ مەرقەدەکەیا. خوای لێ رازی بێ، ئامین.

هەجیجی زۆر میللەتی پاک و تەمیز و قانیع و زەحمەت‌کێش بوون، ئاوات یەکێکیان ئەمەبووە: «چل مەن کوڵم بوایە تاجیلە رێگەم بوایێ پڕ بەر چاکم نانەڕەقە بوایێ. جا یارم چاوی تیوە بوایێ. هەجیجی دانراون بە خودکەفا. واتە هەموو شتێکیان لە خۆیان تەواو ئەبێ، کلاشیان ئەکرد بۆ پێڵاو، هاوین کەوشیان ئەدووری بۆ زسان جاویان درووس ئەکرد بۆ لیباس و مێزەرە و پشتوێن بۆ ژن و پیاو رانکووچۆخەی چاکیان بوو بۆ پیاوان، قانیع ئەڵێ:

تاکلاشی بەن چنی سافوسۆڵی خۆم بێ — قونەرەی تەسکوتروسکی ماڵی غەیرەم بۆ چیە
تاسەبیلی‌زەردوسووری‌فیتکەدووری‌خۆم‌بێ — قوڵتە قوڵتی نێرگەلە وتۆیی سنارم بۆچیە

منیش وتوومە:

ئافەرین هەجیج بۆ ئاو وخاکت لەبۆ میللەتی خاوێن و پاکت
زەحمەت ئەکێشن بۆژیان خۆیان لە ناو ئەو بەردۆ بڕوانە بۆیان

* * *

«٥٦»

## چەن پرسیارێک

ڕۆژێ تووش پیاوێ بووم بڕێ کتێبی بەدەسۆ بوو خۆی ناساند بە من و وتی: دەبیرم. منیش خۆم ناساند بە ئەو و وتم: بە بیرم. وتی: منیش وام زانیوە بۆیە چەن پرسیارێکت لێ ئەکەم وتی: من بڕوام بە وسیلە نیە وتم: هەرکەس عەقلی بێ ئەبێ بڕوا بە وەسیلە بکا بە دەلیل عەقلی و نەقلی. دەلیل عەقلیم ئەوەیە کە تۆ لە مەنی کە لەمناڵدان دایکتا کۆبووەتۆ دروس بوی و ئەو مەنیە بە وەسایل جۆراوجۆر لەپشتی باوکتا و لە سینەی دایکتا کۆبووەتۆ و لە دایکت داکەوتوویی تا ئیسە شیر دایکت خواردووە و خواردن و لباس و جێگە و هەوا وسیلە بوون بو بەردەوام بوون تۆ و تا ماوی ئەبێ هەروابی، مەدرسە و موعەللیم وسیلەی زانینی تۆ بوون. دەلیلی نەقلیم ١.ئایەتی: ﴿وابْتَغوا إلَیْه الْوَسیله﴾سووری مائیدە ئایەت٣٩. واتە: وەسیلە پەیاکەن بۆئەوە بتان گەیینێ بەخوا. ٢.ئایەتی: ﴿من اسْتَطاعَ إلیه سَبیلا﴾سوورەی ئال‌عیمران ئایەت ٩١. ٣.لەباسی حەجا بە ئەمری خوای گەورە کەسێ تەوانایی ببێ واجبە لەسەری بڕوا بۆ حەج. تەوانایی ماڵی و بەدەنی کردووە بە وەسیلەی واجب بوونی ڕۆیین بۆ حەج. ٤.ئایەتی: ﴿وَتَعاوَنوا عَلَی البِرّ والتّقوی وَ لا تَعاونوا عَلی الإثمِ وَ العُدوانِ﴾ سوورەی مائیدە ئایەت٣ واتە: کۆمەک کەن بە یەک لە چاکە کردن و لە پارێز کردنا لەگوناهـ کۆمەک مەکەن بە یەک لەگوناهـ کردن و دوژمنی کردنا. کەوابێ کۆمەک وەسیلەیە لە چاکەکردن و خراوە کردنا. کەوابێ تۆ ناتوانی ئینکار وەسیلە بکەی.

پرسیاری دوهەم. وتی: لە مەعنەوییاتا وەسیلە نیە وتم: ئیمە بە وەسایل مەعنەوی دین و ئیمانمان دەس‌کەوتووە لەخوا و لە جوبرەئیل و لە قورئان و لە عولاما و لەکتێبەکانیانەوە.

پرسیار سێهەم. وتی: مەهدی هەیە یا نیە؟ وتم: بوونی مەهدی بە حەدیس سابتە. کەسێ بڕوای بە حەدیس نەبێ دینی نیە لەبەر ئەوە کە خوای گەورە ئەفەرمێ: ﴿وَما یَنْطِقَ عَنِ الهَوی إنْ هُوَ إلا وَحْیٌ یُوحی﴾ سوورەی نەجم ئایەت٤. واتە: پێغەمبەر لەخۆیۆ بە هەوای نەفس قسە ناکا، ئەوەی کەئەڵێ وەحیە کە لە تەرەف خواوە بۆی هاتووە.

پرسیاری چوارەم: وتی «بن‌لادەن» مەهدییە یا نە؟ وتم: مەهدی نیە لەبەرئەوە مەهدی چەن عەلامەتی هەیە وەکوو هاتنی دەجاڵ وتی: «بن‌لادەن» مەهدی نەبێ زۆر لە مەهدی گەورەترە. وتم: «بن‌لادەن» وەکوو ئەڵێن: تریاک فرۆشە و بۆ تریاک فرۆشی هاتووە بۆ «ئەفغان» و ئەو سەرروەتیە بە تلیاک بە دەس هانیوە، کە تلیاک دوژمن نەفس و ناموس و ماڵی ئینسانە. کەوابێ بن‌لادەن دوژمن ئینسانە، وە هەروەها ئەو پیاوە خەلکی بێ گوناهی زۆری کوشتوە لە ژن و مناڵ و خەرجی زۆر ئەکا لە کوشتنی موسوڵمانان بە بیانووی شەڕ لەگەڵ کافراندا، چۆن لە مەهدی گەورەترە؟! وە مەعلووم نیە ئەهلی ئیمان بێ ئەو خەرجە ئەو ئەیکا لە ڕێگە ناشەرعییەدا ئەیتوانی زۆر موسوڵمانی فەقیر و هەژاری پێ بژیێنێ و دلی زۆ ئینسانی پێ خۆش بکا، موسوڵمان کاری وا ناکا!

تلیاک تەریکت ئەکا لە خەلکی　　　تەرکی کە هەتا پیاوێ بە کەلکی

* * *

«٥٧»

## دروست کردنی ئینسان لە مشتێ خاک

خوای گەورە دەستووری دا بە چوار مەلائیکە موقەڕڕەبەکان بڕۆن ب سەر عەرز لە هەموو نەوعێکی، مشتێ خاک بێنن، کە قەوارەی لاشەی حەزرە ئادەمی لێ دروس بکا. «جوبرەئیل» و «میکائیل» و «ئیسرافیل» بە تەرتیب هەریە لە نۆرەی خۆیانا ڕۆین بۆ سەر زەوی ئەونە هاوار و داد و بێدادی کرد بەزەییی پیاهاتۆ و مۆڵەتیان دا و نەیان برد. لە حوزوور خوادا عەرزیان کرد: خۆتو خۆت ئێمە باشتر ئەزانی کە زەوی ئەونە هاوار و داد و بێدادی کرد ئێمە بەزەییمان هاتۆ و ئێتر مشتە خاکەکەمان نەهاورد. دوای ئەوان عیزرائیلی نارد هەرچێ زەو

گریان و زاری کرد وتی: خوا ئەمری کردووە بەمن و منیش مەئمورم و مەعزور بۆ هاواری تۆ ئەمری خوا ناخەمە زەوی. خوای گەورە لەو مشتە خاکە ئادەمی دروس کردووە، ئەو هەموو نەتەوەیە لێ‌کەوتۆ لە هەموو رەنگێ و هەموو گیانداریٚ لە دوای تەواو بوونی عومری ئەبێ بمرێ. وەکوو سەرباز لە جێیەکۆ ئەینێرن بۆ جێیێ‌تر لە پێشا جیرەکەی ئەبڕن، بەشەریش کە کاتی مردنی هات جیرەی لە دونیادا ئەبڕن کە ئەمە پێی ئەڵێن: «وەفات» واتە تەواو کردن جیرە. وە جیرەی بەشەر خواردن و خواردنەوە و هەوا هەڵمژینە. خوای گەورە فەرمووی بە عیزرائیل: تۆ لەبەر فەرمانی من رەحمت نەکرد بە زەوی و بە هاوار هاواری، ئیسەیش مەعمووربە بۆ گیان‌کێشانی ئەو گیاندارانە کە لەو مشتە خاکە دروس بوون. ئەویش گیان هەموویان ئەکێشێ بێ رەحم و بێ بەزەیی، وەکوو رەئیسی بەرق هەر وەخت مەیلی بێ بەرقی هەرماڵێ خامۆش ئەکا.

مردنی گیاندار وەختێ وەختی هات بەروو دوای نیە بە کات و بە سات
فریای خۆت کەوە بە تۆبە و تاعات هاکا لە ناکاو نۆرەی مەرگت هات

* * *

«٥٨»

## خوا رازقە

خوا لە قورئانا بووە بە زامنی رزق هەموو گیانداریٚ، بۆ نموونەی رازقی خوا لەگرا دوو بەسەرهات ئەنووسم:

١. بەچاوی خۆم لە چەمی زەڵما بەردێ گەورەم چاو پێ‌کەوت کە ئاو دەوری دابوو لەناو ئەو بەردا شارە مێلوورەیێ بوو کە خوا دارێکی لارۆ کردبوو بۆ سەر بەردەکە لەسەرئەو دارۆ مێلوورە ئەڕرۆیشتن بۆ ئەو بەرۆ دانەیان ئەهانی بۆ ژیان خۆیان.

٢. پیاوێ بۆی گێڕامۆ کە بەردی گەورەم شکان هیچ کونێکی تیا نەبوو لەگەڵ ئەوا لە ناو ئەو بەردا کرمێ بوو گەڵایێ سەوزی بەدەمۆ بوو، بە نەزەر عەقڵی ئێمە کە نارەسایە و دوورە، وەلێ بۆ قودرەت خوا زۆر سەهل و ئاسانە کە لە ناو ئەو بەردە رەقا خوا گەڵای سەوز و هەوای بۆ ئەو کرمە دروس کردبێ.

بۆ رزق هیچ کەسێ لەبیر خوا ناچێ رزق وا لەگەڵیا بۆهەرکوێ ئەچێ

شوکری خوامان با له بیر نـەچـێ      با نیعمەت زۆرمان لەدەس‌دەرنەچێ

* * *

«۵۹»

## سەڵوات دان لەسەر پێغەمبەرﷺ

دێیێ بوو کە لە ژووریانۆ کانێکی چاک و ئاوداریان بوو کە بەو ئاوە بژیویان بەڕێ ئەچوو. لە خۆوە ئاوەکەیان وشکی کرد. هەرچێ بەکارێزکەن و یخەدر وکاریگەر و خو مانووکردن و دۆعا و نزا خەریک بوون، کانیەکە ئاوەکەی بۆ نەهاتەوە. پیرەژنێ لێ‌کەوتوو وتی: من ببەن بۆسەر ئەو ئاوە دۆعایێ ئەزانم ئەیخۆینم بەشکوو خوای گەورە ئاوەکەمان پێ باتۆ. بە زەحمەتی زۆر بە سواری و بەکۆل بردیان بۆسەرکانیە وشکەکە، لەوێ دەسی کرد بە پاڕینەوە و لالـینەوە، بە ئەمری خوا ئاوی کانیاوەکە هاتۆ چاکتر لە جاری جاران. دوای ئەوە پرسیاریان لێ‌کرد: داپیرە تۆ چ دۆعایێکت خوێند وا خوا ئاوەکەی پێ‌داینۆ؟ وتی: لە منالێو دایکم سەڵەواتێکی فێرکردووم کردومە بە ویردی سەر زوانم هەمیشە ئەیخوێنم. ئیسە کە زۆر بەگیر هاتبوون ئەو سەڵەواتمە خوێند و هاوارم کرد لە خوا ئاوەکەی پێدانۆ.کەچی ئیسە وەهابی مونکیر سەڵەواتن.

ئەگێرنۆ لە زەمانی موحەممەدی کوڕی «عبدالوهاب» کوێرێ دوای بانگەکەی سەڵەواتی داوە لەسەر پێغەمبەرﷺ لە جورمی ئەوا لە منارەکە هاتەخوارا ئیعدامی کرد. کەچی ئایەت و حەدیس کۆمەک ئەو کوێرە ئەکەن، ئایەتـ ئەفەرمێ: ئەی کەسانێ کە ئیمانتان هێناوە سەڵەوات بەن لەسەر موحەممەد و سەلامی لێ کەن بە سەلام کردنی هەمیشەیی سوورەتی ئەحزاب ئایەت۵۷. و پێغەمبەرﷺ لە حەدیسا فەرموویەتی: هەرکەس سەڵەوات با لە دیاری من واجـ ئەبێت لەسەرم شەفاعەتی بۆ بکەم. وە فەرموویەتی: لە هەمووکەسێ بەخیلـتـ کەسێکە کە ناوی من لەلایا ببرێ و سەڵەوات نەدا لە دیارم. وە ئیمامی غەزالـ «رحمه الله» فەرموویەتی: هەرچەن سەڵەوات بدرێ لە دیاری حەزرەتﷺ ئەونـ دەرجەی بەرز ئەبیتۆ تا ئەگاتە مەقامی مەحموود سوورەتی ئیسرا ئایەت۸۱

مەقامی مەحموود مەقام شەفاعەت      تایبەتی خوایە بۆ روتبەی حەزرەت

بەشداربین لەوا هەموو موسوڵمان    بۆ خاتر حورمەت حەدیس و قورئان

❊ ❊ ❊

«٦٠»

## شوکری ئەندام

ئەندامی بەدەنی ئینسان هەریەک لە جێی خۆی نیعمەتێکن لە نیعمەتەکان خوا، وە هەریەکێکیان شوکری جاوازیان ئەوێ. بەدەنی بەشەری عادی ٣٦٠ رەگ و جمگەی هەیە و هەریەکێ شوکرێکی ئەوێ. شوکری هەرنیعمەتێ بە عموومی بە کارهاتێ نیە لەوا، خوا بۆی دروس کردووە. مەسەلەن سەرف کردن و خواردن و خواردنەوەی حەلاڵ لەوا کە خوا ئیجازەی داوە نەوعێکە لە شوکری پێهاتن بە نیعمەتەکەی خوا داویە نەوعێکیتریەسی. عەبدایەتیکردنی خوا نەوعێکیترە. پرسییان لە مامۆسایێ شوکری زوان چۆنە؟ وتی: شوکری ئەوەیە قسەی راس و دروسی پێ بکەی، قورئانی پێ بخوێنی، دەوری پێ بکەی مەوعیزەی پێ بکەی. رانمایی و مۆجگاری خەڵکی پێ بکەی و ئیسلاحی خەڵکی پێ بکەی، درۆ و دەلەسە و غەیبەت و فیتنەیی و بوختان و بێ ئەمری خوای پێ نەکەی. وتیان: شوکری نیعمەتی گوێچکە چۆنە؟ وتی: شوکری گوێچکە ئەوەیە گوێ بگری بۆ مۆجگاری خێر، بۆ دەرس خوێندن، بۆ قسەی خاس و خراپ، خاسەکەی عەمەڵی پێ بکەی و لە خراوەکەی دووری بگری.

زوان یەکێکە و گوێچکە دوانە    یانێ یەک بڵێ و دوان بزانە

وتیان شوکری چاو چۆنە؟ وتی: شوکری چاو ئەوەیە کە تەماشای شتی چاکی پێ بکەی وەک تەماشای قورئان و حەدیس و کتێبی دینی و یا تەماشای مەحرەم یا تەماشای مەخلووقی خوا بۆ ئیسباتی قودرەتی. ئەبێ چاو نەگێڕی بە وانا کە خوا پێی ناخۆشە. وتیان شوکری دەس چۆنە؟ وتی: شوکری دەس وایە کە کاری باشی پێ بکەی وەک درەو و کێشەوگێرە و کاریگەری و وەسا کاری و نووسین و بێڵکاری و درەختکاری و حەماڵی و هەرچێ دەس ڕەنجی تیابێ، وە ئەبێ دەس درێژی نەکەی بەسەر ماڵ و مناڵ و ناموس کەسێ بە ناحەق.

ئەگەر تاڵبی بۆ ئیحسان و خێر    دەسی مانووی خۆت بنێ سەرسک تێر

بۆ نان و ماس و بۆکەرەوپەنێر    سەرت شۆڕ مەکە بۆ ئیحسان وەک کوێر

وتیان ئەی شوکری پا چۆنە؟ وتی: شوکری پا ئەوەیە کە هەمیشە بەرپابی بۆ رۆیشتن بۆ جێیێ تا دەس کەوی. بۆ مزگەوت بۆ عیبادەت، بۆ جەماعەت، بۆ عەیادەت نەخۆش، بۆ سەر قەبران، بۆ بەرێ کردن مردوو، بۆ زیارەت مردوو کە لە ئەوانا بیر لە مردن خۆت کەیتۆ، دەس لە خراوکاری هەڵگری بەپێ نەرۆێ بۆ دزی و حیزی و جەردەیی و جاسووسی و بۆ جێێ کە خراپکاری تیا بکرێ، یا بۆ جێیێ کە خوا پێی ناخۆش بێ. وتیان شوکری سەر چۆنە؟ وتی: شوکری سەر ئەوەیە کە سەر دانەوێنی بۆ خوا. بە سوجدە بردن یا سەرشۆڕ کردن بۆ بیرکردنەوە لە گەورەیی خوا و لە نافەرمانی خۆت و خەجاڵەتی خۆت و لە قەبر و قیامەت و لە مەیانی باس‌وخواست.

❊ ❊ ❊

«٦١»

**کافر**

«تهذیب الکلام» لە ئاخری باسی ئیمانی موقەللیددا نووسیویە: کافر حەوت دەسەن، ئەگەر ئیزهاری ئیمانداری خۆی ئەکا ئەوە مونافقە. ئەگەر زووتر موسوڵمان بووە ئیسە هەڵگەڕاوەتۆ لە دین ئەوە مورتەددە. ئەگەر باوەڕی رای ئەکێشێ بۆلای ئەوە کە خوا چەند دانەیەکە ئەوە موشریکە. ئەگەر لەسەر دین بازی لە پێغەمبەرە کتێب دارەکانە، ئەوە کافری کیتابییە. ئەگەر باوەڕی وابێ ئەمانە کە لە عالەما پەیابوون لە زەمانەوە بوون و بۆخۆیان بە وجوود هاتوون، ئەوە کافری دەهرییە. ئەگەر ئەڵێ ئەم عالەمە هیچ دروست‌کەری نیە، ئەوە «معطیله»یە. یانێ دوو بێ‌ساحێبە. ئەگەر بە دەم ئیزهاری ئەو شتانە ئەکا کە نشانەی ئیسلامە و لە دڵ بیروبڕوایەکی شاردووەتۆ کە بە قەولی هەموو موسوڵمانان کوفرە ئەوە زیندیقییە لەسەر هیچ مەزهەب و ئاینێ نیە.

زانین ئەمانە ئا لەم زەمانە — لازمی زیمەی هەموو ئینسانە
با دووری بگرێ ئا لەم رێگانە — کە هەموو رێگەی نەفس و شەیتانە

❊ ❊ ❊

«٦٢»

## عەداڵەتی عومەر

لە زەمانی خەلافەتی حەزرەتی عومەرﷺ کە نموونە بووە بۆ عەداڵەت و ئێستەیش هەر بە ناوبانگە. لە غەزاییکا ئەسحابەکان پیرۆزییان بە دەس هانی و تالان و غەنیمەتێ زۆریان دەس کەوت کە پارچەی لیباسیشی تیابوو هەریەکێ بەش دەسێ لیباسیان لەو پارچە دەس کەوت و دوورییان و کردیانە بەریان، حەزرەتی عومەریش دەسێکی لێدووری و کردیە بەری، کە ئەو لەوان بالا بەرزتر و قەوی و قۆڵتر بوو، لە بەین خۆیانا وتیان: رەنگە بۆ خۆی لە ئێمە بەشی زیادتر دانابێ بۆیە بەشی کردووە، کە قسەکە کەوتە گۆیی فەرمووی: «عبدالله»ی کورم بەشەکەی خۆی دا بە من بە هەردوو بەشەکە جا دەسە لیباسەکەی منی تەواو کردووە. گومانتان وا نەڕوا کە من زیادە بەشم بۆ خۆم دانابێ، من خۆم لە ئێوە جیا ناکەمۆ.

عەداڵەت فێربە ئا لەو بەڕێزە     کە ئەونە ئەهلی وەرع و پارێزە
با تۆیش وەکوو ئەو بی بە نموونە     با سەر بەرز دەرچی لەم دونیای دوونە

* * *

«٦٣»

## دەسەڵاتی خوا

یەکێ‌تر لە نموونەی قودرەتی خوای گەورە:

ڕۆییم بۆ ماڵێ شتێکم تووش هات     بەرگێ جوانی بوو بێ‌دوورین خەیات
پڕ بوو لە ئاردا بەبێ هاڕین ئاش     دار تاشیاوێ بوو بێ تەشوێ و دارتاش
دنکی سرنجک بێنە بەرچاوت     ئەوەی کە وتمان بێتە بەر چاوت
ئەوەی کە قودرەت ئەزەلی ئەیکا     هیچ قودرەتێ‌تر ناتوانێ بی‌کا

* * *

«٦٤»

## مانگەکانی ناو حوجرە

حەزرەتی عایشە خاتوون «خوای لێ ڕازی بێ» لە خەویا چاوی کەوت بە سێ مانگ لە عاسمانۆ کەوتنە خوارۆ بۆ ناو حوجرەکەی. خەوەکەی گێڕاوۆ بۆ باوکی، کە حەزرەتی ئەبووبەکر سیدیقەﷺ، لە جوابی تەئویلی خەوەکەیا فەرمووی: سێ نەفەر لەم حوجرەی تۆدا بە خاک ئەسپێرین کە گەورەترینی ئەهلی سەر عەرزن کە حەزرەتی پێغەمبەرﷺ فەوتی کرد لەو حوجرەی حەزرەتی عایشەدا بە خاک سپێریا، حەزرەت ئەبووبەکرﷺ فەرمووی: ئەمە یەکێ لەو سێ مانگە. کە حەزرەتی ئەبووبەکر فەوتی کرد لە پشتی حەزرەتۆ بە خاک سپێریا. کە حەزرەتی عومەرﷺ فەوتی کرد، لە ژێر پای حەزرەت ئەبووبەکرا بە خاک سپێریا، جێی نەفەرێ لە ژێر پای پێغەمبەرداﷺ خاڵی ماوەتۆ. ئەڵێن بۆ حەزرەتی عیساﷺ دانراوە. پێغەمبەران هەموویان «سەلامیان لەسەر بێ» لە هەرکوێ گیانی پاکیان سپاردەبێ، هەر لەویا ئەسپەردە کراون. وا ڕێکەوتووە پێغەمبەر خۆمان لەو حوجرەی حەزرەت عایشەدا گیانی سپاردووە، بۆیە لەویا بە خاک سپێریاوە.

هەزاران سەلام لەو خاکە پاکە　　　کە جێگەی قەبری شاهی لەولاکە

لای قیبلەوە خاڵیە بۆ ئەو کەسانە کە زیارەت ئەکەن.

حەزرەتی ڕەسول لەگرا نێژراوە　　　ژێر پای بە خاڵی هەروەها ماوە

لەگرایە قەبری بووبەکری سیدیق　　　عومەر وا لەگرا بە قەولی تەحقیق

* * *

«٦٥»

## حەزرەتی نووح و پشتەکانی

نووح بە نۆ پشت ئەگاتۆ بە حەزرەتی ئادەم. «نووح» کوڕی «لەمەک ١٦٤٢ ساڵ لە پاش هاتنە سەرزەوی ئادەم هاتووەتە دونیاوە تەمەنی ١٠٤٠ ساڵ بو ٧١٢ ساڵ دوای فەوتی ئادەم. لەمەک کوڕی «متوشح» ٧٧٧ ساڵ تەمەنی بو کوڕی حەزرەتی «ئیدریس» بووە کە ٩٦٩ ساڵ تەمەنی بووە، ئەویش کوڕ «ئوخنوخ» کە بە ئیدریسی نەبی بە ناوبانگ بووە، کوڕی «یەردە» ١١٢٠ ساڵ لە پا

........................................................................

هاتنه سەرزەوی ئادەم لە دایک بووە لە «میصر»، تەمەنی ۳٦٥ ساڵ بووە، ۳۰ دانە سوحوفی بۆ هاتووە، کوڕی «مهلائل» ۹٦۲ ساڵ تەمەنی بووە، کوڕی «قینان» ۸۹۰ ساڵ تەمەنی بووە، کوڕی «ئەنوش» ۹٥۰ ساڵ تەمەنی بووە، کوڕی «شیث» ۹۰٥ ساڵ تەمەنی بووە، کوڕی «آدم» لەقەبی «هبةالله» بووە، باوکی عومری لە سەرزەوی ۲۳٥ ساڵ بووە لە دایکە «حواء» پەیا بووە ۹۱۲ ساڵ تەمەنی بووە. قەبری وا لە «موصل» لەلای خواوە ٥۰ پەڕەی بۆ هاتووە. ئادەم باوکی هەموو بەشەرە. ٥٥۹٤ ساڵ بەر لە میلادی «مسیح» هاتووەتە سەرزەوی و ئیسە کە ساڵی ۲۰۰۸ ئەبێ بە ۲ ۷٦۰ ساڵ و ۱۰ پەڕەی لە لای خوداوە بۆ هاتووە. ئادەم لە دوای ۹۳۰ ساڵ تەمەنی سەر زەوی فەوتی کرد. ۷۱۲ ساڵ دوای فەوتی ئادەم نووح لە دایک بووە تا ئێرە کورتەیەکە لە کتێبی «بنەماڵەی پاکان» نووسراوی حاج مەحموود دێولان.

* * *

«٦٦»

## ئەهلی بیدعەت و ڕەفێقیان

ئیمام جەعفەری سادق فەرموویەتی: ڕەفێقی ئەهلی بیدعەت مەکەن کە لە شەرع لائەدەن و لە مەجلیسیانا دا مەنیشن، لەبەر ئەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: پیاو وا لە سەر دینی دۆس و ڕەفیقەکەی. ئەم فەرمایشە بووە بە پەندێکێ گەورە لە هەموو ولاتێکا. وە ئێمە بەرەکەت و دەرسی لێ وەر ئەگرین لە هەموو حالەتێکا کە دۆسایەتی ئەکەوێتە بەین خەلکی. کەسێ کە ڕەفێقێ پیاو چاکان کا ئەمیش لەوانە. کەسێ کە ڕەفێقی خراوکار ئەکا وائەزانین ئەمیش یەکێکە لەوان. ئەهلی بیدعەت، کەسێکە بڕوای بە شەریعەت نەبێت و خەلکی لێ دوور خاتۆ.

| | |
|---|---|
| لەگەڵ خراپا ڕەفێقی مەکە | خۆت تووشیفەسادئەخلاقیمەکە |
| لەگەڵ پیاوچاکا بڕۆ بە ڕێدا | سێبەری فەیز و ڕەحمەت لێت ئەدا |

* * *

«٦٧»

## کەس تەریق مەکەرۆ

«نظام الملک» کە حاکم بوو، ڕۆژێ فەقیرێ بە دیاری کۆڵێ خەیاری بۆ برد لەو وەختا خەلکێ زۆر بە دەوریا بوون، خەیارێکی لەت کرد و خواردی و

دوای ئەوە چەند دانەیێ تری خوارد و وتی: بیبەنە مالۆ داینێین تا خۆم لێی ئەپرسمۆ و دەستوری دا شتێ زۆریان دا بە ساحێب خەیارەکە و رۆیی. دوایی هاومەجلیسەکانی گلەییان کرد و وتیان: تۆ بۆ تەعاروف خەیارت پێنەکردین. وتی خەیارەکەی تاڵ بوو ئێوە بتان خواردایە، ئەتانوت تاڵە، ئەویش تەریقۆ ئەبوو.

پیاوی پیاوانە ئەبێ وەها بێ — میوان لەلایا تەریقۆ نابێ
بە خۆشی و باشی رەوانەی ئەکا — خۆیشی سەربەرزی لای خوا ئەکا

* * *

«٦٨»

## ئاوی بەهەشت

رۆژێ مەئموونی کوڕی هاروونەڕەشید عەرەبێ بە کونلۆچکەیێ ئاوۆ رۆیی بۆلای وتی: «ماء الجنه»تم بۆ هێناوی، واتە ئاوی بەهەشتە. ئەویش بازێ لە ئاوەکەی خواردۆ و وتی: بیبەنە مالۆ خالی کەن بیهێننۆ. کە هانیانۆ پڕی کرد لە لیرەی ئەو وەختە و پێیدا و نەفەرێکی خستەتەکی وتی لە کوێوە هاتووە رەوانەی بکە لە شاری بەغدا دەری بکە با بڕواتۆ. دوای رۆیین ئەو وتی: ئەم عەرەبە لە کەم ئاوی عەربستانا بەخێو بووە ئەم چلکاویە چاو پێکەوتووە وای زانیوە ئاوی بەهەشتە هێناویەتی بۆ من، بۆیە وتم رەوانەی کەن بە رێگەی خۆیا بڕواتۆ با ئاوی پاک و شیرینی دەجلە و فوڕاتی چاو پێنەکەوێ تەریقۆ بێتۆ.

* * *

«٦٩»

## بۆ کەس چاڵ هەڵمەکەنە، خۆت پێوە ئەبی

پیاوێکی سالح بوو هاروونەڕەشید خۆشی ئەویست و ئەیوت: هەر وەخت ئەتەوێ بێی بۆلام حەزەکەم و دەستووری دابوو کە بێداوای رێگەدان هەمو وەختێ بێ بۆلای مۆجگاری بکا، هەروەختێ ئەهات بۆلای لە رێوۆ ئەیوت: لەگە هەموو کەسێکا باش بە. ئەوەیش کە خراپە خراپەکەی خۆی تەمێی ئەکا وەزیری ئەوقاف رقی لێهەڵگرت بە تەما بوو بوختانێکی بۆ بکا لای حاکم ک لەبەینی ببات. وتی بە حاکم: ئەو پیاوە چاکە کە تۆ خۆشت ئەوێ وا ئەزانێ کە

دەمت بۆگەنە بە ناونیشانی ئەوە کە تۆ دەم ئەبەی بە لایۆ دەس ئەگرێ بە لووتی. حاکم وتی: با تاقی بکەمەوە. وەختێ کە ئەیزانی ئەڕوا بۆلای حاکم پیاوە چاکەکەی دەعوەت کرد و سیری دایە دەرخواردی کە ڕۆیی بۆلای حاکم وتی: بێبەرۆ. کە ڕۆیی دەستی گرت بە دەمی کە بۆی سیر نەڕۆ بە لووت حاکما. حاکم وتی وەزیر راسەکا. بە دەسخەت خۆی نووسی بۆلای جەلاد: هەڵگری نامە بێمۆڵەت بکوژە و پێستەکەی پڕکە لە کا بێنێرە بۆم. کاغەزەکەی لاک و مۆر کرد و دای بە دەسیۆ، رەسمی وابوو بە خەت خۆی بۆ خەڵات و بەرات ئەینووسی کە هاتە دەرۆ وەزیر وتی ئەوە چیە بیدە بە من با بیبەم لێی وەرگرت و ڕۆیی. جەللاد وتی: ئەم نامە نووسراوە بت کوژم و پێسەکەت پڕکەم لە کا. لە وەختی خۆیا پیاوە ساڵحەکە هاتۆ بۆلای حاکم و وتی: بە لامۆ عەجایبە کە تۆ هاتی بۆ جێی خۆت ئەی ئەمە پێسەکەی تۆ نیە پڕی کراوە لە کا وتی: نەوەڵڵا. حاکم وتی: ئەی نامەکەت چی لێ کرد؟ وتی: کە نامەکەت بەدەسخەت خۆت بۆ نووسیم وەزیر وتی: ئەو نامە بدە بە من با من بیگەیێنم، ئەو بردی. حاکم وتی: دەی ئەمە پێسەکەی ئەوە. دووبارە حاکم وتی: ئەو ڕۆژە هاتی بۆلام و سەرت هانیە بەرۆ بۆچی دەست گرت بە دەمتۆ؟ وتی: پێش ئەوە بێم وەزیر دەعوەتی کردم و سیری دەرخوارد دام، دەسم گرت بە دەممۆ بۆ ئەوەی بۆی سیرەکە نەیێ بە سەرتۆدا. حاکم وتی: دەی خراپ کار بە جەزای خراپەی خۆی گەیی، ئەو لای من بوختانی کرد بۆ تۆ کە تۆ دەم من بە بۆگەن ئەزانی بۆیە ئەونامەمە نووسی کە بتکوژن. خوای گەورە بێتاوانی لادا و تاوان باری پێوە کرد.

چاکەن کە بۆ خۆی وا لە بێخ چاوۆ ئۆخخەی ئیتر من مانووم حەساوۆ

* * *

«۷۰»

## والی سنە

لە کتێبی «یادی مەردان»ی مامۆستا مەلا عبدالکریم مدرس لە باسی شێخ «عبدالرحمن» کوڕی شێخ عوسمانی تەوێڵەدا نووسیویەتی: شێخ عبدالرحمن «ابوالوفا» کوڕی دووهەمی شێخ «سراج الدین» بووە لە پێنجەمی موحەڕڕەمی ساڵی

۱۲۳۵دا له تەوێڵە له دایک بووە و له ۱۲۸۵ فەوتی کردووە و مەرقەدی وا له بەغدا لە خزمەت حەزرەت غەوسا. کە وەختێ غولامڕەزا قولیخان والی شاری سنە بووە و برای غولامشاخان بووە و هەردُووکیان کوڕی خەسرەوخان کوڕی ئامانەڵاخان ئەردەڵان والی شاری سنە بوون. کە مزگەوتی جامیعەی شاری سنەی دروس کردووە و لە ساڵی ۱۲۲۷دەستی پێ‌کردووە و لە ساڵی ۱۳۲۸ ش، دوایی هاتووە و بە وشتر ئەو بەردە مەڕمەڕانەی لە قسڵان و دڵبەرانۆ لای قورووەوە بۆی هێناوە. بە نۆبە غولامشاخان و رەزا قولیخان والی شاری سنە بوون. غولامشاخان لە نۆبەی خۆیا ئەیەوێ وەکوو خۆی خەڵکی ئوستانی کوردستان بە زۆر بکا بە شێعە. دەعوەت ئەکا لە کەریمخان قازی هەمەدان بێ بۆ سنە و دەرسیان دابا بۆ شێعەگەری. با بزانین کە غولامشاخان کچەزای نەسرەدین‌شا بووە و لە دەرباری ئەودا بەخێو بووە و هەڵقەی غولامی ئەوی لە گوێدا بووە و گوێ لە مشتی ئەو بووە. ئەهلی سنە ناچار ئەبن پەنا ببەن بە شێخی «سراج الدین»ی تەوێڵە و ئەویش شیخ «عبدالرحمن»ی کوڕی و مەولەوی و دەستەیێ لە مەلای ئەو وەختە ئەنێرێ بۆ لای غولامشاخان بۆ تکا کە وازبێنێت و لەو خەیالە پەشیمان بێتەوە. کە سنەیی ئەبینن ئەو کۆمەڵە هاتوون بۆ سنە بۆ ئەو مەبەستە ئەچن بە پێشوازیانۆ و هەرکە بڕئەکا ئەڕوا، حەفتەیێ لە سنە ئەمێننەوە هەموو رۆژێ ئەڕۆن بۆلای غولامشاخان و هەرچێ ئەزانن و ئەتوانن تکای لێ‌ئەکەن کە پەشیمان بێتەوە، وەری ناگرێ تـ ئاخری بە دڵ‌گرانی سنە بەجێ‌یەڵن و ئەڕۆنۆ بۆ تەوێڵە.

دوای ئەوان کە غولامشاخان ئەنێرێ بە شوێن قازی کەریمخان هەمەدا نایێ و دوای ماوەیێ غولامشاخان بە ناکامی دونیا بەجێ‌یەڵێ و ئەڕوا.

| | |
|---|---|
| یا ئەبێ سازی یا ئەبێ سـووزی | دونیا هەر ئەڕوا چیەکەی لە سـۆزی |
| مەبە بە فیتنە، مەکەوە ناو خەڵک | بە واتە و ویتەی ناشەرعی و بێ‌کەڵک |

* * *

«٧١»

## ئیحتیرامی باوک

له خزمەت مامۆستایەکا ئەمانخۆند، ئەیفەرموو: له مەهابادا ئەمانخۆند من موستەعید بووم، سووختەیەکمان بوو ئیزهاری ئەخۆند زۆر زیرەک و خوێنەوار و کوڕە خاسه بوو، رۆژێ میوانێکمان هات نەناسیاوێ بوو له لیباسی کاریگەریدا، هەر هاتە ژوورۆ سوختەکە تێک‌چوو، هەموومان بە رووخۆشی و بە گەرمی بەخێرهاتنمان کرد ئەو نەبێ. میوانەکە چووبۆ لایۆ وتی: رۆڵە چۆنی چاکی. وتی: من تۆ ناناسم. وتی: ئەی تۆ کوڕی من نیت؟ وتی نەخێر، من نازانم تۆ کێیت، وتی: ئەی تۆ فلانە کەس نیت که دایکت ناوی فلانە، له ماڵ منا له باوەش دایکتا بەخێو بووی؟ وتی: نەخێر ئیشتیبا گرتووتە. میوانەکە وتی: تۆ کوڕی منی و ئیسە سێبەری خۆت لێ‌گۆڕاوە. له داخا دەسی‌کرد بە گریان. ئێمە دەورمان لێدا و وتمان: تۆ باوکی ئێمە بە، کاممانت ئەوێ کوڕی تۆیە وتی: من کوڕی خۆم لێ تەوللایە، چۆن کوڕی خەڵک ئەبێ بە کوڕم. بە هەرجۆر بوو تا بەیانی لە ناومانا رۆژی کردۆ. بەیانی دوای نان و چایی خوا حافیزی کرد و دەستی گرت بە لاشیپانی درگای حوجرەکەوە و وتی: فەقێکان بەو قورئانە خۆندووتانە مەگەر دایکی دۆڕانبێتی ئەگەرنا ئەو کوڕە لە منە و من باوکی ئەوم، داوا ئەکەم لە خوا کە هیچێ حاڵی نەبێ، ئیتر رۆیی. دوای ئەوە هەرچێکی ئەزانی لە بیری چوو و بە هەزار حاڵ تا ئێوارە دوو سێ خەتمان پێ رەوان کردایێ. ئەو مامۆستا ئەیفەرموو: من لەم دێدا مەلا بووم باوکم لە لیباسێکی وەکوو باوکی ئەوا هات بۆ دیدەنم من زۆر ئیحتیرامم لێ‌ئەگرت بە یەکۆ ئەڕۆین بۆ دیوەخانی ئاغای ئەم دێیە هەموو وەختێ ئەم خستە بەرخۆمۆ کە ئەگەیینە درگای دیوەخان ئەیوت: من ئیجازەت ئەدەم ئەبێ لێرەدا کەویتە بەرۆ لەبەر ئیحتیرامی مێزرەکەت.

| | |
|---|---|
| باوکت کە ژیر بوو تۆی کرد بە مەلا | لای‌دا لە ئەرک و زەحمەتی فەلا |
| تۆیش بەوەفابە بۆ ئەو، کاک مەلا | پشت رێگە مەگرە و مەبە تەوەللا |
| لای خوای گەورە ئەو تابە باشە | کە بە ئیمانە و کردەوەی باشە |
| هەموو بە کفنۆ ئەڕۆینە ناو گۆڕ | لیباس لە گەڵمان نایێتە ناو گۆڕ |

* * *

«٧٢»

## شێخ مارفی نەرگسەجاڕ

مامۆسا مەلا کەریم مودەڕڕیس لە یادی مەردانا لە بەرگی دووهەما لە باسی شیخ مارفی نەرگسەجاڕییا ئەفەرمێ: ئەو زاتە کوڕی «شیخ عبدالرحمن»ە دایکی ناوی پیرۆز خانم،کچی حوسەین بەگی ساحێب قەرانی سولەیمانی بووە لە دەوروبەری سالی ١٢٨٠ق دا هاتووەتە دونیاوە و بووە بە مەلایێ چاک و مودەڕڕیس. تەمەسسوکی کردووە بە شیخ «ضیاءالدین» بیارە و بووە بە خەلیفەی، شیخ مەعرووف یەکێ بووە لەو پیاوانەی کە زۆر بە وردی پەیڕەوی شەریعەتیان کردووە. تا پێی کرابێ بە دەسنوێژۆ وەختی بەسەر بردووە و نوێژی بە جەماعەت کردووە و ڕەواتیبەکان و سوننەتە موقەییەدەکانی بەجێ هێناوە و تەریقەتی کەسی دانەداوە، تا بە تەواوی فێری ئادابی دینی نەکردبێ. تەنانەت ژنانی کۆکردووەتەوە و نوێژی پێ ڕەوان کردوون لە گەڵ ئادابی دینا. نموونەیەکی دڵ فەراوانی شێخ مەعرووف ئەوە بووە بیستوومە: کوڕێکی بووە ناوی سەیید ئەحمەد بووە بە هەرزەکاری مردووە، پاش ژن هێنانی بە ماوەیەکی کەم. دەسێ جل تازەی بووە دایکی دایناوە بە سەریا گریاوە شیخ مەعرووف پێی وتووە: من لە بەریان بکەم چاترە لەوەی تۆ وا رایان خەیت و بەسەریانا بگریت. کردوونیەتە بەری و سوار بووە و چووە بۆ شوێنێک لە دەور و بەری نەرگسەجاڕ، تووشی کابرایەکی هەژار ئەبێ شتێکی وای لەبەرا نابێ جلەکانی بەری خۆی دائەکەنێ و ئەیاندا بەو و عاباکەی لە خۆیەوە ئەپێچێ و ئەگەڕێتەوە بۆ نەرگسەجاڕی لای شارەزوور.

هەروا بیستوومە جارێکیان لەو وەختا کە لە ئەحمەدبەرەندە ئەبێ فەقێکان دڵی خێزانی ئێشێنن، ئەویش هەڵەسێ ئەگەڕێتۆ بۆ ماڵی باوکی لە ئاوایی «دەق»، لە ڕێدا تووشی شیخ مەعرووف ئەبێ و ڕووداوەکەی بۆ ئەگێڕێتۆ ئەویش ئەڵێ تا نەگەڕێیتۆ بۆ «ئەحمەدبەرەندە» و دڵی فەقێکان نەیێنیتۆ جێ و ئاشتیان نەکەیتۆ سەر بە ماڵی خۆمدا ناکەیت. من کە فەقێ دڵیان لێم بێشێ ئیتر ژیانم بۆچیە؟ ئیتر خێزانی بە ناچاری دێتۆ دواوۆ و ئەڕۆنۆ دڵی فەقێکان دێننە جێ. لە حەدیسا هەیە کە فەقێ

به هەر شوێنێکا بڕۆن مەلایکە باڵ رائەخا لە بەر پێیانا لەبەر ئەوە رازییە بەو کارە کە ئەیکەن.

فەقێ و مەلا فریشتەی رووی زەمینن — لە دینا هەڵگر بەیاخی دینن
هەرکەسێ دینی ئەوێ ئەوانیشی هەرئەوێ — وەکووشێخی بیارە بەبێ‌ئەوان ناسرەوێ

* * *

«٧٣»

## ئیحسان بۆ مردوو

موسوڵمانێک و مووسایێک بەیەکۆ ئاشنا و رەفێق بوون رۆژێ فەقیرێ تووشیان بوو، داوای خێری لێ‌کردن موسوڵمانەکە بیست تمەنی پێدا و وتی: بەخێری باوکم. مووساییەکە وتی: ئەم خێرە ناڕوا بۆ باوکت. وتی: باوکت ناوی چیە؟ وتی: ناوی فلانە، بە ناوی خۆی دای‌پلۆسی و شەش حەوت جوێنی سفتی پێدا. مووساییەکە هەڵەشە بوو هەڵسا هەڵچوو لە موسوڵمانەکە. جا بە مووساییەکەی وت: تۆ ئەڵێی خێر بە مردوو ناگا، چۆن جوێنی بۆ ئەڕوا! ئیتر بەوجۆرە بێ‌دەنگ ئەبێ. چۆن ئیحسان ناڕوا بۆ مردوو خۆ لە جەژنە قوربانێکا پێغەمبەرﷺ دوو بەرانی شاخداری چاکی سەر بڕی، بۆ ئەوەلیان فەرمووی: «بسم الله» ئەم قوربانیە بۆ موحەممەد و خێزانی ماڵی، بۆ ئەویشیان فەرمووی: ئەمە بۆ ئەوکەسانە لە ئوممەتم کە دەسیان ناڕوا قوربانی بکەن. جا چۆن ئیحسان ناڕوا بۆ مردوو کە ئیجماعی عولەمای شەریعەت و تەریقەتی لە سەرە و لە سەراسەری مزگەوت و خانەقا و تەکیەکانا تا ئێستە فاتیحەیان بۆ مردوو ناردووە و لە دوای نوێژەکان و لە مەجلیسی سەرەخۆشی و بە تایبەت خەتمە و حەلقەی زیکریان بە کۆمەڵی بووە و عولەماکان شەریعەت و تەریقەت بەشدارییان کردووە و قورئانیان خوێندووە و ئیحسانی ئەوانەیان ناردووە بۆ ئەوانەی لە سیلسیلەدا خوێنراوەتەوە. ئێستە بازێ بە کرێ‌گیراو بۆ تێکدانی ئیسلام، پەیا بوون ئەڵێن: فاتیحە و ئیحسان بۆ مردوو ناڕوا! چی لە فاتیحە و قورئان خوێندن باشترە پێمان بڵێن با بیکەین؟. لە دوایدا داوایان لێ‌ئەکەم ئەو بەرانبەرکێ کە لەگەڵ موسوڵمانان ئەیکەن بڕۆن لە گەڵ ئیسرائیل و ئامریکادا

بیکەن کە کافری حەربی و عەلەنین. لەوان پارە وەرنەگرن بۆ کوشتن و تالان کردن و ئەزیەتدانی موسولمانان.

نۆکەری کافر مەکە بۆ پارە — دینت مەفرۆشە بەوان بە پارە
مەبە بە دوژمن بەرەی موسولمان — بۆ دڵ خۆش کردن کافر بێ‌ئیمان
جیرەی وشک و تەڕ وەرمەگرە لەوان — مەڕۆرە کەوان بە مەیلی ئەوان

* * *

«٧٤»

## فیلبازی ریوی

رایێ ریوی ئیمامی شافیعیشی خەڵەتان. بەم‌جۆرە: ئیمامی شافیعی لەگەڵ چەن کەسێکدا لە سەفەرا بوون، مانوو بوون و برسییان بوو، لایاندا شوێنێ بۆ ئیستیراحەت، سفرەیان داخستبوو بۆ پێخۆریان دوو مریشکی کولاویان پێ بوو لە سەر سفرە دایان‌نا و وتیان دوای نوێژەکەمان نان ئەخۆین. ریوی فرسەتی هێنا یەکێ لە مریشکەکانی برد تا نوێژیان کرد خواردی و هاتۆ گردمۆڵکەیەکی بە دەمەوە بوو وایان زانی مریشکەکەیە هەموویان رایان کرد بۆلای مەنزڵەکە چۆڵ بوو پێچێکی لێ‌داو هات ئەوی تریشیانی برد و خواردی ئیتر ئەو ژەمە بێ پێ‌خۆر نانیان خوارد.

ریوی فیلاوی ژن مەکر بازە — تا پێت ئەکرێ کچیان لێ‌خوازە
کچیان کەم فێڵە و بە کەم رازییە — بێوەژن لە تۆ هەر نارازییە
ئای لە بێوەژن چەن مەکر بازە — کۆنە ئەفرۆشێ بە نرخی تازە

* * *

«٧٥»

## بڕینی سیلەی رەحم لە خزم و خویش

رۆژێ پیاوێکی پارەدار ئەرۆیی بۆ سەفەر حەزی ئەکرد پارەکەی لەگەڵ خۆی نەبا پیاوچاکێکی بەدی کرد کە پارەکەی لایا دانێ. بردی دایە دەسی بێ‌خەم رۆیی تا هاتۆ پیاوچاکەکە مردبوو کە ئەیپرسی لە قەوم وکەسی ئەیان‌وت: هیچی لەلای ئێمە نەوتووە. ناچار بوو رۆیی بۆ خزمەتی عالمێ بەناو بانگ. وتی کارەساتێ وام بەسەرا هاتووە بە تەگبیری تۆ چی بکەم، وتی: ئەو پیاو چاکە وا دیارە لە

بەهەشتا بێ برۆ بۆ سەری بیری زەمزەم بانگی کە جوابت ئەداتۆ و لێی پرسە بۆ پارەکەت. رۆیی بۆلای بیر زەمزەم هەرچێ بانگی کرد جوابی نەبوو. رۆییەوە بۆلای مەلاکە وتی: لە بیری زەمزەم جوابی نیە، وتی: برۆ بۆ سەر بیری هارووت و مارووت (لە چل کیلۆمەتری بەغدایە) لەسەر جەهەننمایە جوابت ئەداتۆ. رۆیی لەو بیرە بانگی کرد جوابی داوو پرسی پارەکەت چی لێ کرد، خۆ قەوم وکەست لێی بێ خەبەرن؟ وتی: وا لە فلان جێگەدا برۆ دەری بێنە، لێی پرسی ئێمە بەتەما بووین تۆ لە بەهەشتا بی بۆچی وای لە جەهەننەما. وتی: لەبەر ئەوە کە قەوم و کەسم بوو و هاتووچۆم نەکردوون و قەتعی رەحمم کردوون وا گرفتاری جەهەننم بووم. دوای ئەوە بەم رازۆ رۆیی بۆلای کەسووکاری و ئازادیان کرد. دوای ئەوە رۆییە سەر بیری زەمزەم بانگی کرد. جوابی داوۆ و وتی: خوا رزگارت کا کە منت رزگار کرد لە جەهەننم.

ژیان بەقەومو عەشرەتۆ خۆشە　　بۆ قەومی راسی دلم بە جۆشە
قەوم خراب وەکوو گونی قۆڕ وایە　　بە دوایۆ دایم بەزم و هەرایە
ئەگەر ئەیبڕێ زوو سویت ئەبێتۆ　　نایبڕێ هەرگیز لەتۆ نابێتۆ

❊ ❊ ❊

«٧٦»

## بێ گوناح بێ تاوانە

بەپێی نووسینی موسەننیف چۆڕی لە ئاخری کتێبی «ریاض الخلود»دا کە بە شیعر نووسیویەتی، بالوولە شێتەی دانا لە بەغدا منالان زۆریان بۆ هانی کە گەمە و لاقرتێیان پێئەکرد. بەغدای بەجێ هێشت رۆیی بۆ «بەسرە» کە گەییە بەسرە زۆر هیلاک بوو، رۆیی لە کەلاوەیەکا راکشا تا بەیانی لە نیوە شەودا لاشەی پیاوێ کوژراویان لە پالیا راکێشا و رۆین بەیانی کە بەخەبر هات تەماشا ئەکات گشت گیانی هەلژناوە لە خوێنی ئەو کوژراوە بەیانی کە تازە رۆشنی کردبوو قەوم و کەس کوژراوەکە کە ئەگەڕان بە شوێنیا تەماشا ئەکەن وا لەو کەلاوەدا و ئەم نەفەرە لە لایا خوێناوی بووە و لاشەکەی ئەبەن و بالوول بە لێدان و زەحمەتدان ئەیبەن بۆلای قازی کە خوێنەکەی پێوە ئەبینێ، ئەیکا بە دەلیل و حوکم ئەکا کە

..............................................................................

ئەم قاتڵە. ئەیبەن بۆلای دار قەباخ لە داری بەن. ئەویش ئەڵێ وازم لێ بێنن تا دوو رکات نوێژ کەم. مۆڵەتی ئەدەن تەمەننا ئەکا لە خوای گەورە کە من بێ‌تاوانم خوایا بە هاوارمۆ بگە و رزگارم‌کە. لە کوتوپڕا سواری بە پڕتاو یێ ئەڵێ ئەوە چی ئەکەن؟ ئەڵێن ئەم قاتڵە ئەکوژین. ئەڵێ مەیکوژن ئەو قاتڵ نیە من قاتڵی ئەو پیاوەم. ئەیگرن ئەڵێن تۆ بۆچی هاتی ئەم ئیقرارتە کرد؟ وتی: وەختێ ئەم پیاوتانە هاورد بۆ لای دار ئیعدامی کەن، کۆمەڵێ مەئموور هاتن جەهەننمیان پێ نیشان دام وتیان نەڕۆی ئیقرارکەی هەر بە زیندووی ئەتخەینە ناو ئەم جەهەننمە، منیش لە ترسا هاتم ئیقرارم کرد. قەرار ئەدەن ئەو ئیعدام کەن، ئەپرسن لە بالووڵ تۆ کێیت کەوا خوا هات بە هاوارتۆ؟ ئەڵێ: من بالووڵم. ئەکەونە خاک و پای و داوای لێ‌بووردنی لێ‌ئەکەن کە نەمان‌ناسیوی، بمان بەخشە ئەویش ئەڵێ: ئەم پیاوە نەبەخشن و ئازادی نەکەن ئەبێ من بکوژن. ئەوانیش ئەیبەخشن بە بالووڵ و لە کوشتن ئازادی ئەکەن.

| | |
|---|---|
| بێ تاوان کەسێ ناڕواتە پێی دار | پیش‌ڕوا خوا خۆی نایکا گرفتار |
| هەروەکووبالووڵ رزگاری ئەکا | بۆ یەکێ‌تریش تکای خێر ئەکا |
| بڕوانە رەحمی چەن فەراوانە | چۆن پشتیوانی بێ تاوانانە |
| ئێمەیش ببخشە ئابەو پیاوانە | بەبێ بیانوو و عوزر و بەهانە |

❊ ❊ ❊

«۷۷»

## ژنی ژیریش هەیە

لە تاریخی «آیة الله مردوخ»دا نووسراوە: لە وەختی حکوومەتی خان‌ئەحمەدخانا فەتحی گەورەی زۆری کردووە، لە سنەوە ملی ناوە بۆ تەوریز و هەرشارێ سەرپێچی ئەمری حکوومەتیان کردبێ فەتحی قەڵاکانی کردووە ناچاری مل شۆڕ کردنی کردوون تا لەولای تەوریزۆ قەڵایێ مەحکەمیان تووش ئەبێ گەمارۆی ئەدەن تا چوار مانگ بە هێچ جۆرێ خۆنادەن بە دەسۆ. خان ئەحمەدخان و دەسەکەی مانوو ئەبن و زەخیرەیان تەواو ئەبێ، خان ئەحمەدخان لەگەڵ چەن نەفەرێ لە سەرۆکەکان لە هۆردووەکە دوور ئەکەوێتۆ بۆ تەگبیری راکردن. تووش ژنێ روو هەڵچڕاو و قەشمەرە ئەبن، ئەڵێن نازانین بۆچی ئەم قەڵامانە بۆ ناگیرێ.! ئەڵێ: کاری حیزەڵەیی خۆتانە شووەکەی من لە ئێوە ئازاتر بوو من لەو قەڵا

مەحکەمتر بووم شووەکەم بە مل بوو نەترسا خۆی پێوەنا و گرتی. ئێوەیش ئەگەر وەکوو ئەو بە مل بوایەن هەر زوو گرتبووتان، وتیان: بە مەزەنەی تۆ لە کوێوە رێی تێئەچێ ئەم قەلامانە بۆ بگیرێ؟ وتی: ئا لەو پلانۆ. قسەی ئەو ژنە زۆر کاریگەر بوو لە دڵیانا. لە راکردن پەشیمان بوونۆ و بە پرس و رای هەموویان شەوێ لە سەحەری بەیانیا لە هەموو لایەکەوە هێرشیان کردە سەریان، ئەووەڵ جار لەو پلەوە فەتحیان کرد کە ژنەکە وتی.

خان ئەحمەد خان خۆی ژیروعاقڵ بوو — بە قسەی ئەو ژنە هیچ ماتڵ نەبوو
هوجوومێکی کرد بۆسەر ئەو قەلا — رۆیی زوو گرتی بێدەرد و بەلا
ئافەرین دادە لە بۆ تەگبیرت — کە خانت جوولان بە فیکری ژیرت

* * *

## برسیەتی و ماڵی دونیا، کامیان؟

شێخی سەعدی رەحمەتی خوای لێ بێ لە گوڵستانا ئەیگێرێتۆ ئەفەرموێ: رۆژێ بە بیابانێکا ئەرۆیم زۆرم برسی بوو لە کوتووپڕا کیسەیەکم دۆزیەوە هەرگیز ئەو خۆشیمە لە بیر ناچێ کە وام ئەزانی «برێشکەی» گەنمە برژاوە، کە کردمۆ هەرگیز ئەو ناخۆشیمە لە بیر ناچێ کە مرواری بوو.

بۆ شەخسی مانوو و برسی برێشکەی گەنمە برژاو
لە مرواری باشترە بە تەجرەبەی گەورە پیاو
ئەم هەموو نان و ئاو و مێوەجات و نیعمەتە
هەرکەسێ شوکری نەکا نەدامەتیە و نەگبەتە

* * *

«٧٩»

## بێگانەی باش و هاوماڵی خراپ

مامۆستایێ ئەیگێراوۆ کە لەزەمان رەزاشا دا گلەییم کرد لە سەرهەنگ مەریوان کە زۆر خراپن لەگەڵ میللەتا. مەسەلەن نەفەرێ مەریوانی ئەرِوا بۆ پێنجوێن بۆ لەوازم ماڵی خۆی سێ چوار گروانک چای و شەش حەوت کەلە قەن و چەن گەزێ پارچە بە هەرزان لە پێنجوێن ئەسێنێ بۆ ماڵی خۆی چ زەرەرێکی بۆ دەولەت و میللەتی ئێران هەیە کەچی مەعموور ئەرِۆن لە رێدا ئەیگرن.

سەرهەنگەکە وتی: خەتای میللەتە من لە ماڵی خۆما خەوتووم چووزانم کابرایێ لە دێی خۆیا چووە بۆ پێنجوێن، هاوماڵەکەی خۆی خەبەری لێ ئەدا و ئەڵێ: لە فلان ڕێوە ڕۆیوە و لە فلان ڕێوە یێتۆ و منیش مەجبوور ئەکا کە تەعقیبی کەم. سەرهەنگەکە وتی: لەم زستانا ڕۆژێ با وکرێوەی عەجایەبی ئەکرد لە دەرگای حەوشا وێسابووم قاچاخ فرۆشێ سەری لێ شێوا بوو بە نەزانی خۆی کرد بە ماڵی ئێمەداکە چاوی کەوت بە من زۆر ترسا منیش سەربازێ کە لەبەر دەسما بوو وتم: بیبە ئەو ئوتاقە گەرمە خزمەتی بکەن و چای بەنێ تا لێی ئەپرسم. شەو و ڕۆژێ خزمەتمان کرد تا خۆشی کردۆ ڕۆییم بۆلای وتم: بۆ کوێ ئەڕۆی؟ وتی: بۆ کۆماسی. وتم: خۆت گورجۆکە کۆڵەکەت و تفەنگەکەت هەڵگرە دوو سەربازم نارد لەگەڵیا، وتم: تا لە شار دەریەکەن و لە ترس مەئموور، بڕۆن لە گەڵیا با ئەزیەتی نەکەن. سەرهەنگ وتی: لە دەس خۆمانا بێ ئاواینە ئەگەر ئێوە وازمان لێبێنن.

مەئموورئەتوانێپیاوەتیبکا هەتاکووهاوماڵ فیتنەیی نەکا
ئەم دونیا فیتنە ئەیدابە یەکا خۆی ڕوورەش دونیا و قیامەت ئەکا

* * *

«٨٠»

## گێسکەکەی ئەخفەش

ئەخفەش کە عالمێ گەورە و ساحێب ڕەئی بووە لە عیلمی نەحوا لە سالی٧٩٣ ق لە دایک بووە. ئەڵێن لە هەوەڵ مەلایەتیۆ فەقێی نەبووە دەرسی پێبڵێ هەموو ڕۆژێ گێسکێکی لەلای خۆیا بەستوەتۆ دەرسی وتووە بەو گێسکە و ئەوە شاگردی بووە شاگردەکە هیچی حالی نەبووە، ئەخفەش بە سەعی خۆی بووە بە مەلایەکی چاک، ئێستەش کەسێ لە خزمەت مامۆسای چاکا بێت و هیچی لێ حالی نەبێ، ئەڵێن ئەمە گێسکەکەی ئەخفەشە.

ئەخفەش بە سەعی و بە کۆششی خۆی گەیی بە پایەی عیلمی نەحوی خۆی
گێسکە ئێستیعداد لە تەنیا نەبوو ئەو هەموو دەرسەی بە خەسار دەرچوو

* * *

«٨١»

## مەلا ئەبووبەکری پیرڕۆسەم

مەلا ئەبووبەکری پیر رۆسەمی «پیر رۆستەم دێیەکە لە تەرەف رەواندوز» زۆر عالم بووە دوو کتێبی بە ناو «وضع و استعارە» کە زۆر کتێبێ باشن و فەقێ ئەیخوێنن لەو وەختا کتێبەکانی داناوە بە ناو یەکێ لە مەلا حەیدەریەکانۆ ناوی ناوە. کە لە تەرەف مەلا و فەقێکانۆ قبووڵ کراون و خوێنراون لە دوای ئەوە وتوویەتی: کەسێ‌تر ئەم دوو کتێبەی دانەناوە من نەبێ ئەم مەلا ئەبووبەکری پیر رۆستەمییە لە قەرنی سیانزەی قەمەریا فەوتی کردووە. لە گەڵ مەلا ئەبووبەکری چۆڕیدا لێت نەگۆڕێ ئەو لە ١٠١٤ فەوتی کردووە.

*** 

«٨٢»

## رەزایەتی خوا

فەقێیێ پرسی لە مامۆساکەی ئەکرێ من بزانم خوای گەورە لێم رازییە مامۆسا؟ وتی: نەخێر، ئەوە لە عیلمی خوایە کەسی‌تر نایزانێ. فەقێکە وتی: لەوانەیە من بزانم ئەگەر من لە خوا رازی بم خوایش لە من رازییە، ئەگەر لەو ناڕازی بم ئەویش لە من ناڕازییە. مامۆسا وتی: هەروایە کە تۆ ئەیزانی. لەبەر ئەوە لە قورئانا «راضیە» وا لە پێش «مرضیە»دا.

یا خواله ئێمەولەوان رازی‌بێ بۆموشکڵ‌هەموان هەرخۆی‌قازی‌بێ

*** 

«٨٣»

## لەززەتی دونیا و بەهەشت

لەبەغدادا زاهیدێ بوو رۆژێ لە رۆژان سوارەی هارونەڕەشید بەفیز و دەمارۆ لە بەرامبەر ماڵ ئەو زاهیدۆ کە تەرکی دونیای کردبوو تێپەڕیان کرد. زاهیدەکە دەنگ و هەرای سوارەکانی بیست بەو هەراوۆ لە ماڵ هاتەدەرۆ. چاوی پێ‌کەوت و وتی: ئەی زاهید تاکەی لە مزگەوتۆ جێی عبادەت نایێتە دەرۆ و تەرکی لەززەتی ئەم دونیا ئەکەی. زاهیدەکە تەماشای هاروونی کرد و وتی: تۆ لە

.............................................................................

من زاهیدتری، هارون سەری سڕما و پرسی: چۆن ئەڵێی؟ زاهیدەکە وتی: من نیسبەت بە دونیا لەزەتم تەرک کردووە و کردوومە بە پیشەی خۆم، لە حاڵێکا دونیا هەموومان ئەزانین کە روو لە فائیە و وەفای نیە. ولێ تۆ لەزەتی بەهەشتت تەرک کردووە لە حاڵێکا کە بەردوام و هەمیشەیی‌یە خۆشی ئەم دونیا لەبەرابەر خۆشی ئەو دونیا زۆر کەم و بێ قیمەتە.

تەرکی دونیا کە دونیا فانییە | وەفای بۆهیچ کەس نەبووە و نیە
بە راسی رووی دڵ هەرلەخودا کە | هەرچێکت نیە لەوی داوا کە
ئیتر بێ خەم بە بۆ هەمۆ کاتێ | غافڵ لە زیکری مەبە هیچ ساتێ

❊ ❊ ❊

«٨٤»

## هیممەت و کۆشش

سەکاکی یۆسف کوڕی ئەبووبەکر خوارەزمی لە ساڵی ١١٦٠میلادیا لە دایک بووە لە ساڵی ١٢٢٨میلادی لە خوارەزم فەوتی کردووە (المنجد). سەکاکی نەخۆنەوار و عەوام بوو، کە تەماشای کرد لە چەن کۆبوونەوەیێکا چ حورمەتێ لە عالمەکان ئەگرن. لە دڵ خۆیا بڕیاری دا کە بڕۆ بۆ خوێندن. لە هەوەڵو هیچ پێشکەوتنێکی لە خۆیا نەئەبینی لە دەرسەکانیا. زۆر مەلوول بوو تەرکی مەدرسەکەی کرد. تا رۆژێ لە جێیێکا تەماشای بەردێکی کرد کە تکەی ئاوێ بە دەوام کونی تێ‌کردبوو، لە دڵ خۆیا وتی: خۆندن لەم بەردە رەق‌تر نیە و منیش لەم ئاوە نەرمتر نیم. ئەڕۆمۆ بۆ خۆندن بەهرەوەر ئەبم. هاتۆ کەڕەتی دووهەم دەسی کردۆ بە خۆندن. دوای ماوەیێ بوو بە عالمێ بەرز کە لە عیلمەکانا بوو بە ساحێب رەئی و ساحێب نەزەرە.

وەکوو سەکاکی وابە بۆزانین | فێری زانین بە بە گوێرەی توانین
با ناوت لە ناو عالمانا بێ | هەتا هەتایە بمێنێ و بێ

❊ ❊ ❊

«۸۵»

## ریا

مزگەوتێکی چاک دروس کرابوو لە شارێکا، بالـووڵ سوئالی کرد کێ بووە بە سەبەب دانانی ئەم مزگەوتە؟ یەکێ جوابی داوە و وتی: من ئەم مزگەوتمە دروس کردووە تەنیا بۆ رەزای خوا و دەس کەوتنی سەواب لەو. گەرەکی بوو بالووڵ ئەندازەی ئیخلاسی ئەو پیاوە تاقی بکاتەوە لەم کارا. دەسووری دا بەسەر درگای مزگەوتەکەوە نووسییان ئەم مزگەوتە موبارەکە دروس کرا بە خەرجی موسوڵمانێکی خێر خواز، کە ناوی بالووڵە. لە رۆژی داهاتوودا ئەم خەبەرە بڵاوبوو، چەن کەس هاتن بۆ پیرۆزبایی بۆلای بالووڵ. سەبەب کاری مزگەوتەکە ئەم دەنگوباسەی بیست زۆر تورە بوو هات بۆلای بالووڵ وتی: تۆ زۆر فێڵاویت من سەر و ماڵم لە پێی ئەم مزگەوتا داناوە کەچی لە سەمەرەکەی بێبەش بووم. تۆ مفت و مەرحەبا بە ناو خۆتۆ نووسیوتە و خەڵکی بە ناوی تۆوە ناوی ئەبەن ئەمە کارێکی زۆر ناجۆرە. رۆژی دوایی خەڵک تەماشای دیواری مزگەوتەکەیان کرد ناو بالووڵیان لابردووە و ناوێ تریان لێنووسیوە لە جێیا. کە بالووڵ ئەم خەبەرەی بیست پێکەنی و ئەم حەدیسیە خۆندۆ «کردەوە بە گوێرەی نیەتە».

عەمەلێ ئەکەی با بۆ خوابێ  دوور لە دەمار و فیز و ریا بێ
بەشکووقەبوولی درگای خوابێ  باعیس سەربەرزی هەردوودونیا بێ

* * *

«۸٦»

## تەماع و زەحمەت

رۆژێ پیاوێ بە رێیێکا ئەرۆیی بەردێ گەورەی تووش بوو لێی نووسرا بوو ژێر ئەم بەردە خەزینەیێکی واتیا هەرکەس بتوانێ بێ تلێنێ بیبا بۆخۆی. کەوتەسەر تەماع بە زەحمەتێ فەراوان تلانی، تەماشای ئەو دیوی کرد لێی نووسرا بوو زۆر خۆمانوو کردن بۆ تەماع هەیە کە غەیر زەحمەت قازانجێکی تری نیە. کە زانی خەزێنەکە هەر ئەو مۆجگارییەتە لە داخی زەحمەتەکەی خۆی ئەونە سەری ماڵی بە بەردەکەدا تا گیانی دەرچوو سەر و ماڵ تیا چوو.

دایەنیٚ تەماع، کار نەمرود و جەمە      تیٚری پیٚناخوا هەر ئەڵیٚ کەمە
لایبە ئەم دونیا ئاخری خەمە      ئیٚش و نەخۆشی و دەرد و وەرهەمە
رووکەرە درگای پەروەردگارت      بۆ هەردوو دونیا ئەوە رزگارت

＊＊＊

«٨٧»

## فەزلی خوا

زوبەیدە خانم کچی جەعفەر ساڵی ٢١٦ لە دایک بووە شووی کرد بە هاروونەڕەشیدی کوڕی مەهدی ئامۆزای لە بەنی ئومەییە، دایکی ئەمینی کوڕی هاروونەڕەشید بووە کە دوای باوکی بووە بە خەلیفەی ئیسلام لە جیٚ باوکی زوبەیدە. مەشهوور بووە حوکم ڕەوا بووە زۆریش حەزی لە جەواهیٚر و خشڵ کردووە. کەرەم و بەخششی لەگەڵ عولەما و شاعیرەکانا زۆر بووە و خزمەت و ئیحسانی بە مزگەوت و فەقیر و لیٚقەوماو زۆر کردووە. ئاوی فوڕاتی بەغدای بە نەقشەی زانای ئەو زەمانە لە بەغدادۆ بردووە بۆ مەککە کە ڕیٚبواری ئەوبەینە لەو ئاوە تیٚراو بوون و ئەهلی مەککەیشی پاڕاو کردووە. ئیسەیش ئەو ئاوە هەر هەیە. خوا جەزای خیٚری باتۆ. زانایان ئیمڕۆ سەریان دەرناچیٚ و نازانن چۆن ئەو جۆگە ئاوە دروس بووە. ڕۆژیٚ دوو کویٚر لە ڕیٚباز زوبەیدە خانما دائەنیشن بە نیازی ئەوۆ کە کۆمەکیان پیٚبکا. کە ئەگەیێتە نزیکیانۆ یەکیٚکیان ئەڵیٚ: خواوەنا، داوا ئەکەم لە تۆ لە فەزلی خۆت رزقم بۆ بنیٚرە. ئەوی‌تریان ئەڵیٚ خوایا داوائەکەم لە فەزلی تۆ لەتەرەف زوبەیدە خانمۆ رزقم بۆ بنیٚری. کە زوبەیدە خانم ئەڕواتۆ دەسوور ئەدا بە نۆکەرەکانی تا دە ڕۆژ هەموو ڕۆژیٚ بەویانە کە ئەڵیٚ خواوەنا لە فەزلی خۆتۆ رزقم بۆ بنیٚرە ڕۆژیٚ دوو قەرانی پیٚ بدەن. بەویانە کە ئەڵیٚ لە تەرەفی زوبەیدەوۆ رزقم بۆ بنیٚرە مریشکیٚکی بۆ سورۆ کەن و دە قەرانی تیٚخەن بی پیٚچنۆ بیدەن بە دەسیۆ. کە ئەیبەن بۆی نازانیٚ دە قەرانی واتیا. ئەڵیٚ بەویان من حەز لە پارە ئەکەم ئەم مریشکی خۆمە ئەدەم بە تۆ ئەو دوو قەرانە بە بە من. مریشکەکە ئەباتۆ ئەی خوات و دە قەرانەکە هەڵ ئەگریٚ تا دە ڕۆژەکە تەواو ئەبیٚ هەروا ئەبیٚ. دوای بەینیٚ

زوبەیدە خانم تووشی ئەویانە ئەبێ کە مریشکێک و دە قەرانی بۆ ناردووە. ئەڵێ: شوکر بۆ خوا دەوڵەمەن بووی کە هەر ڕۆژێ لەم دە ڕۆژە مریشکێک و دە قەرانم بۆ ناردوی وتی: نەوەڵڵا، هەموو ڕۆژێ مریشکەکەم داوە بە دوو قەرانەکەی ئەو بە پارەکەم نەزانیوە، زوبەیدە خانم وتی: ئەو هەر تەمایەر فەزڵی خوا بوو بەشە گەورەکەی بۆ نارد، تۆکە تێکەڵت ئەکرد لێی گرتیتۆ هیچ خەتای منی تیا نیە.

هەرکەس تەمایەرلوتفی خوا بێ — دەروونی هەرووەک ئەوکوێرەوابێ
خوا بۆی ئەنێرێ رزقی فەراوان — بەبێ مانویی و بێزەحمەت کێشان
هەرکەس بە تەمای سەفەرالی بێ — دایم بێ نان و سفرەی خاڵی بێ

* * *

«۸۸»

## دینت بە دینار نەفرۆشی

لە وڵاتێکا مووسایی زۆر بوون و دەوڵەمەن، مەلا چاکێ زۆر بە دین و زۆر بەتوندی و نەبەزی و سەررقیۆ بەربەرەکانێی لەگەڵ ئەکردن، بەناچاری رۆین بۆلای مالومێکیان وتیان: تۆ مامۆسای بەشکوو تەگبیرێکمان بۆ بکە بەدەسی ئەم مەلاوۆ بەگیرهاتوین. بە شەڕ دەرەقەتی نایێین، خەڵک بە تەعەسوب دینی یێن بۆ کۆمەکی وتی: مەگەر بە موحەببەت و خزمەت و هاتوچۆ کردنی شتێکمان بۆ کرێ. ئاشناییان لەگەڵ داخست و بەگەرم ئامووشۆیان ئەکرد بە دیاری پارە و لیرەیان بۆ ئەبرد تا یەکێ لە گەورەکانیان سەگێ دەسەمۆی لەگەڵ خۆی برد و بازێ لیرە لەبەر لیرەکان چاو پۆشی کرد لە هاتن سەگەکە. کەرتێ‌تر بە لیرەیێ زۆرترۆ رۆیی بۆ ماڵ مەلا، سەگەکەی هەر لە گەڵی بوو. ئیشارەی کرد بۆ سەگەکە چووە باوش مامۆسا، لەبەر لیرەکان لە دڵ خۆیا وتی: قەی ناکا لە دواییدا گلاوی خۆم دەرەکەم با دڵی نەیێشێ. ڕۆژێ‌تر بە لیرەی زۆرترۆ رۆیی بۆ ماڵ مامۆسا وتی: من سەرو ماڵم لە تۆ دریغ ناکەم بەشکوو ئەم سەگمە بۆ سەربڕی. وتی: باشە. بەویشە وازی لێ‌نەهانی تا بە تەماع لیرە، بازێ لە گۆشتی سەگەکەی بە برژاوی دایە دەرخواردی مامۆسا.

دوای ئەوەکە مەلا لەگەڵ مووسایی‌یەکان قاتی‌وپاتی و عادی بوو هیچ حورمەتێکی نەما و کەس بڕوای پێ نەبوو.

هۆشت لە خۆت بێ، مامۆسای بەڕێز — لە تەمای دونیا زۆر بکە پارێز
دوژمنی سەر سەخت ئیسلام یەهوودە — قورئان ئەفەرمێ، نەسسی مەعبوودە
قەناعەت نەکەی بە گۆشەی مزگەوت — وا بزانە وەک ئەو مەلا پەکت کەوت

* * *

«۸۹»

**قەناعەت**

مەلایێ چاک و ساڵح لە مزگەوتێکا، لە مزگەوتەکانی شاری سنە پێش نوێژو مودەڕریس ئەبێ لەبەر بانگێکا یەکێ لە مەئموومەکانی ئەڵێ: مامۆسا ماڵ خۆتان دووره با بۆ ئەم بەربانگە بڕۆین بۆ ماڵ ئێمە. مامۆسا ئەفەرمێ: ئەڕۆمۆ بۆ ماڵ خۆمان. کە ئیسرار ئەکات ئەفەرموێ: ئەم بەربانگە خواردنێ زۆر خۆشمان هەیە، ماڵ ئێوەم لە دەس دەرناچێ، لێم گەڕێ ئەڕۆمۆ بۆ ماڵ خۆمان. لە دوای چەن ڕۆژێ لێی ئەپرسێ: مامۆسا ئەو ئێوارە نەهاتی بۆ ماڵ ئێمە زیافەتیە خۆشەکەت چی بوو؟ وا بەشی ئێمەت لێ نەداو، نەیش‌هاتی بۆ ماڵمان؟ ئەفەرمێ: نان و کەوەر و دۆ.

بە نازو نیعمەت دونیا مەنازە — تا لەو پیاوانە هیممەت بخوازە
تۆیش قەناعەت کە لە دونیا، بەکەم — با هەر شەریف بی، بێ دەنگ و بێ خەم

* * *

«۹۰»

**مەولەوی**

خوا لێ‌خۆش بوو مەولەوی تاوەگۆزی لە ساڵی ۱۳۰۰هـ قەمەریا فەوتی کردووە کە لە ئاخر عومریا کوێر بووە، بە سواری گەڕاوە لە ڕێگەکەیا لقێکی دارتوو لارۆ بووە، هەموو وەختێ وتوویەتی بە هاوڕێکەی، هۆشت پێمۆ بێ نەکەوم لەو لقە. تا ڕۆژێ هاوڕێکەی لە بیری ئەچێ و ئەکەوێ لە لقەکە و ئەکەوێتە خووارۆ پشتی ئەشکێ و فەوت ئەکا. لە «سەرشاتە»ی تاوەگۆز لە دایک بووە و

هەرلەوێ ئەیسپێرن بە خاک لای ئەسحابەیێکا، خوا دەرەجاتی قیامەتی بەرز کاتۆ زیاتر لەناو بانگی دونیای لە جەزای ئەو هەموو خزمەتا کە بە دینی کردووە (ئامین).

مەولەوی نەمر هەرتاکوو مابوو — خزمەت گوزاری شەرعیِ خوا بوو
خوا جەزای باتۆ بەخێرورەحمەت — بیکا بە شافع گوناهی ئوممەت

* * *

«٩١»

**بەو هەموو هونەرە جوانەوە چۆن خۆی ئەبینێ!**

مەولەوی نەمر خوا لێی خۆش بێ، ئەڕوا بۆ نۆدشە بۆ دیەنی خوالێ‌خوش‌بوو حاجی مەلا ئەحمەدی نودشە. لەمزگەوتا کتێب شیرین و فەرهاد لە تاقێکا پەیا ئەکا کەبە شیعری فارسی نووسراوە. کە میزانە شیعرەکەی و زۆر جوانە مەعناکەی و زۆر بە مەزەیە و زۆر جوان نوسیاوە. عاشق ئەو کتێبە ئەبێ و ئەیبا لەگەڵ خۆیا، ئەڵێ ناتەواویەکەی ئەمسەر و سەرەکەی بۆ تەواو ئەکەم و تەرجەمەی ئەکەمۆ بە شیعری کوردی. ماوەیە زۆر خەریکی ئەبێ تا نزیکی نیوەی تەرجەمەی ئەکا دوایی بیری لێ ئەکاتۆ کە نووسراوە فارسییەکە زۆر لە نووسراوەکەی ئەم باشتر و رێکوپێک‌ترە لە میزانی شیعری و مەزەدارییا لە حاڵی خۆی تەرێق ئەبێتۆ کە ئەم شیعری کوردی ئەوە بن بە تەرجەمە بۆ ئەو شیعرە فارسییە جوانانە. ئیتر دەسی لێ هەڵئەگرێ.

ئەم خاکە پڕبو زووتر لە هونەر — بۆیە مەشهوور بووبە هونەرپەروەر
ئینساف زۆر خۆشە بەخسوس بۆ مەلا — کە دیارە لەناو عەشرەت و گەلا

* * *

«٩٢»

**ئاوا ئەبی بە بلیمەت!**

باوکم، مامۆستا مەلا باقر مودەڕڕیسی بالک «رحمە اللە» چۆن ئەو هەموو عیلمە فێر بووە؟ لەبەر ئەوە کە زۆر زیرەک و زۆر ساعی و دیندار بووە. بۆ نموونە ئەیفەرموو: لە چۆڕا مەلا بووم خۆم ئەشاردۆ لە جەنجاڵ، کانیێ خۆش بوو، پێیان ئەوت چەمەی کاکەوەیس زۆرجار ئەرۆییم بۆ ئەوێ بۆ تەماشای کتێبێ. رۆژێ

..................

ڕۆییم بەیانی بوو لە سێبەر دارێکا دانیشتم بۆ تەماشا سێبەرەکە بە سەرمـۆ لاچوبـوو. خۆر هاتبوو بە سەرما. غەرق بووبووم لە ئارەقدا، بەدەنم گشتی تەزیبوو، کە هۆشـم هاتۆ سەرخۆ زۆر لە نیوەڕۆ لای دابـوو. نـەمزانیبـوو بـە خـۆم. ڕۆژێ‌تـر هـەرلـەویـا تەماشای کتێبێکم ئەکرد ئەونە قووڵ داچووبووم لەو باسا هۆشم لای خۆما نەمابوو. پیاوێ هاتبوو بۆلام بۆ پرسیاری شەرعی هـەرچـێ بـانگی لـێ کردبـووم ئاگـام لـێ نەبوو، دوایی وتبووی ڕەنگە مردبێ با بنەوم لە دەسی کە دەسـی گـرتم وتم: چیـە؟ وتی: دەمێکە بە دەنگ بەرز بانگت لێ ئەکەم کە جوابت نەبوو، وام زانی مردوویی بۆیە دەسم گرتی پرسیارەکەی کرد و جوابم داوۆ ڕۆیی.

هەرکەس تێکۆشێ بەگویرەی حالی ‌‌‌‌‌‌‌‌‌ بۆ دین و دونیای خۆی ئەبێ حالی

❊ ❊ ❊

«٩٣»

## مەلیک مەحموود و مامۆسا باقر

مامۆسا مەلا باقر «رحمه الله» لـەگـەڵ مـەلیـک مـەحمـوودی نـەمردا زۆر بەینیان خۆش بووە. ئەیفەرموو: وەختێ‌کە مەلیک مەحموود ئاوارەی مەریوان بـوو، من مەلای چۆڕ بووم، بە ئاوارەیی هاتە چۆڕ و ساداتی چۆڕ زۆر بە حورمەت بوون لە خزمەتیا و من زۆر موخلیسی بووم. ئەویش منی زۆر خـۆش گـەرەک بـوو زۆر قیافە شناس بوو ئەیفەرموو: جەناب تۆ زۆر زیرەکی و ئەبی بە مـەلایـێ زۆر بـاش، حەزەکەم ئامووشۆی من تەرک نەکەی، زۆر حەز بە دیارت ئـەکـەم کـە لـە چۆڕ دەرچوو ڕۆی بۆ ولەژێر و ڕۆیم بۆ خزمەتی، لەو وەختا یەکـێ لـە پیـاوەکـانی کـە خەیانەتێ گەورەی لێ دەرکەوتبوو مـەحکـووم بووبـوو بـە ئیعـدام، هـەرچـێ پیـاو ماقوولـی دەوروپـشتی بـوو لـە شـێخ و مـەلا و ئاغـاوات تکایـان بـۆ کـرد ئـازادی نەکردبوو، منیش وتم: تکایەکی بۆ ئەکەم وەکوو ئەم هەمـووە، کـە تکـام بـۆ کـرد ئازادی کرد. لام وایە ئەم تکایە لە ساڵی ١٣٣٨ هـ.قەمەریا بووبێ. ئەیفـەرموو: کـە مەلیک ڕۆییێ بۆ سلێمانی ڕۆیـین بـۆ خزمـەتی. زۆر حورمـەتی گـرتین چـل ڕۆژ مەرەخەسی نەکردین. - مەلا کەریم بیارە لەو وەختا لە سلێمانی لە خزمەت مامۆسا شێخ عومەر قەرەداغییا مۆستەعید بوو و دەرسی ئەخوێنـد- وتی: حـەزەکـەم بی بە

مامۆسام. دوو سێ دەرسم پێ وت. دوو کتێبی دانراوی خۆم پێ بوو بە ناو «وضع و استعارە» کە زۆر بەلایۆ جوان بوون، روونووسی کردن، ئیتر دوای ئەوە ئاشنایی و عەلاقەمان تا بێ زیادتر ئەکرد.

* * *

«۹٤»

## تاقیقاتی عیلمی مامۆ سا مەلا باقر

مامۆستا مەلا عارف ولەژێر ئەیوت: لە بالکا لە خزمەت مەلا موحەممەدی ولەژێری ئامۆزاما سوختەبوو. رۆژێ وتی: عارف با بڕۆین بۆ سلێمانی، پێنج ساڵە وام لە خزمەت مامۆسا مەلا باقرا لە بالک. بێتاقەت بووم، با بڕۆین بۆ سلێمانی بۆ خزمەت مامۆسا مەلا شێخ عومەر. رۆیین، مامۆسا مەلا موحەممەد پێنج مانگ لەوێ دەرسی خوێند. رۆژێ وتی: عارف با بڕۆینۆ بۆ بالک کە هاتینۆ، لێم پرسێ: کاکە حەمە بۆچی رۆیشتین بۆ سلێمانی و بۆ هاتینۆ بۆ بالک؟ وتی: لە بالک رۆیشتم کە مامۆسایێ پەیاکەم لە مامۆسا مەلا باقر تەحقیقاتی زۆرتر بێ لەم رۆژا، لە مامۆسا شێخ عومەر باشترم بۆ پەیا نەبووو. ئیسە بۆم مەعلووم بووە کە مامۆسا مەلا باقر جوانعومرتروتاقیقاتی عیلمی زۆرتر و باشترە. وتم: زووتر و خاستر با بڕۆینۆ بۆ بالک.

«مَن جَدَّ وَجَد» بزانە چۆنە — ئیسەیش هەروایە رەسمێکی کۆنە
هەرکەس عەمەڵ کا بەوە ئەیزانێ — خوا فێری ئەکا ئەوەی نایزانێ
وەک مەلا کەریم، مەلای بیارە — تۆ خۆی ناناسی ئاساری دیارە
وەک مەلا باقر، مەولەوی نەمر — خزمەت دینیان کردیەکلەیەک چاکتر
ئاساریان زۆرە، ناویان هەرماوە — هەروا ئەمێنێ تا دونیا ماوە
خوا لامان بدا لە شەڕ مونافق — لە بەر خاتری ساکت و ناتق
یانێ مەلاکان، زینوو و مردوویان — بە خاتر ئاسار کۆن ڕابردوویان

* * *

«٩٥»

## بەرگری لە منداڵ بوون

تازە قورسی بەرگیری کردن لە منداڵ بوون داهاتبوو. دەسەیێ مەلا لە مەجلیسێکا دانیشتبوون لێیان پرسین: بە کار هانینی ئەم قورسی بەرگیرییە حەرامە یا حەلاڵە. لە کتێبی «فتح‌المعین»دا دۆزییانۆ کە حەلاڵە. حاشیەی ئیعانە لەویا بەم جۆرە تەفسیلی ئەدا کە بەرگیری سێ حاڵەتی هەیە: ١.بەر لە جووت‌گیری کارێ بکە دوای جووت‌گیری ئەو ئاوانە نەبن بە منداڵ، حەلاڵە و هیچ ئیرادی نیە. ٢.دوای جووت‌گیری کارێ بکەی کە ئەوانە لە ناو چن نەبن بە منداڵ، ئەم کارە مەکرووهە و شەرع پەسەنی ناکا و لێم حەرامیش نیە. ٣.دوای ئەوەکە گیان چووە بەری حەرامە و قەتڵە و نابێ بکرێ، ئەو ئاوانە کە لە منداڵدانا تێکەڵ نەبن چل شەو هەر مەنیە و هیچ نەگۆڕاوە دوای ئەو چل شەوە ئەبێ بە پارچەیێ خوێن، دوای چل شەو ئەبێ بە پارچەیێ گۆشت، دوای ئەو ١٢٠ رۆژە خوای گەورە مەلایکەیێ ئەنێرێ ئەعزاکانی لە یەک جیا ئەکاتۆ و رۆح ئەکاتە بەری و نێری و مێیی دیاری ئەکا، ئیتر لە بەین بردنی حەرامە و قەتڵە، حەدیسە. دەوڵەمەنی دوو نەوعە، یەکێکیان کەم خێزانییە.

| | |
|---|---|
| خێزان کەمۆکە هەرجۆر ئەتوانی | بژی بە خۆشی و بە میهرەبانی |
| نەک ئەونە زۆر بن خۆت نەیانناسی | ساڵەو ساڵ نەبێ، لێیان نەپرسی |
| دانیشن ئەوان بە رووتی و برسی | ژنێ زۆر بێنی، بێ خەبەر پرسی |

❊ ❊ ❊

«٩٦»

## مەلا و ئەسکەندەر

ئەسکەندەری مەقدوونی بەر لە میلادی مەسیح لە یونانۆ هەڵمەتی هانی بۆ ئێران، ئێرانی داگیر کرد، لەو وەختا تەماشای میللەتی ئێرانی کرد کە زۆر حورمەتیان ئەگرت لە عالم و رۆحانی، لە دڵ خۆیا وتی: ئەگەر ئەمانە هەروا بمێنۆ من لە ناویانا هەڵ ناکەم وا باشە نفووزیان بشکێنم، بازێکیان بگرم حەبسیان کەم، بازێکیان تەبعید کەم، بازێکیان بکوژم. پرسی کرد بە وەزیرێکی: تۆ ئالەم بارۆ

ئەڵێی چی؟ وتی: من وا ئەزانم ئەم کارە کەی ئەبێ بە دوژمن ئەم میللەتە کە بە دڵ ئەم عالم و ڕۆحانییانە خۆش ئەوێ، بەم کارە تەواو بەدناو ئەبی، وە هەموو وەختێ لە کەمینا ئەبن بۆ لابردنت. وتی بەوەزیر: دەی چی بکەم؟ وەزیر وتی: ئەوانە کە بێحەیا و بێ عیلمن لە ناو ئەمانا بیانکە بە گەورە و کاربەدەست و هەمەکارە، خۆت ئەمانە بە هەموو جۆرێ لە ژێر فەرمانی تۆدا ئەبن تا ماوی، گوێ بە شەرع ودین و یاسای ڕۆحانی نادەن ئیتر ئەوانە کە زانا و بە دین و بە حەیان یا تەرکی عیلم و وەزیفەی ڕۆحانی ئەکەن یا لە داخا ئەمرن، دوای ئەوان ئەو بێ عیلم وحەیا و شعوورانە ئەمێننۆ، چیان پێ ئەڵێی مل کەچن. مەقدوونی بەگوێی کرد و سەرکەوت لە نیازەکانیا تا ماوەیێ عیلم و ڕۆحانی لە ئێرانا فەوتا.

بێ دینت ئەوێ نیوەمەلایە لەعەقڵ وشعوور زۆر تەوەللایە
جەهلی مورەککەب سەری لێداوە گوێ بەکەس نادا وسەر لێ شێواوە

* * *

«٩٧»

## نەخۆش و پرسەی مردوو

بۆ کەس و کار و ئاشنا و ڕۆشنا سونتەتە بڕۆن بۆ هەواڵ پرسین نەخۆش و زوو بێنە دەرۆ، کە مرد ئەبێ هەموو بە حورمەتۆ بیبەن بۆ سەر زیارەت و بە قەدرێ باشۆ بیسپێرن بە خاک. ئەم دوو یاسا جوانە ئەهلی ئەم زەمانە کەمتر بە شوێنیا ئەڕۆن. بە تایبەت هەواڵ پرسی نەخۆش کە بووە بە ریا و وەکوو ریای لێ هاتووە، بۆلای فەقیر ناچن، فەقیری وا هەیە دوو ساڵ زیاتر وا لە جێدا هیچ کەس هەواڵی لێ ناپرسێ. کە مرد ئەونە پرسەکەر زۆر ئەبن، کەس و کاری مردووەکە بێزار ئەکەن. پرسەی شەرعی لە گیان دەرچوونی مردووەکەوە سێ ڕۆژە، لە هەرکوێ کەس و کاری مردووەکەت چاو پێ کەوت، سەرخۆشی لێ بکە بەم جۆرە. خوا ئەجرتان گەورەکات ئەم عەزاداریتانە بە خێر بگێرێ لە مردووەکەتان خۆش بێ. خەڵکی ئەمڕۆ پرسەیان کردووە بە زەحمەتێ گەورە بۆ خۆیان و کەس و کاری مردووەکە، تا مانگێ واز نایەنن هەر ئەڵێن گلەیی مەکەن. من ئەڵێم: گلەیی لەوانە ئەکەم کە لە ناوەختا ئەچن بۆ پرسە.

سەرخۆشی بکە لە پاشماوەکان — تا سێ ڕۆژ ڕێکەوت «بأیّ مکان»
لە دوای سێ ڕۆژە ئیتر بیدعەتە — یانێ موخالیف یاسای حەزرەتە
وەک مەجلیس گرتن بۆ هاتن خەڵکی — ڕیایە، ئیتر هیچ نیە کەڵکی
خۆراکیان بۆ بەن، خۆراکیان مەخۆن — خەمیان پێمەدەن خەفەتیان بخۆن

***

«۹۸»

## مووی سپی و پیری

ڕۆژێ لە بارەی مردوو مردنۆ لەگەڵ مامۆستایێ چاکا وتوو وێژمان ئەکرد، فەرمووی: بەشەر کە پیر بوو کەم کەم ئەمرێ، ئەووەڵ کەسێ کە راسپاردەی مردنی بۆ یێنێ سپی بوونی موویەتی، کە وێنەیەکە لە کفنی، ئەووەڵ کەسێ کە مووی سپی کەوتە بەدەنی حەزرەتی ئیبراهیمعليه‌السلام بوو، زۆر بە لایۆ ناڕەحەت بوو، پرسی خوایا ئەمە چیە ڕووی داوە لە من؟ خوا فەرمووی: ئەوە زیادە حورمەتێکە کە بە تۆم داوە. فەرمووی: دەی خودایا زۆرتریکە، ئیتر مووی ڕەش لە بەدەنیا نەما. بە قسەی دوکتۆر لە نارەسایی خوێنۆ کە ناگا بە بێخیموو، موو سپی ئەبێ. دوای سپی بوونی موو، هەروەها لە قووەت و حەواسی بەشەر کەم ئەبێ، چاوی کەم بینا ئەبێ، گوێچکەی کەڕ ئەبێ، ڕەگی سیس ئەبێ، بە کۆمەک دار ئەڕوا بەرێدا، بێ کۆمەک ناتوانێ هەڵسێتۆ، لەپێ ئەکەوێ، خۆراکی بۆ ناخورێ، بۆی عەزم نابێ، لە جێدا ئەکەوێ، خۆی لەگەڵ هەموو کەسێکا دۆعای ئیمانی بۆ ئەکەن دەرمانی هەر مردنە ئیتر ئەمرێ.

وەختێ کە مردن پەیامی نارد بۆت — ڕابیتەی مردن کە بە خەیاڵ خۆت
با ئامادە بی بە تۆبە و نزا — نەجاتت ببێ لە تۆڵە و سزا
قەبر لە سالح پێشوازی ئەکا — نەفرین لە پیاوی ناسالح ئەکا

***

«۹۹»

## لە خۆبایی بوون

ڕۆژێ حەزرەتی مووساعليه‌السلام چوو بۆ موناجات، خوا فەرمووی کەسێکم بۆ بێنە لە خۆت خراپتر بێ، زۆر گەڕا کەسی بۆ پەیدا نەبوو، تا تووشی سەگێ گەڕ

هات و وتی ئەمە رەنگە لە من خراپتر بێ، نەختێ لەگەڵ خۆی بردی و بیری کردەوە و پەشیمان بووە و وتی: ئەو لە من چاکترە تەکلیفی لەسەر نیە و من تەکلیفم لەسەرە وە بەجۆرێ کە لایەقی عەزەمەتی خوایە بۆم بەرێ ناچێ پەشیمان بووەوە و پەتەکەی لە ملی کردۆ. چوو بۆ موناجات و وتی: لە خۆم خراپترم نەدیوە. خوا فەرمووی: قەسەم بە عیزەتی خۆم ئەو سەگتە بهانایێ بۆلام و خۆت بە باشتر بزانایێ لەو، لە پێغەمبەریم ئەخستی. ئەبێ هەمووکەس وا خۆی بە کەم بزانێ با خوا بەرزی کاتۆ. بۆیە مەولەوی فەرموویەتی:

تەکەببور مەکەر ئەگەر دانانی دووجار جە یاگەو بەولۆ ئامانی

* * *

«١٠٠»

## حەزرەتی غەوس و ریزی دایک

حەزرەتی غەوسی گەیلانی «قدس سره» کوڕی شێخ سالحی جەنگی دۆست و سەیید حەسەنی بووە، لە ساڵی چوار سەد و حەفتا دا لەدایک بووە، دوای نەوەد و یەک ساڵ تەمەن وەفاتی کردووە و لە منالیدا لەسەر عادەتی وڵاتی گیلان لە ئێرانا لە گەڵ گاو گوێری خۆیانا شوان بووە، رۆژێ یەکی لە گاکانی لائەکا بە لایەوە و ئەڵێ: خوا تۆی بۆ ئەم کارە دروست نەکردووە. بڕۆ بەلای خوێندنۆ. ئەڕواتۆ قسەکە ئەگێڕێتۆ بۆ دایکی. دایکی پێی ئەڵێ: راستی وتووە، بڕۆ بۆ بەغدا کە جێگای ئەولیا و عولەما و خوێندەوارە، لەوێ بخوێنە، رێی ئەخات و چواردە لیرەی پێ‌ئەدا بۆ خەرجی و وەسیەتی بۆ ئەکا کە درۆ مەکە، رێ‌ئەکەوێ تا ئەگاتە ئەو بەری کێوی ئەلوەند لە دەوری هەمەدانا ئەبێ بە رەفێقی قافلەیەک. لە ئەلوەندا جەردە لێیان رائەپەڕێ و هەموویان رووت ئەکەنۆ و حەزرەتی غەوس کە منداڵ ئەبێ لێی ناپرسن تا یەکێکیان بە شۆخییۆ ئەڵێ: تۆ چیت هاپێ پێمانی بدەی؟ ئەڵێ: چواردە لیرەم هاپێ. زۆر بەلایەوە عەجایەب ئەبێ و ئەیبا بۆلای گەورەکەیان، ئەڵێ: ئەم منالە وائەڵێ. ئەویش ئە ڵێ: رۆڵە تۆ چیت پێیە؟ ئەڵێ چواردە لیرە. ئەڵێ کوا رۆڵە؟ ئەویش ئەڵێ: وا لەناو ئەم دار دەستما! ئەڵێ رۆڵە تۆچیت بوو لەمە راس بڵێی، خۆ ئێمە لیرەکان ئەبەین. ئەڵێ: من قەولم داوە بە دایکم کە درۆ نەکەم. درۆ

........................................................

ناکەم چش لیرەکانم ئەبەن. گەورەکەیان دەس ئەکا بە گریان و ئەلێ: ئەم منالە شەرتی کردووە بۆ دایکی درۆ نەکا، چش ئەکا لە لیرەکانی و درۆ ناکا، من شەرتم کردووە بۆ خوا کە عیبادەتی بۆ بکەم کەچی جەردەیی و دزی ئەکەم، تەوبە ئەکا و لەگەڵ باقی جەردەکانا و دیلەکانیان بە ماڵەکانیانۆ مەرەخەس ئەکەن بە بەرەکەتی حەزرەتی غەوس.

ئێمەیش با وابین درۆزن نەبین      با ریسوای لای خواو مەخلوقی نەبین

وە ئەو رەئیسی جەردانە لە وەختی جەردەییدا نوێژی ئەکرد، وتیان تۆ جەردەی نوێژ بۆ ئەکەی؟ وتی: خراپکار ئەبێ کەلەبەرێ بیلێتو بۆلای خوا. کە لەسەر دەستی حەزرەتی غەوسا تەوبەی کرد و تەوبەکەی بەرێوە برد، بوو بە شێخ قەلەندەر و بە زیارەتی مەکە و مەدینە شاد بوو.

* * *

«۱۰۱»

## ریزی ئەولیا و گاڵتە پێ کردنیان پەنا بە خوا

حەزرەتی غەوس هەر لە منالێۆ ئیرادەتی ئەهلی دینی بووە. لە وەختی فەقیەتیدا لەگەڵ «ابن سقا» و «عبداللە» ناوی رەفێقیا بۆ زیارەت شێخێکی ئەو سەردەمە ئەڕۆن، لە رێدا ئیبن و سەقا ئەلێ با رازی دڵمان لای یەک بڵێین کە بۆچی ئەڕۆین بۆلای ئەم شێخە. ئەلێ: من بۆ ئەوە ئەڕۆم کە چەن پرسیاری موشکلم دۆزیوەتۆ لێی بپرسم و ئەویش نەیزانێ و شەرمەساری کەم. عبداللە ناو ئەلێ من ئەم پیاوە بە وەلی ئەزانم ئەڕۆمە خزمەتی دۆعام بۆ بکا دەوڵەمەند بم کە زۆر حەزی لێئەکەم. حەزرەتی غەوس ئەفەرموێ من بە پیاوی خوای ئەزانم هەر لەبەر خوا ئەڕۆم بۆ خزمەتی.

ئەڕۆن بۆ مەنزلی لەوێ نابێ، کوتوپڕ لە جێگەکەیا پەیدا ئەبێ، دوای بەخێر هاتن پێیان ئەلێ با پێتان بڵێم بۆچی هاتوون، ئیبن وسەقا بۆ ئەوە هاتووە کە بڕوای بە من نیە چەند پرسیارێکی حازرکردووە کە بێپرسێ لە من نەیزانم و من خەجاڵەت بم. جا یەکەیەکە پرسیارەکان و وەلامەکانی بۆ بەیان ئەکا. ئەلێ: عبداللە بۆ ئەوە هاتووە کە دۆعای دەوڵەمەندی بۆ بکەم کە زۆر حەزی لێئەکا

موژدەی پێئەدەم کە ئەوەندە دەوڵەمەند ئەبی سەر و حەسابی خۆی نەزانێ. وایش ئەبێ. عەبدولقادر لەبەر ڕەزای خوا هاتووە بۆلای من کە بە دۆسی خودام ئەزانێ و موژدەی پێئەدەم کە وای لێدێ کە لەسەر مینبەرا ئەڵێ پێی من وا لەسەر شانی هەموو ئەولیایەکا و ڕاسیش ئەڵێ و وا ئەبێ.

ئیبن وسەقا بەو بوغز و کینەوە کە لەگەڵ ئەولیای خوا هەسی بە کافری ئەمرێ و لە واقیعا وا ئەبێ کە عاشقی کچە گاورێ ئەبێ و شەرتی پێئەکەن ببێ بە گاور جا کچەکەی پێبدەن شەرتەکە بەڕێوە ئەبات، دوای ئەوە بەو هەموو عیلم و حیفزی قورئانۆ کە بوویەتی بە کافری و پەیڕەوی شەیتانۆ ئەمرێ. ئەمە کورتە باسێ بوو لەوەی کە مامۆستا مەلا باقر لە تەعدیلی شەریعەت وتەریقەتدا باسی کردووە بە ژێری تەماشای بکە بۆیە وتوویانە: خوا سەر لەکەس نەشیوێنێ.

بوغزی ئەولیا لە دڵتا لابە موشکڵی گەورە لە دڵتا لابە
خوا لەسەر ئەوان زوو یێتە جواب بەرگەی ناگری ئەی خانە خراب

* * *

«۱۰۲»

## عیلم ئەبێ لە دلا بێ

وەختێ حەزرەتی ئیمامی غەزالی «رحمه الله» لە بەغدا خوێندن تەواو ئەکا و یێتۆ بۆ خوراسان بۆ وەتەنی لە ئێرانا کە تووس بووە، ئەبێ بە ڕەفێق کاروانێ. لە ڕێدا جەردە ڕووتیان ئەکەنۆ و ئیمامی غەزالی تەنیا دەفتەر یادداشتێکی ئەبێ ئەیبەن، زۆر بۆی زویر ئەبێ ئەڕوا بۆلای گەورەکەیان سکاڵا ئەکا کە ئەم دەفتەرە بۆ من زۆر بە کەڵکە کە زۆر موشکلات و دەرس و عیلمم تیا نووسیوە، ئەگەر نەمدەنۆ وەکوئەوە وایە بە دەس خاڵی بڕۆمۆ و بۆ ئێوە هیچ کەڵکی نیە. گەورەکەیان ئەڵێ: ئەگەر تۆ خوێنەوار بوایی ئەوە کە ئەتزانی ئەتخستە ناو دڵتۆ و ئێمە نەمان ئەتوانی بیبەین «زانین ئەوەیە لە دلا بێ، نەک لەسەر کاغەزا نووسرابێ» ئەم پەندە زۆر تەئسیر ئەکات لە دڵی ئیمام غەزالیدا و دوای ئەوە هەرچێ ئەزانێ و ئەخوێنێ ئەیخاتە ناو دڵی و ئەبێ بە بەحری گەورەی زانست و لە زانیاریدا ئەگەیەتە ڕادەیەک کە ئەهلی دونیا ئێستاش هەر قەرزاری ڕێنماییەکانی ئەون، خوا جەزای

.............................................................

بەخێر بداتەوە. ئیمام غەزالی لە ساڵی ٥٠٥ کۆچی، فەوتی کردووە. لە تەمەنی ٥٥ ساڵیدا. بۆیە وتویانە:

پەندی پێشینان بگرینە گوێمان  با لە دیوارا نووسرابێ بۆمان

مەرحوومی باوکم لەما و لە زۆر شتی‌تردا پەیڕەوی ئیمام غەزالی بووە، بە تایبەت لە نوێژ و دەست نوێژ و وەختی نوێژدا خوا دەرەجاتیان عالی کا و ئێمەیش بە تابیعی ئەوان حیساب کات.

❊ ❊ ❊

«١٠٣»

## پەردە رەشەی ماڵی خوا و حەج

ڕۆژێ حەزرەتی عومەرﷺ تەوافی ماڵی خوای ئەکرد لەو وەختا رووی کردە «حجرالأسود» و وتی: مەغروور مەبە بەمە کە من هەڵئەسوورێم بەدەورتا و ماچت ئەکەم، ئەزانم هیچت لە دەست نایە، ئەگەر پێغەمبەرم نەبینیایێ کە تەوافی تۆی ئەکرد هەرگیز نەئەهاتم بەدەورتا، «کەسێ کە ئیمان لە دڵیا بێ لای خوا هەزاران ئەوەنەی تۆ گەورەیە» پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:

دڵی موسوڵمان عەرشی خوایە  کە رەحمی خوا و ئیمانی تیایە
لەدۆعا ونزای مەزڵووم بترسە  لە حورمەت ئەوان لای خوا مەپرسە
کە چەنێ زۆرە و چەن بە قیمەتن  لە بۆ سەر زەوی ئەوان زینەتن

جا لەمە عەجایەبتر ئەوەیە کە نەفەری وا هەیە کە چەند ساڵ عومر ئەکا و هەر ڕۆژێ دڵ هەزاران کەس دائەچڵەکێنێ، و بەو جۆرە ماڵ کۆ ئەکاتۆ دوایی ئەڕوا بۆ حەج و تەمایەرە بەو حەجە خوا لێی‌خۆش بێ، نازانێ ئەبێ لەپێشا تەوبە بکات و رەددی مەزڵەمە بکات، واتە دڵداری مەزڵوومەکان بکات و رازییان بکات و گەردنی خۆیانی پێ ئازاد بکا جا دوای ئەوە بڕوا بۆ حەج.

واجبی گەورە رەد مەزڵەمەیە  حەج‌بۆخوایەنەک بۆگەمەیە

بەهەر حاڵ ڕۆیشتنی لە نەڕۆیشتنی باشترە بەشکوو دۆعای یەکێکی بۆ کەوێتە کەرەم.

❊ ❊ ❊

«١٠٤»

## لوتفی خوا خاتری خاتران

ئیمامی غەزالی لە ئیحیادا ئەگێڕێتەوە کە یەکێ لە ئەولیای خوا ڕۆیی بۆ حەج لە عەرەفاتا خەوی لێ‌ئەکەوێ و لە خەویا دوو مەلائیکە لە ئاسمانۆ هاتنە خوارۆ یەکێکیان وتی: ئەزانی ئەمساڵ چەن نەفەر هاتوون بۆ حەج؟ وتی شەش‌سەد هەزار نەفەر. وتی: چەند نەفەریان حەجی قەبووڵ بووە؟ وتی شەش نەفەریان. خەبەری بووەوە زۆر زویر بوو، گریا کە چ مەعلووم من یەکێ لەو نەفەرانە بم، ئەگەر من لەوانەبم ئەم هەموانە چ بکەن. ڕۆژی دوایی هەر لەوکاتا خەوی لێ‌کەوت و دوو مەلائیکەکە هاتنۆ بەرچاوی. یەکێکیان وتی: ئەزانی خوا چی کرد لەمانە؟ وتی: فەرموو، وتی: خوا هەر سەد هەزار نەفەری بەخشی بە یەکێ لەمانە و تێکڕا حەجی هەموویانی قەبووڵ کرد.

بابە تەما بین ئێمەیش هەروا بین    قەبووڵ کراوی بەری درگا بین

* * *

«١٠٥»

## عیبادەت و خزمەتی خەڵک و زەحمەت کێشان

مەلا ئەبووبەکری موسەننیف چۆڕی «رحمه الله» ١٨ساڵ لە مزگەوتە سوورەی بەرقەڵا مودەڕڕیس بووە و زۆرتر کتێبەکانی لەوێ داناوە. بۆ وێنە کتێبی «سراج الطريق» لە ساڵی ٩٨٥ داینـاوە و کتێبی «رياض الخلود»ی لە ساڵی ٩٨٩ داناوە و لە ساڵی ١٠١٤ لە چۆڕا فەوتی کردووە ومەرقەدی لە چۆڕە و زیارەتگای خاس و عامە. مەلا ئەبووبەکر لە «رياض الخلود»دا ئەیگێڕێتەوە ئەڵێ: نەفەرێ بووە کە هەمیشە خەریکی بەندایەتی و عیبادەت بوو، شەو و ڕۆژ بێ وچان. ڕۆژێ بە خەیاڵیا دێ ئایا کەسێ‌تر هەیە وەکوو من خەریکی عیبادەت بێ؟ لە خەوا پێی نیشان ئەدەن کە لە فلان جێدا پیاوێ هەیە ئەو لە تۆ عیبادەتی زۆرترە بەو ناو نیشانە. ئەڕوا بۆ ئەو جێیە تەماشا ئەکا نەفەرێ لەویا جووت ئەکا. دوای سەلام و مانوو نەبینی و بەخێر هاتن، ئەڵێ: من میوانی تۆم، جووتیارەکە ئەیەوێ جووتەکە بەردا و بڕۆنۆ بۆ ماڵۆ، میوانەکە نایەڵێ، ئەڵێ تا ئێوارە لەگرە ئەبین جا ئێوارە ئەڕۆینۆ، بۆ

............................................................................................

ئەمە تێفکرێ بزانێ چی ئەکا، وەختی نوێژی نیوەڕۆ گاکانی بەر ئەدا و ئالف و ئاویان ئەدا و ئەڕوا دەسنوێژ ئەگرێت و نوێژەکان ئەکات لەگەڵ کەمێ سوننەتا ئیتر ئەڵێ لەبەر کارەکەم لەمە زیاتر ناتوانم. جا دوای مانوو حەسانەوە گاکانی ئەبەسێتۆ بە جووت تا وەختی ئاخری عەسر گاکانی بەر ئەدا و ئاویان ئەدا و نوێژی عەسر ئەکات و ئەچنۆ بۆ ماڵۆ پەزیرایی باش لە میوان ئەکات، میوانەکە شەو و ڕۆژێ تەواو سەرنجی ئەدا بزانێ چی ئەکا. لە دواییا لێی ئەپرسێ تۆ حاڵت چۆنە و چی ئەکەیت؟ ئەڵێ: من هەمیشە ئەبێ سەرگەرمی جووت و بەرهەم بم و لەگەڵیا حەیوانداری بکەم و لەمە زیاتر کە بینیت، ناتوانم زیادە نوێژ و عیبادەت بکەم و شوکر بۆ خوا زەکات ئەدەم و هەمیشە خێزانم تێر و تەسەلن و میوانداری زۆر ئەکەین و لەو رزقە کە هەسمان بەشی خەڵکی زۆری لێ‌ئەدەین، ئەمە حاڵی منە. ئەویش ئەڵێ: بە لای خۆیۆ من زۆر خۆم مانوو ئەکەم لە عیبادەتا لە خەوا نیشانیان داوم کە تۆ لە من بە عیبادەت‌تریت کە تۆ خزمەت بە خەڵک ئەکەیت.

عیبادەت یانێ خزمەتکاری خەڵک — بە نان و نیعمەت بە کۆمەک بە کەڵک
نەک بە تەسبیح و مێزەرە و عەسا — خۆت بکەی بە شێخ یا بە ماموٚسا
نەک بڵێی کەشف و کەڕامەت زانم — هەرچێ مەیلم بێ بێ کەم ئەتوانم

* * *

«۱۰۶»

### سەبر و تاقەت

نەفەرێ ڕۆیی بۆ حەج لە وەختی حەجا چاوی کەوت بە ژنێ زۆر جوان بوو، لە دڵ خۆیا وتی ئەم ژنە لەوە ئەچێ تا ئێستە ئێش نەچووبێ بە دڵیا بۆیە ئەوندە جوانە. نهێنی دڵەکەی پێ‌وت، وتی: ئەو هەموو ئێشە بە دڵ منا چووە، بە دڵ کەسا نەچووە، دووکوڕم بوو تازە پێ‌ئەگەیین یەکێکیان کاردێکی بەدەسۆ بوو، وتی بەویان: ئەزانی دوێکە باوکم چۆن مەڕەکەی سەر بڕی؟ خستی و سەری بڕی و وتی ئاوا. دوای ئەوە لە ترسا رای کرد بەو هەردا، لەو هەردە کە زۆر دوور کەوتبووەوە باوکی چوو بە شوێنیا و تا گەیی پێی گورگ خواردی و لە داخا باوکیشی مرد و لەبەر خوا ڕەنگ و ڕووی خۆم نەگۆڕی و ڕێی خەفەتم بە خۆم نەداوە.

بۆ مردوو ڕەنگ و ڕووی خۆت مەگۆڕە
ئـاخری گـشتمان مـردن و گـۆڕە
بـە سـەبـر و تاقـەت خـوات رازی کـە
بە خەفەت دونیاوەک تۆپبازی کە
جا ئـینسانێـکی پـاک و خـاوێـنـی
بێ گەرد و سافی وەک جام ئەنوێنی
دووبارە وتوویانە:

سابیر سەبرش کەرد بە موراد یاوان
کەوتە بەر عەفووی گوناهـ و تاوان

* * *

«١٠٧»

## شوو کردن

ئیمام جەعفەری سادق «رحمه الله» تووشی خێلە جافێ بوو کە لە دوا قاتی خێلەکەوە کوڕێ نەنکی خستبوە پشتی خۆیۆ و دەستی پێ گرتبوو کە نـەکـەوێتە خوار، بە شۆخییۆ ئیمام جەعفەری سادق فـەرمـووی: ئـەمـە چیتـە؟ وتی: نـەنکمـە، نەخۆشە، فەرمووی بیدە بە شوو با خۆشۆ بێ. وتی: قوربان چـی ئـەفـەرمـووی خۆ ئەونە بێ هێز بووە دەسی لێ بەردەم ئەکەوێتە خوارەوە. پیرەژنەکە چەپۆکێکی مالـی بەسەریا و وتی: قوڕکەی بە سەرتا تۆ لە ئیمامزادە باشتری لێ ئەزانی؟!

شووکردن خۆشی پیر و جوانە
بەتایبەت شیفای پیرە ژنانە

* * *

«١٠٨»

## سەیی دۆعا نووس

بە پێی نووسینی کتێبی «رشتەی مـرواری» دانراوی «علاءالـدین سـجادی»:
کۆڵە نانی لەوانە کە کتێب ئەگرنۆ ڕێی کەوتە ماڵە دەوڵەمەنـدێ لـە سلیمانی، لـە هاوینا. تەماشای کرد دوانزە ژن وان لە حەوشێکا پیاویان نیە لە ماڵۆ خشڵ و خـاوی زۆریان هاپێوە، تەمای کردە خشڵ و خاوەکەیان و وتی: ئەگەر بە گوێی من بکـەن ئەتوانم بە حوکمی ئەم کتێبە هـەزاران نیـازی دڵـتان بـۆ مـەعلـووم بکـەم، زۆریـان پێ خۆش بوو وتیان: هەرچی بفەرمووی ئەیکـەیـن وتی: بـڕۆن هـەریـەکـی قازانـێ گەورە بێنن بیکەن بە سەرتانا تا ماوەیێ، زرەزرڕیش کەوتە گوێتان گوێی پێ مەدەن. تەماشای کتێبەکە ئەکەم جا راز و نیازتان بـۆ بـەیـان ئـەکـەم. لـەگـەڵ چوونـە ژێـر

.........................................................................................

ازانەکان دەسی کرد بە کۆکردنەوەی خشڵ و خاوەکەیان خستیە ناو توورەکەیەو
ردی دوای ماوەیێ زۆر ساحێب ماڵەکە هاتۆ تەماشای ئەم هەموو قازان بەسەریە
کرد زۆر بە لایۆ عەجایەب بوو بە لیباسا ژنەکەی خۆی ناسیێو و رۆیی سەری لابرد
وتی: مامە سەیی چیت کرد؟ وتی: شێت بووی سەیی چی؟ پیاوەکە وتی: هەمووتان
سەرتان لابەن هەموو کە یێنە دەرۆ لە ژێر قازانا تەماشایان کرد خشڵ و خاوەکەیان
هیچی نەماوە، کۆڵە نانی هەمووی بردووە و رۆییوە هەرچەن گەڕان بە شوێنیا بۆیان
پەیا نەبوو.

| | |
|---|---|
| ژن زۆر سادە لەوح زۆر خۆش باوەڕە | بۆیە چاوبەسکەر بە ئەوان خڕە |
| بڕوانە چی کرد ئالەو ژنانە | چۆن چوونە ژێری ئەو قازانانە |
| بە رۆژ نیوەڕۆ تالانی کردن | تا ئەبەد ریسوای لای مێردی کردن |

* * *

## بەشی چوارەم کە دەماودەم بیسراوە

«١»

### فرە خواردنیش باش نیە

ئەڵێن کچێ لە دێیەکا بووە و ماڵێ ئەیانەوێ بیخوازن، ڕۆژێ ئەو کچە بۆ حەیوان ئەگەڕێ، ڕێی ئەکەوێتە ئەو ماڵە دایکی کوڕەکە کەلانە ئەکا، پڕ تەشتێ کەلانەی داناوە بۆ خێزانەکەی. خولکی ئەو کچە ئەکات بێ کەلانە بخوات، تەشتەکە ئەنێتە بەردەستی، دەس ئەکا بە خواردن کەمێکی لێ‌ئەمێنێتەوە ئەڵێ لەبەر تۆ ئەو تیکەمە خوارد. دوای ڕۆیین ئەو کچە، ئەڵێ: وەڵڵاهی ئیتر نایێ بە ماڵما، ماڵی ئێمە بەش خواردن ئەو ناکات.

«٢»

### باوکم نەخۆش کەوت و مرد

پیاوێکی کەس‌دار و دەوڵەمەند ئەمرێ، تاقە کوڕێکی ئەبێ، پرسەکەر دەوری ئەدەن شام ونەهاری خۆشی پێ دروس ئەکەن کە خۆراکەکە خۆش ئەبێ هەرکەس ئەڕوا، پرسیاری نەخۆشی باوکی و چۆنیەتی مەرگی باوکی لێ‌ئەکەن، ئەویش تا بە شێنەیی بۆیان ئەگێڕێتۆ وەختی شام و نەهار یێتە پێشۆ، چەن ڕۆژێ وەها ئەبێ کە کوڕەکە حەسابی خۆی ئەکا، شتێکی وای بە دەستۆ نەماوە، ئەمجار کە یێنەوە قسە دائەمەزرێ و لێی‌ئەپرسن باوکت چۆن نەخۆش کەوت و چۆن دوکتۆر و دەوای بەکارهانی، بۆ ئەوە زوو نەجاتی بێ، ئەڵێ: باوکم نەخۆشینێ وای نەبوو، تاوێ یاوی لێ‌هات و فەوتی کرد.

* * *

«٣»

### باوک مردن و میوانی

یەکێ‌تر لە کۆماسی باوکی فەوت ئەکا قەوم و عەشیرەتی لێی کۆئەبنەوە و بە وەی وەی و ڕۆ ڕۆ دەس ئەکەن بە حەیوان سەربڕین و شیوەن و واوەیلا و قرپ و قاڵ، حە فتەیێ دوو حەفتە هەروا بەردەوام ئەبن، کوڕەکە تەماشا ئەکا هیچی

نەماوە و زۆریش قەرزاری بێ‌جێگە ماوەتۆ و ناچار کڵاوەکەی باوکی دێنێتە دەرەوە و ئەینێتە بەر نیشانەی تفەنگ، بۆ ئەوە کە قەوم و کەس وازی لێ‌بێنن لە پاش ئەوە ئەوان روویان نابێ دانیشن و ئەڕۆن.

***

«٤»

## تەنانەت بە تۆش فرمان ئەکات

پیرە ژنێکی بێ‌کەس تەنیا لەماڵێکا کەوتبوو، بە رێکەوت هەرکەسێ بڕوایی بۆلای کە تەقەی پێی ئەهات، فرمانێکی پێ‌ئەسپارد. بە گەورەی دیکەیان وت تۆش بڕۆی فرمانێکت پێ‌ئەسپێرێ، رۆی بۆلای، لە دوورەوە تەقەی پێی هات، وتی: رەحمەتت لێ‌بێ ئەو گۆزەمە بۆ بێنە ژوورۆ، کە هانی وتی: خەجاڵەت خۆم نەمزانی تۆی، بیبەرەوە بۆ جێگەکەی خۆی. بردیەوە بۆ جێگەکەی خۆی. کە هاتۆ وتیان: قوربان چۆن بوو؟ وتی: بە ئێوە فرمانێکی ئەسپارد، بۆ من بوو بە دوان.

مەشهوورە کەوا بێ‌کەس و بێ‌دەس ناچارە پەنا با بە هەموو کەس

***

«٥»

## غەریب نەواز بە

حاجی ساڵحی فەرزاڵی پیاوێکی ماقووڵ و دەوڵەمەند بوو لە پێنجوێن، ئەیوت: لە وەختێکا کە چاو ساقی مەلا مەحموودی برام بووم، بۆ ئیحسان دێ بە دێمان ئەکرد، لە زمسانێکا رێمان کەوتە دێیێ بیست ماڵی، تەماکار بووین شەو لەوێ بین، لە هیچ ماڵێکا رێیان نەکردین و بە ناچاری لە درەنگ وەختا بەو هەموو بەفرا رۆیین بۆ دێیەکی‌تر و کێوێکی بەرز لە رێمان بوو، زۆر مانوو بووین، کە سەرکەوتین وتی: کامەسە قیبلە رووی کردە قیبلە وتی: خوا گیان بۆ خاتر ئەم قیبلەی موحەممەدە ئاوری قودرەت بەربێتە ئەم دێیە کە جێیان نەکردینۆ. فەورەن تەماشام کرد ئاوری قۆرەتیان تێ چوو و هەموویان سووتان.

خۆت مەسووتێنە بە هەناسەی کەس هەر ماڵی دونیا مەکە بە مەبەس

***

«٦»

## نەوس خەڵکی مەیێنە ملی خۆت

ماڵێ کەلەپاچەیێکیان لێنابوو. ژنیھاوسێ ماڵەکەیان زۆر حەزی لێ ئەکرد و ھەر جارێ بە بیانوویەکەوە ھاتووچۆی ئەکرد کە بەشی بەن. بەڵام خواردیان و بەشیان نەدا. نەختێکی مابوو کردیان بە ژێر قووڵینەیەکۆ. بەیانی کە رۆیی بەرزی کردەوە خواردنە کە بوو بە مارێ، پێچیا بە ملی کەیبانووەکەدا ئیتر زانی نەفسی ئەو ژنە بووە و بووە بە مارو ئالاوە بە ملیا، جا تۆبەی کرد و لە ملی بووەوە.

نەفس وەکوومارە مەی ھێنە ملت وەکوو تەوق لەعنەت ئەچێتە ملت

* * *

«٧»

## چاوچنۆک مەبە

مەلا ئەبووبەکری موسەننیف چۆڕی «رحمه الله» ئەگێڕێتەوە کە نەفەرێکی شارەزووری زۆر دەوڵەمەند ئەبێ زۆر بێسەخاوەت و بێنان ئەبێ، کابرا ئەمرێ تاقە کوڕێکی لێبەجێ ئەمێنێ و ئەویش ھەروەک باوکی دەوڵەمەند و بێ خێر ئەبێ، رۆژێ بۆ ھەوا خۆری ئەچێ بۆ مەریوان لە گردی سوورا دەوار ھەڵئەدا و چەن نەفەرێ لە کۆڵێتێکا لە نزیک ئەو دەوارا ئەبن، تەکبیر ئەکەن کە بڕۆین بۆلای داوای حەیوانێکی لێکەین کە زۆر حەز لە گۆشت ئەکەن پێیئەلێن ئێمە ناو تۆمان بیستووە کە کوڕ فلانە کەسیت و خۆت و باوکت ھەردوو دەوڵەمەند بوون و ھاتوین بۆلات حەیوانێکمان بەیتێ سەری ببڕین و بیخۆین. لەو وەختا خەریک ئەبێ تیماری قاچ مەڕێ ئەکات و کرمی لێدەردێنێ، ئەڵێ: من ئاوا ئەم مەڕانمە بەخێو کردووە چۆن مفت و مەرحەبا ئەیدەم بە ئێوە بیخۆن، ئەوان بە دڵ شکاوی ئەڕۆنۆ کەوێڵەکەیان. خواوەن تەعالا بارانی خوڕڕەم ئەنێرێ، حەیوانەکانی گشت لافاو ئەیانبا و ئەو مەڕە شەلە کە بە پێ بەسراوی ئەینێ بەسەر شانێو کە نەجاتی بدا، ئەکەوێ بە عەرزا، مەڕەکە ئەوەندە تەکان ئەدا لەخۆی پەتەکەی پای ئەکەوێتە مل

.....................................................................

ساحێبەکەی ئەیخنکێنێ. وا بەسەر و ماڵۆ تیا ئەچێ لە ئاهی ئەو فەقیرانۆ. بۆیە سەعدی فەرموویەتی:

ئاورو پووش وپەلاش بزانەحەتمەن نایکا ئەوە هەناسە ودووکەڵ دلی لێقەوماوئەیکا

* * *

«٨»

## خاس کە و خراپ مەکە

ڕۆژێ پیاوێکی جاف ئەڕوا بۆ حوجرەی مودەڕڕیس بیارە لەو وەختا مەلا قادری گەورە بە حەڵقە دەرس بە فەقێکانی ئەڵێ و چەند کتێبیان بە دەور خۆیانا داناوە، لەکتێبخانەیشا کتێبێ زۆر هەڵچنراوە، جافەکە ئەڵێ: ئەم کتێبانە ئەڵێن چی؟ مە لا قادریش نازانێ چۆنی حالی کا و چۆن جوابی بداتۆ کە هەر کتێبێکی چەن بابەتە و باسێکە، جافەکە ئە لێ: من ئەزانم ئەڵێن چی! هەموویان ئەڵێن: ئەوەی خاسە بی کەن و ئەوەی خراپە مەی کەن. مەلا قادر ئەفەرمێ: تۆ باشتری لێئەزانی لە من هەروایە.

* * *

«٩»

## هەباسە چ باسە؟

پیرەژنێ کوڕێکی لە دیوانی حوکوومەتی وەختا ئەندام و کاربەدەست بووە، ناوی هەباس بووە هەروەختێ چووە بۆ دیوان و هاتووەتۆ وتوویەتی هەباسە لە دیوانا چ باسە؟ پرسی کردووە بە ژیرێ بە تەگبیری تۆ چۆن جوابی دایکم بەمەوە باشە؟ ئەڵێ: ئەمڕا لێتی پرسی بڵێ: حوکوومەت بڕیاری داوە کە هەر پیرە ژنێ پڕ بێژنگێ کا بەرزەوەکا، ئەبێ شوو بکا. وەلامی دایکی ئەداتەوە و ئەویش تەما ئەکاتە خۆی ئەڵێ ئادەی پڕ بێژنگێ کام بۆ بێنە بزانم ئەتوانم بەرزی کەمەوە، ئاسنی چکۆلە ئەخاتە ناو بێژنگەکە و ئەڵێ دایە بزانم ئەتوانی بەرزی کەیتەوە. بە هەر جۆرێ ئەبێ کەمێ بەرزی ئەکاتەوە. ئەڵێ: هەباسە کێشەکێشیش هەر خاسە. ئەویش لەبەر دڵ ئەو ئەڵێ دایە گیان زۆر باشە بەشکوو فکرێکت بۆ بکەم.

دایپیره تازه داکەوه بۆ خۆت     خەیاڵ شووکردن مەخەره دڵ خۆت

* * *

«۱۰»

## دا باسێ لە کەره شینیش بکەن

کابرایێ سێ کوڕی ئەبێ دایکیان ئەمرێ و بێ کـەیبـانوو ئـەکـەون. دوای ماوەیێ زۆریان بۆ دێ بۆ کەیبانوو، تەنیا کەرێکیان ئەبێ ئەڵێن ئەم کـەره بفرۆشـین و بیدەین بە ژن بۆ یەکێکمان برا بچووکەکان ئەڵێن بیدەین بە ژن بۆ کاکەمـان کـە لە ئێمە گەورەتره کاکەیش ئەڵێ بیدەین بە ژن بۆ باوکمان کە ئـەبێ بـە دایـک و کەیبانووی هەموومان. باوکەکە زۆری پێخۆش ئەبێ، لـە خۆشـییا هـەمـوو شـەوێ ئەڵێ:

رۆڵە بۆ باسی کەرەشین ناکەن     من لە بێ ژنی بۆ رزگار ناکەن

* * *

«۱۱»

## ناوجی کردن و تالان

تفەنگ چییەک بە تەنیا لە کەل خانی بەینی سەقز و بانە ئـەڕواتـە خـوارۆ، دوو نەفەر دار بە دەس بەرەوژوور ئەبەن، چاویان لە تفەنگ بـە دەسـەکـەوه ئـەبێ تەگبیر ئەکەن کە تفەنگەکەی لێبسێنن، ئەڵێن بیکەیـن بـە شـەڕ و قیـڕه لـە بـەیـنی خۆمانا و هەڵمەت بەین لەیەک تا ئەگەینە لای ئەوجا تێهەڵـەچین ئـەویـش یێـت ناوجیمان ئەکا بە سووک و ئاسان تفەنگەکەی لێئەسێنین. بـەو جـۆره ئـەکـەن تـا ئەگەنە لای تفەنگ بەدەسەکە ئیتر بە ئاسانی تفەنگەکەی ئەبەن بۆ خۆیان لە دوایـیـا ئەڵێ: ئاخر ئەگەر من گەوج نەبم، لە کێخوایی کەلیخانم چی؟!

ئەگەر من ژیرم عەقڵم تەواوه     لە ناوجی کەلی خانم چی داوه

* * *

«١٢»

## هالەکۆک و زمسان

چیرۆکی ئەفسانەیە: ئەڵێن لە ئەووەڵی زمسانەوە بەفر ئەنێرێ بۆ هێجبی هالەکۆک، ئەڵێ: شووم پێبکات. هالەکۆک ئەڵێ:

نەپرچم هەیە و نەباڵ        چیمە لەسەر ماڵ و حاڵ

لە ئاخری زمسانا کە هالەکۆک پرچ و باڵ دەرێنێ ئەنێرێ بۆلای بەفر بێ با شووی پێبکا، بەفر ئەڵێ:

هالـــەکۆکـــەی پرچنـــێ        چیمە لە سـەر مـاڵ و ژنـێ
شۆڕە شۆڕە نیشتووە بن گونم        چیمە لـە سـەر مـاڵ و ژنم
مەڵێ نەزانی و عەقلت ناکۆکە        دیاریشوانشنگە یاهالەکۆکە

* ** *

«١٣»

## ئاشتیخوازی

ئەگێڕنەوە پیاوێ لە کۆماسی کچەکەی ژن کابرایێ ئەبێ لێی ئە سێنێتەوە و هەرچێ ئەنێرن بە شوێنیا نایەنێریتۆ. کە زۆری بۆ دێنن تەلاق ئەخوا مەگەر حاجی کاک ئەحمەد سلێمانی بێ بە شوێنیا ئەگەرنا نایەنێرمۆ. زاواکە بۆ پرسی ئەم تەلاقە ئەڕوا بۆ خزمەت حاجی کاکە ئەحمەد و بەلایۆ مەحاڵ ئەبێ کە زەحمەت کێشێ بڕوا بە شوێن ئەو ژنا. حاجی کاکە ئەحمەد ئەونە ئاشتیخواز ئەبێ ئەفەرموێ: من ئەڕۆم بە شوێنیا. بە سواری کەر لە سلێمانییۆ بە چەن مەنزڵ ئەڕوا بۆ کۆماسی. باوکی ژنەکە ئەڵێ قوربان من حەدم چییە کە تۆ بێیت بۆ ماڵ من. من هەر حەزم لە قەومی ئەم کوڕە نەبوو بۆیە ئەم تەلاقەم خوارد کە هەرگیز پێی نەدەمۆ ئیسە کە تۆ تەشریفت هێناوە هەرچێکی لێئەکەی بیکە ئەویش ئەیباتۆ بۆ ماڵ شووەکەی.

ئێمەیش بۆ ئاشتی خەلکی هـەروابـین        شوێن کەوتووی رێباز پیاوی خودابـین
بەشکو بە خاک پای ئەوان حەساو بین        سەربەرزو روو سوور هەردوو دونیا بین

* * *

«١٤»

## دوژمن له پێستی بزنا

بزنێ دوو کارژەلەی بوو ناویان تیتیل و بیبیل بوو، هەر رۆژێ ئەڕۆیی بۆ هەرد بۆ لەوەڕ ئەیوت: ئامان تا خۆم نەیەمۆ دەرگاتان لێدائەخەم بۆ کەس نەیکەنۆ نەکا گورگ بێ بتان خوات. گورگێ لەو دەورو پشتانە بوو، پێی زانین بە تەما بوو بیان خوا هات تەقەی دا لە دەرگا و وتی:

تیتل و بیبل ئەدالێ دەرگا کەنۆ بۆ دایەلێ

لە درزی دەرگاکەوە تەماشای گورگەکەیان کرد رەش بوو، وتیان دایک ئێمە سوورە. رۆیی بە خاکە سوورە خۆی سوور کرد و هاتۆ وتی:

تیتل و بیبل ئەدالێ دەرگا کەنۆ بۆ دایەلێ

تەماشایان کرد بە خاکە سوورە خۆی سوور کردووە، وتیان: دایک ئێمە زەردە. رۆیی بە خاکە زەردە خۆی زەرد کرد و هاتۆ هەر بەو جۆرە بانگی کردن. وتیان: دایک ئێمە رەشە رۆیی بە خاکە رەشە خۆی رەش کرد و هاتۆ و بانگی کردنۆ هەروەک ئەوجار

وتیان دایک ئێمەیە بزنۆکێ دوو شاخی هەیە بزبزۆکێ

رۆیی دوو شاخی دروست‌کرد و هاتەوە وتی:

تیتل و بیبل ئەدالێ دەرگا کەنۆ بۆ دایەلێ

وتیان دایک ئێمە خۆی کلیلێکی واپێ خۆ تۆ کلیلت پێ‌نیە، دایک ئێمە نیت و درگات بۆ ناکەینۆ. ئاخری درگاکەی شکان و چووە ژوورۆ و تا تیتیلی خوارد بیبیل خۆی شاردۆ. دایکەکەیان هاتەوە وتی: بیبیل چی بووە؟ وتی: گورگەکە بە هەموو رەنگێ خۆی گۆڕا لە ئێمە کە بێ بمان خوا ئێمە بە هیچ جۆرێ درگامان بۆ نەکردۆ تا خۆی بە زۆر درگای شکان و تیتیلی خوارد و من خۆم شاردەوە. بزنەکە لە شیری خۆی کیتەلەیە ماسی برد بۆ قازی و رۆیی بۆ شکات. کە لەگەڵ گورگەکە روو بە روو بوون قازی وتی: بڕۆن شەڕکەن بزنەکە بە هەردوو شاخی بە هەموو هێزێ سەرێکی دا لە گورگەکە و کوشتی و گۆشتی تیتیلی کرد بە زەهری. ئەم چیرۆکە دەرسی ئەوەمان پێ ئەڵێت کە هەمیشە دوژمن

بۆ ئێمە وا لە کەمیندا ئەبێ بە هیچ ڕەنگێکی بڕوا نەکەین تا تووشی زەرەر نەبین و دوای زەرەر ئەگەر قازیش بێ بە دەنگمانۆ بەرتیلی هەر ئەوێ.

دوژمــن هــەمیشه وا لـه کـەمینا دلـی هــەمــیشه پڕیــه لـەقینا

خۆش بڕوا مەبه و بڕوای پێ مەکه هـــەرووەک دوژمنه تەرێزی لێ کە

قەت بـــڕوا مەکه به درۆی دوژمن با زەرەر نەکەی تۆیش هەروەکو من

❊ ❊ ❊

«١٥»

## خزمەتی باوک

کوڕێ باوکێکی زۆر پیری بوو دوای چەن ساڵ خزمەت کردنی مانوو بوو ڕۆژێ سوار کەرێکی کرد بردی بۆ جێگایەکی زۆر دوور کە بەجێی بێلێ بۆ دڕندەیێ بیخوا. گەیشتە ئەو جێگە دایبەزان ئازا دەسی کرد بە پێکەنین و وتی: باوە بۆچی پێ‌ئەکەنی خۆ ئەمەوێ لەگرە جێت بێلم. وتی: ئەزانم بەلام بەو پێشانە پێ ئەکەنم کە پێشەی باوکمن. شوکور خوا جەزای باوکمی لێ‌سەندم کە لێرا منیش ئەوم بەجێ هێشت و دام بە دەم دڕندەوە. کوڕەکە سوار کەرەکەی کرد و بردییەوە بۆ ماڵ تا مابوو بە هەموو جۆرێ خزمەتی باوکی ئەکرد و ئەیوت: نەکا منیش پیر بم و بێ‌حورمەت بم و وەها توورم دەن.

تۆ چۆن بووی بۆ باوکت مناڵ وائەبێ بۆ تۆ

دەرسی باشیـان دابـدە ئەوانیش وابن بۆ تۆ

دایکت ئەجری زۆرترە کە زەحمەتی زۆرترە

دڵداری ئەو لە باوکت بە دەرەجات چاکترە

نۆ مانگ بە سک هەڵتەگرێ بە شیر بەخێوت ئەکات

بەرزی شان و شەوکەتت بۆ ئەو ئەبێ بە ئاوات

❊ ❊ ❊

«۱٦»

## باوک و دایک و کاتی پیری

پیاوێکی پیر لە عومری هەشتا ساڵیدا جووتی ئەکرد تا ئێوارە زۆر بە غیرەت و ئازا بوو. لە دواییا کەوت و نەیئەتوانی دەرودەشت بکات. رۆژێ خەبەرم لێپرسی چۆنی؟ وتی کەوتووم و سێ کوڕ و سێ کچم هەیە لەوانەیە بە کارم نەیەن، وتی: باوک و دایک زۆر بە غیرەتن کە پانزە مناڵ لە کچ و کوڕ، بە ناز و نیعمەت بەخێو ئەکەن کە ئەو منالە لە دایک دائەکەوێ پارچە گۆشتێکە بە خێوی ئەکەن تا پێ ئەگرێ و ئەکەوێتە سەر پێ و پێئەگا و ژنی بۆ ئێنن یا ئەیدەن بە شوو و دوای ئەویش کە جیا ئەبنۆ بێوچان خزمەتیان پێئەکەن تا ئەبن بە ماڵ تۆپ، نایان جوڵێنێ. لە ئاخر عومرا سێ چوار ساڵ باوک و دایکەکەی ئەکەون ئەو هەموو مناڵ و مناڵەزا بە کار ئەو دایک و باوکە نایێن. جا ئەو پیرە پیاوە خوا عەفووی کا تا زیاتر لە ۹۰ ساڵ عومرا ما و کەچی راستی کرد مناڵەکانی لە خزمەتیا نۆرەیان ئەکرد و بە باشی خزمەتیان نەئەکرد.

بە تەمای مناڵ مەبە تا ماوی      بەکارت نایێن کاتی داماوی
حەقی دایک و باوک مناڵ ئەیسێنێ      ئەویش وەکوو تۆ تیا دائەمێنێ

وایش رێئەکەوێ کە کوڕی وا هەیە زۆر باوک و دایکیان لێرازییە. پرسیم لە پیاوێ کە تاقە کوڕێکی هەیە، حاجی کوڕەکەت چۆنە؟ وتی: لەوە خاستر خوا هەڵناگرێ خوایش وەکوو من لێی رازی بێ.

* * *

«۱۷»

## وەک سەگ بە وەفا بە

حاکمێ چوار سەگی راگرتبوو لە سەر پلاو و گۆشت دایبەستبوون کە هەروەختێ رقی لە کەسێ هەڵسێ بیخاتە بەریان بیخۆن. وەزیرێکی بوو زۆر لەو رۆژە ئەترسا بە عەقڵی خۆی لە ترسی ئەو رۆژە هەرچێکی بوو زیادتر لە نیوەی ئەدا دەرخوارد، دەس و پێی ئەو حاکمە کە هەر رۆژێ گیری کرد هۆشیان پێوەبێ نەجاتی بدەن کە ئەو سەگانە نەیخۆن. کوڕێ ژیری بوو، شەوێ لێی پرسی بابە تۆ

بۆچی ئەونە وای لە خزمەت ئەم نۆکەرانی حاکما، وتی: ئەترسم وەختێ بێ حاکم رقی لە من هەڵسێ و بمخاتە بەر ئەم سەگانە بەشکوو رووگیریان بکەم کە لەو وەختا هۆشیان پێمۆ بێ. وتی: باوکە من وا ئەزانم ئەم خزمەتە بە سەگەکانی بکەی باشترە کە خۆت بە دەس خۆت نان و نیعمەتیان بۆ ببەی کە لەو وەختا نەتخۆن. باوکی وتی: تەگبیرێ باشت کرد. بە دەسی خۆی هەموو رۆژێ نان و گۆشتی ئەبرد بۆ سەگەکان تا تەواو دەسەمۆی کردن. حاکم رۆژێ قەهری کرد دەستوری دا چوار شەو و چوار رۆژ خواردن نەدەن بەو سەگانە، لە دواییدا بیخەنە بەر سەگەکان. دەستووریان بەجێ هانی و بە چوار پەل بەسراوێ وەزیرەکەیان خستە بەر سەگەکان، سەگە بەوەفاکان دەستیان ئەهانی بە سەر و روویا ئەیان لستەوە پێنج رۆژ لەویا بوو بەو هەموو برسێتییەوە دەمیان لێنەدا مەعموورەکان رۆیین بۆ خزمەت حاکم وتیان نازانین وەزیر چ سیحرێکی کردووە لەم سەگانە بەم برسیەتیەوە دەمی بۆ نابەن و سەر و رووی ئەلیسنەوە. وتی: برۆن بیکەنەوە بیهێنن بزانین چیە. رۆیین هێنایان وتی: وەزیر حیکمەتی چیە ئەم سەگە برسیانە دەم نادەن لە تۆوە؟ زووتر هەرکەسیان بەردەس کەوتایێ زۆر زوو لەت و پەتیان ئەکرد و ئەیانخوارد. وتی: حاکم من بە تەگبیری کورەکەم لە زووەوە خزمەتیان ئەکەم ئەوانیش بە وەفان کە منیان نەخوارد. حاکم وتی: لە یەکێ لە نۆکەرەکانم نەبیستووە کە باسی تۆ بکەن، سەگ لە سپڵە باشترە. ئەمە ئەوەیش ئەگەیەنێ من کە خزمەتی تۆم کردووە باوەرەم نەئەکرد کە سپڵە بی و بەم خزمەتی منە نەزانی، رۆژێ لە رۆژان بمخەیتە بەر ئەو سەگانە، بەڵام ئەمزانی ئەیکەی کە خۆمم بۆ حازر کردبوو. ئەمە کە نووسیومە لە کتێبی «ریاض الخلود»ی مەلا ئەبووبەکری موسەننیف چۆرپدا دەرم هێناوە.

نان بدە بە سەگ مەیدە بە سپڵە     سەگ بە وەفایە و پشیلە سپڵە

خۆمان بە چاوی خۆمان دیومانە کە پیاوێ سەگێکی بوو لە گەڵ نەفەرێ زۆردار شەڕی بوو، ساحێب سەگەکەیان نا ژێر، سەگەکە قەپی کرد بە پای زۆردارەکەدا لە سەر ساحێبەکەی. وەکوو لە کتێبا دیومانە یەکێ لە ئەسحابی پێغەمبەرﷺ بە ناوی ئەبوهورەیرەﷺ کە زۆر پشیلە و بەچکە پشیلەی خۆش ئەویست و خزمەتی ئەکردن و لە بەر ئەوە کە پێغەمبەرﷺ ئەی فەرموو لە ئیمانە

.................................................................

خۆش‌ویستنی پشیله، که فەوتی کرد و نەیتوانی خۆراکیان باتێ دەموو چاویان کراتۆ و خواردیان.

*** 

«۱۸»

## ئۆجاخ کوێر

پیاوێ کوڕی نەبوو و زۆر حەزی لێ‌ئەکرد و بە دەوا و دۆعا خۆێ زۆر مانوو ئەکرد کە چاری نەما پێیان وت لە فلان جێ دارێ هەیە هەرکەس چەن شەو لە پاڵ ئەو دارا شەو بە رۆژ کاتۆ خوای گەورە بە هاواریەوە ئەگەیێ و نیازی بۆ بەراوردە ئەکا چەن شەو تا بەیانی لە پاڵی ئەو دارا شەوی رۆژ کردۆ تا لە ئاخردا خوا کوڕێکی پێدا. کە کوڕەکەی گەورە بوو رۆژێ ئەم بەسەرهاتەی خۆیە بۆ کوڕەکەی ئەگێڕاوە وتی: باوکە خۆزگە ئەو دارتە نیشان ئەدام. وتی: رۆڵە بۆ چیتە؟ وتی: تۆ چەنێ لە پاڵ ئەو دارا پاڕاویتەوە خوا منت پێ‌بدا من دوو ئەونە ئەپاڕێمەوە خوا تۆ بباتۆ.

کوڕ بێ‌وەفایە و ماڵ وێران کەرە　　　بوون و نەبوونی هەر دەردی سەرە
وەجاخ زۆر کەسیان کوێرۆ کردەوە　　　ئابڕوویان لە ناو عالەم بــــردووە

*** 

«۱۹»

## زوان بازەم سەرەم سلامەت

رۆژێ پیاوێ رۆیی بۆ خزمەت بالـوول، پرسی پێکرد ئـەمەوێ بـڕۆم بـۆ تیجارەت، باڵوولی دانا چی بێنم باشە؟ وتی: خوێ، رۆی خوێی سەند و هاتۆ، خێرێ زۆری کرد. جارێ‌تر وتی: باڵوولە شێتە چی بێنم باشە، وتی: پیاز. پیازی سەند و زەرەرێ زۆری تیاکرد، دوایی بۆ زەرەر پیازەکە گلەیی کرد. باڵوول لە جوابا وتی: تۆ ئەوەڵ‌جار منت بە دانا دانا، تەگبیری باشم بۆ کردی، لە دواکەڕەتا منت بە شێت دانا شێتیش هەر ئەوەندە ئەزانێ.

با زوانت خۆش‌بێ لەگەڵ هەمووکەس   با تووشی زەحمەت نەبێ لە هیچ‌کەس
زوان ئـامـانـە ئـاورووپـووشـی   مـەبـە بـە بـاعیس دەرد و ناخۆشی

* * *

«۲۰»

## ڕێنمایی باش

کوڕێ دایکێکی بوو کە هەمیشە ڕێگەی دزی و حیزی و خراپکاری دائەنا بۆ کوڕەکەی، کەڕەتێ بە دزی و جەردەییەوە گرتیان و مەحکووم بوو بە ئیعدام لە پێی قەنارەدا وتی: خۆ ئەمکوژن دایکێ پیرم هەیە بانگی کەن بۆلام، خواحافیزی لێ کەم. ڕۆیین هانییان وتی: دایە گیان زوانت دەربێنە ئـاخر عومرمـە بـا تێر بیمژم بـە داخی تۆ با خۆم نەکوژم، زوانی نایە دەم کوڕەکەی و قەپی پیا کرد و قرتانی وتی: ئەم زوان تۆ منی دا بە ئیعدامدا. با داخ لە دڵم دەرچێ.

زوانێ لە حوکمی خوای خۆی دەرچێ   بیقرتێنە با لە بێخا دەرچێ

* * *

«۲۱»

## دەم خەڵکت بۆ نابەسرێ، خۆت ژیر بە

ڕۆژێ لوقمان مۆچیاری کوڕەکەی ئەکرد وتی: هەروەخت گمیزت هـات بیکە. گمیز حەبس کردن زەرەری زۆرە. دوای ئەوە ڕۆژێ لە سەر سوارییۆ گمیزی هات فەوری دابەزی گمیزەکەی کرد و گوێی نەدا بەوە خەڵک دیارە زۆر مەنع و لۆمەیان کرد، حەتا لای باوکیشی وتیان کە بێ ئەقڵی کـردووە لـەم کـارا. بـاوکی وتی: ئەگەر ژیر بوایێ هەر بە سەر ئەسپەکەوە گمیزەکەی ئـەکـرد ئـەونـە حـەبس گمیز خراپە. ڕۆژێ باوکی وتی: با سەفەرێ سێ چوار سەعاتی بکەین، بڕۆ کەرەکە کۆپان کە، ڕێکەوتن لوقمان سوار بوو تا ماوەیێ، تووشی یـەکـێ بـوون وتی: ئـەم پیاوە چەنێ خراپە خۆی سوار بووە ئەم کوڕە تازە پێگـەییویـە خستووتە بـەردەمی خۆی. لوقمان دابەزی و وتی: دەی تۆ سوار بە با ئیرادمان لـێ نـەگیرێ. کـوڕەکـە سوار بوو تا ماوەیێ یەکێکی‌تریان پێ گەیی وتی: بڕوانە ئەو ریش سپییە بە پیادە وا لە بەردەم ئەم کوڕۆ کە سوار بووە. وتی با هەردووکمان سوار بین کە هەردووکیان

سوار بوون یەکێکی تریان پێ گەیی وتی: بڕوانە ئەمانە چەنێ بێ ڕەحمن کە دوو نەفەر مل قەوی سوار ئەو کەرە فەقیرە بوون. هەردووکیان دابەزین کەرەکەیان دابەر، یەکێ تریان تووش بوو وتی: ئەم دوو نەفەرە کەرێکیان هاپێ و هیچکامیشیان سواری نابن. وتی: ڕۆڵە ئاگات لێ بوو ئێمە بە چوار جۆر لە گەڵ دڵ خەڵکا هەڵسووڕاین هەر بۆمان ڕازی نەبوون. باش وایە هەرچی خۆمان بە باشی بزانین و خیلاف شەرع نەبێ بیکەین و گوێمان لە قسەی کەس نەبێ.

مەکەوە شوێنی واتە و ویتەی کـــەس     هەر ڕەزای خوای خۆت کە بە مەبەس
گوێ لە مشت مەبە بۆ دووژمن‌ودۆس     دۆس خوا نەبێ کەس مەکە بــە دۆس
وایە ئیمــانــدار دۆسی خــودایــە     بــێ ئیمان بە کار دۆسی کەس نایــێ

* * *

«۲۲»

## ئافەرین ژنی عاقڵ

دوو نەفەر ڕەفێقی گیانی گیانی بوون. ڕۆژێ یەکێکیان ئەویانی دەعوەت کرد و لە گەڵ خۆی بردی بۆ ماڵۆ. کە گەیینە حەوشەکە دارێ کاج لەویا بوو ساحێب ماڵەکە لە پێش هەموو شتێ چوو بۆلای کاجەکە بازێ دەسی پیا هاورد جا هاتۆ بۆلای میوانەکە. ڕۆیینە ماڵۆ زۆر بە باشی و بە خۆشی و ڕێزەوە پەزیرایی لێ کرد و بەڕێی کرد. دوای چەن ڕۆژێ تر بە یەک گەیشتن. میوانەکە وتی: لەو ڕۆژەوە بووە بە مەراق بۆم کە گەیینە حەوشەکە بۆچی تۆ لە ڕێوە چووی بۆلای کاجەکە؟ ئەویش وتی: من لە بازاڕا مامەڵە ئەکەم و زۆر موشکلات رووی تێ ئەکردم و بە ناڕەحەتی زۆرڕۆ ئەڕۆییمۆ بۆ ماڵۆ، کە ژن و منالم ئەهاتن بە دەور و پشتما خەش خۆمم بە وان ئەڕژاند و تەق و پۆقم لێ دائەنان، ڕۆژێ بە دڵێ پڕ لە ناڕەحەتییۆ ڕۆیمۆ بۆ ماڵۆ ژنەکە هات بە دەممۆ و بردمی بۆلای ئەو دارە کاجە، وتی: هەروەختێ دێیتۆ بۆ ماڵۆ هەرچێ خەم و ناڕەحەتی وا لە دڵتا هەڵیواسە بەم دارا جا خۆت بێ خەم بێرە ماڵۆ. تۆ لە دەرۆ عاجزت ئەکەن بە ئێمە چی با تا بەیانی رووت لەگەڵ ئێمە خۆش بێ و بێ خەم نان و ئاوێ بە یەکۆ بخۆین تا بەیانی خوا کەریمە و بەیانی تەماشای هەموو ئەو خەمانە کە هەڵت‌واسیون بە کاجەکەدا هەموو

با بردوویەتی!. لەو ساوۆ هەموو رۆژێ هەروا ئەکەم و حاڵ بە دەنی و ماڵیم زۆر بەرەو باشی ئەڕوا خوا لەو ژنەم رازی بێ.

ژنی خاس کۆمەک عەقلێ و ماڵییە　　ژن خراپ بایس سەر جەنجاڵییە

* * *

«٢٣»

**تریاک دین و شەرەف و نامووس و ماڵ و مناڵ تیا ئەبا**

سەربازێ لە ئەهوازا سەرباز ئەبێ رۆژێ شۆفیرێ تەسادوف ئەکا و ئەدا لە مناڵێ کە باوکی لەگەڵی ئەبێ، نەختێ زەخماری ئەکا. ئەیانخاتە دوای ماشینەکەی کە بیانبا بۆ بیمارستان تا ئەگەیێنە بیمارستان مناڵەکە ئەمرێ. شۆفیرەکە زیندان ئەکەن و موحاکەمەی ئەکەن و شکات ئەکات ئەڵێ من لێمدابوو وکەمێ زەخمی بووبوو. وەلێ من لەو پیاوە کە وا لەگەڵ ئەو مناڵا مەشکووکم، ئەو مناڵە زەخمییە ئەو کوشتوویەتی، بزانن چییە وە لەبەر چی کوشتوویەتی. تەحقیق ئەکەن کە ئەو پیاوە باوکی ئەو کوڕەیە لەبەر ئەوە کە موعتاد بووە کوڕەکەی خۆی کوشتووە و ناویەسە مل ئەو شۆفیرە کە پوولێکی گەزافی لێبسێنێ بۆ خەرجی ئیعتیادەکەی جا با بزانین کە تریاک چەندە دوژمن ماڵ و مناڵ وئابڕووی ئینسانە.

تریاک تەریکت ئەکا لە خەڵکی　　تەرکی کە هەتا پیاوێ بە کەڵکی
ماڵێ کە هەتە مەیدە بە دووکەڵ　　خۆت رەشۆ مەکە وەک مەشکەی دووکەڵ

* * *

«٢٤»

**بلوێر و سەما**

ئەڵێن یەکێ بلوێر ژەن شوان گاگەل ئەبێ لە دێی کانیمانگا

(بلوێر و لولە و شمشاڵ یەکێکن　　هەریەکێ واتەی مەملەکەتێکن)

جا رۆژێ گاگەلەکەی مۆڵ ئەدا لەو وەختا شەوقێ زۆر، رووی تێئەکا بە سۆزێ زۆر خۆش فوو ئەکا بە بلوێرەکەیا بە سۆزێکی وا ئەو و گاگەلە گشت یێنە سەما و هەڵپەڕکێ، مانگای پیرەژنێ کە زۆر خزمەتی ئەکا و بەو مل بوو، بوو بە سەرچۆپی کێش، کە ئاگای لە خۆی نەمابوو کەوت بە عەرزا رانێکی شکا و خۆی

دا به ئەرزا. شوان شایی لیٚ‌شیٚوا و بەهەر جۆر بوو مانگاکەی بردۆ بۆ پیرە ژنەکە. پیرەژن چەن رۆژیٚ خەریکی خزمەتی بوو چاکۆ نەبوو، وتی: پیٚی ئەبژیٚرم بردی بۆ لای قازی، قازی حوکمی دا بە سەر شوانەکەدا بیبژیٚریٚ. لە دواییا وتی بە شوانەکە: چش کە لە گشتیٚ، فوویٚ کە بە بلویٚرەکەتا، ئەویش فووی پیا کرد لە سۆزی بلویٚرەکە پیرەژنەکە و قازی هاتنە سەما و قازی ئەیوت نایکەویٚ پیرەژن ئەیوت بیشم‌کەویٚ نامەویٚ بیشم‌کەویٚ نامەویٚ.

بۆ خۆشی ئەمەم نووسیوە لیٚرا　　عیتاب‌مەگرن لیٚم‌ئەی‌خوشک‌وبرا
لە بازیٚ کاتا شۆخی زۆر خۆشە　　دەرمانی دەردی دڵی نەخۆشە

* * *

«۲۵»

## جوانی

کابرایە پیر ئەبیٚ، تەبیٚعەتەن سەری دانەواو بوو، جوان عومریٚ لیٚی ئەپرسیٚ خالۆ چیت گوم کردووە وا سەرت دانەواندووە بۆی ئەگەڕیٚ؟ وتی: جوانیم گوم کردووە لەوەناچیٚ تازە بیدۆزمەوە.

جوانیم باری کرد پیری هاتە پیٚش　　ئەندامم هەموو یەک جار هاتە ئیٚش
بووم بە مەسخەرەی ناو شار و لادیٚ　　عومر وەفاکات تۆیش واتە لیٚ‌دیٚ

* * *

«۲٦»

## سوالکەری

کوڕە پاشایەک حەزی ئەکرد ژن بیٚنیٚ، رۆژیٚ تیٚکەوت بە ناو شارا کە کچیٚ زۆر جوان پەیاکا کە ویٚنەی کەم بیٚ. کچیٚ بەو دڵ خوازی خۆیە کەوتە بەر چاوی ها لەگرە و ها لەویٚ کەوتە شویٚنی تا لە شار دەری کرد رووی کردە قەسر و عەمارەتیٚ عەجایەب بە عینوانی میوانی «تۆالباب»ی کرد و بە رووی خۆشۆ هاتن بە دەمیۆ. ئەویش سەرسام ما، وتی: ئاخۆ ئەمە ماڵی چ ئەعیانیٚ بیٚ. لەو هەیوانا کە تیایا دانیشت‌بوو، تەماشای کرد سوال کەریٚ بە لباسیٚ دڕاو و چڵکنۆ هاتە حەوشەکە، بەینیٚ ون بوو لە دوایا تەماشای کرد پیاویٚ جوانخاس و تەمیس بە

.........................................................................

لیباسێ تەمیسۆ هات بۆلای وەکوو ساحێب ماڵ بەخێر هاتن و پەزیرایی لێ کرد. میوانەکە وتی: تۆ ساحێب ئەم ماڵیتە؟ وتی: بەڵێ من خزمەتکارم. خۆی بە خاوەن ماڵەکە ئاشنا کرد کە من فلانکەس کوڕی فلانکەسم بۆ داوای ئەو کچ تۆ هاتووم. ئەویش وتی: من سواڵکەرم هەر لە منالییۆ کاسبیم سواڵکەری بووە و ئێستەیش سواڵکەرم و ئەو سواڵکەرە کە هاتە حەوشەکە من بووم. وتیان میوانمان هەیە چووم خۆم گۆڕی بەم هەیئەتە هاتم بۆلای تۆ هەرچێ ماڵ دونیا لەم ماڵا ئەیبینی هەمووی هی سواڵە. وە ئەو کچ منە بۆ تۆ نابێ، شت زۆر ها لە پێیا. کابرا وتی باشە. باوکەکە وتی: ئەمانە شەرتی ئەوەیە کە بە سواڵ پەیای کە بیهێنی بۆمان چوون سواڵ کیمیایە. وتی: باشە. ڕۆیی لە ماڵۆ بۆی هانی و بازێ تەماشای کرد وتی: ئەمانە سواڵی نین نامەوێ. زاوا وتی: تۆ چۆن ئەزانی ئەمانە سواڵی نین؟ وتی: حەیا بەڕووتۆ ماوە، تەواو نەتکاوە بۆیە ئەزانم. زاوا کە زۆر حەزی لەو کچە بوو کەوتە سواڵ بۆ جیهاز، دوای چل شەو وای لێهات وتی: سەڵتەنەت ئەمەیە کە سەرمایەی ناوێ و قەت زەرەر ڕووی تێناکا. ڕۆژێ خەزوورەی لە ئوتاقێ یەک نەفەری حەماما بوو تەقەی دا لە دەرگا وتی: فەقیرم ڕەحمم پێکە شتێکم بەرێ! وتی: لێرا خۆ هیچم نیە بتدەمێ. زاوا ئەوی نەناسی وتی: لەو تووکە بەرتە دوو تاڵم بەیتێ هەر باشە دوو تاڵێکی دایێ. لە دڵ خۆیا وتی: مەگەر ئەو زاوا تازەمە جێی من گریتۆ و زۆر دڵی پێخۆش کرد. خۆلاسە زاوا دەسی لە کوڕە پاشایی هەڵگرت و بوو بە سواڵکەر و جیهازی ڕێک خست و کچە سواڵکەری گۆێزاوە.

بۆیە وتراوە: سواڵی کیمیایە     قازانجی زۆر و زەبەنەی تیایە
بە بێ زەحمەت و بەبێ سەرمایە     هەر چۆن حەز بکەی بۆ تۆ وەهایە
هەرکەس فێری بوو قەت تەرکی ناکا     حەیا نەختێکە کە تکا تکا

وەلێ حەدیس ئەفەرموێ: هەرکەس سواڵکەر بێ لە قیامەتدا گۆشت بە دەم و چاویۆ نامێنێ لە خەجاڵەتییا کە بۆ ژیان دونیا دانەنیشتووە بە لای خوداوۆ و ڕازی نەبوە بە بەشی ئەو و چووە سواڵی کردووە.

* * *

«۲۷»

## سافی ژێری پێ

لە زەمانی رەزاشادا ئەووەڵ دەورەی سەربازی مەریوان ساڵی ۱۳۱۸ شەمسی، نەفەرێ ئەولواحید ناو نشکاشییان گرت بە سەرباز. ئەوەنە پێی گەورە بوو دەوڵەت کەوشی وای نەبوو کە بە پێی بکا لەبەر ئەوە لە سەربازی مەعاف بوو ئێستەیش هەرکەسێ ژێر پێی ساف بێ، یانێ چاڵی پێی نەبێ لە سەربازی مەعافە. مومکینە ئەمیانە لەبەر ئەوە بێ کە پێغەمبەرﷺ ژێر پێی ساف بووە و هیچ چاڵی تیا نەبوە.

* * *

«۲۸»

## لەقەی قاترەکە رۆنەکەی رژاند

دوو نەفەر شەڕیان بوو قەرار بوو بڕۆن بۆلای قازی. یەکێکیان دەست و بردی کرد تەنەکەیێ ۱۸ کیلۆیی رۆن حەیوانی برد بۆ ماڵ قازی کە هۆشی پێوەبێ. ئەویان دەهەن دارتر بوو توولە قاترێکی بۆ برد. وەختێ روو بە روو بوون ساحێب رۆنەکە تەماشای دەم و دووی قازی کرد بە بار ئەوی‌ترا ئەخوێنێ وتی: قوربان بڕوا ئەفەرمووی چاک کەواکەت چەور بووە! رۆنەکەی بیر خستۆ وتی: بەڵێ توولە قاتری توورەمان هەیە لە حەوشا تەنەکەیێ رۆنمان دانابوو جووتەیەکی لێدا و هەڵی پژانۆ بە چاکەکەما، ئیتر دڵنیا بوو کۆمەک بەو ئەکا ئەو چەورترە و گوێ بە شەرع نادا، قازی تا یەکێکیان وا لە بەهەشتا دوانیان وان لە جەهەننەما و ئەویانە لە رووی زانین و شەرعۆ حوکم ئەدا وا لە بەهەشتا و ئەویانە کە لە نەزانیۆ حوکم ئەکا وا لە جەهەننەما لەگەڵ ئەویانا کە ئەزانێ و بۆ تەماع لە شەرع لائەدا.

رشوەدەر و رشوەخۆر هەردوو وان لە عەزابا

هەردوو خەجاڵەت بار و روو زردن لە حیسابا

* * *

«۲۹»

## دوو ژن بۆچی؟

کابرایێ مەریوانی چوو بۆ لەیلاخ بۆ کاروان لە وەختی قاتی و گرانییا. رۆیە مالێ وتیان: ئێمە گەنممان هەیە بی‌سێنن، لەو وەختا گەنمەکەی ئەپێوا وتی: ئەم گەنمەم بۆ کاری خێر ئەوێ گەنمی باشم بەنێ و بە هەرزان بۆم دانێن وتیان: کاری خێر بۆ چیتە؟ وتی: ژن یەنم. ژنە ساحێب مالەکە وتی: ژن بۆکێ؟ وتی: بۆ خۆم. وتی: ژنت نیە؟ وتی: ئەیکەم بە دوان. وتی: وەڵلا خەلە لە مال ئێمە نابەیتە دەرەوە، چۆن ژن یەنی بە سەر ئەو ژنە خاسا. هەرچێکی کرد ئەو ژنە، خەلەی نەدایێ.

***

«۳۰»

## وەی لە بێ‌حەیایی ژن

پاشایێ لەگەڵ وەزیرێکیا رۆیین بۆ راو چاویان کەوت بە جوتیارێ خەریک بوو جووتی ئەکرد، بەو هەموو مانووییە لەم سەرا و لەو سەرا گۆرانی ئەوت و هەڵئەپەڕی. شا زۆر بە لایۆ عەجایەب بوو وتی: بە وەزیر بۆچی واتە؟ وەزیر وتی: دڵ مالۆی خۆشە، ژنەکەی زۆر بە خزمەتە. شا وتی: ئێمشەو بین بە میوانی بزانین حالی مالی چۆنە. دوای دەس هەلگرتنی دوور و نزیک کەوتنە شوێنی تا لەگەڵ ئەوا نزیک مالی بوونۆ تەماشایان کرد ژنەکەی بە روویێ خۆشۆ هات بە دەمیۆ سەلامی لێ‌کرد و ئە سپابەکانی لێ‌وەرگرت و گاکانی بردە ژوورۆ ئالف و ئاوی پێدان، کە چوونە ژوورۆ تەماشایان کرد جێی بۆ راخستووە و پالشتی بۆ داناوە و چێشتی بۆ لێ‌ناوە و هەموو وەسائیلی ئیسراحەتی بۆ ئامادە کردووە. وەزیر وتی: نەموت دلی خۆشە؟. ئەو شەوە میواندارییەکی زۆر چاکیان لێ‌کردن. شا مرخی چووە سەر ژنەکە و وتی بە جووتیارەکە: من سێ ژنم هەیە تەلاقیان ئەدەم بۆ تۆ، تۆیش ئەم ژنتە تەلاق بدە بۆ من. جووتیار زۆری پێ‌خۆش بوو. تەلاق بە تەلاقیان کرد.

دوای ئەوە حەیایان هەڵهات، شا تاقە ژنەکەی مارەکرد و بردی بۆ خۆی و جووتیاریش هەرسێ ژنەکەی مارەکرد و لەگەڵ خۆیا هێنانیە بۆ ماڵۆ. لە ڕێدا چەمێ کەوتە بەریان. یەکەیەکە ژنەکانی کردە ئەوبەرۆ لە ناوەڕاس ئاوەکەدا پرسی لە هەوەڵیان شا لە چی تۆ نارازی بوو وا تەلاقی دای؟ راسی نەڵێی ئەتخەمە ناو ئاوەکە، وتی: دز بووم. وتی: قەی ناکات چارە سەری ئەکرێ. هەر لەویا لە دووهەمی پرسی بۆچی شا تەلاقی دای؟ راس نەڵێی ئەتخەمە ناو ئاوەکە، وتی: حیز بووم. وتی: چارەسەری ئاسانە. هەر لەویا لە سێهەمی پرسی: بۆچی شا تەلاقی دای؟ راس نەڵێی ئەتخەمە ناو ئاوەکە، وتی: بێحەیا بووم. دای بە دەم ئاوۆ و وتی: بڕۆ چاری تۆ ناکرێ. وەک وتوویانە «بێحەیا دای لە دەریا تەڕ تەڕ نەباشد» بە خۆشی لەگەڵ ئەو دوانەکەیتر هاتۆ بۆماڵۆ. ئەویانە کە وتی دز بووم هەموو ماڵەکەی خستە ژێر دەستی و وتی: بە مەیل خۆت چی ئەدزی بیدزە کە دڵ پاکی شووەکەی تەماشا کرد زۆر تەریقۆ بوو تەوبەی کرد لە دزی کردن. ئەویانە کە وتی حیز بووم، لە ماڵێکی دوو درگادا داینا و وتی: ئەگەر یەکێ هات بۆت با لەم درگاکەوۆ هات لەویانۆ راکا! ئەویش خەجاڵەتی گرتی و لە حیزی تەوبەی کرد. وە شا کە عورزەی ئیدارەی ماڵی کەم بوو، تاقە ژنەکەی لە دزی و حیزی و بێحەیاییا جێی هەرسێکی گرتۆ. بۆیە وتوویانە: ژن بە ساحێب ئەگۆڕێ.

ژن بێ حەیا بوو حەیای تۆیش ئەبا  هەرکەسێ ژێرە تا زووەلای با

تەبیعەت هەرکەس هەر جۆرێ بێ  ناگۆڕێ هەتا حەیاتی تیا بێ

* * *

«٣١»

## سیر پۆشین

لە باسی جەوانمەردی پیاوا کوڕ پاشایێ کچە پاشایەکی بۆ یێنن. مەسەلا وەکوو شای ئێران کە زوو کچی پاشای میسریان بۆ هانی. ئەو شەوە کە زاوا ئەڕوات بۆلای بووک، تەماشا ئەکا بووکەکە برین ئەبژێریت ئەڵێ: چیتە؟ ژنەکە ئەڵێت: خەجاڵەتیم بەسەر هاتوو و ئاوامە لەبەر چاوتا. کوڕەکە ئەڵێ: من تەمایەر بووم زاوابم ئێستە ئەبم بە مامان، هیچ خەم مەخۆ ئەم سڕتە بۆ ئەشارمۆ تۆبە بکە

خوا درگای تۆبەی لە کەس نەبەستووە. بووکەکە کوڕێکی ئەبێ زاوا ئەڕوا بۆلای پیرەژنێ ئەڵێ کارێکم هەیە بە تۆی ئەسپێرم، نابێ نە باوکم و نە دایکم و نە کەسی‌تر لە دەمی تۆی ببیسن ئەم کارەم بە مەحرەمانە بۆ دروس بکە، نازانم ئەمشەو کێ بووە مەلۆتکەیەکی لە دەور مەنزڵەکەی ئێمەدا تووڕ داوە، ئەبێ تۆ دایەنێکی باشی بۆ پەیاکەی بە خێوی بکا، بە زیاوۆ کرێ بە تۆیش و بە ویش ئەدەم. داپیرە ئەڕوا دایەنێ پەیائەکا. مناڵەکەی بۆ ئەبات تا گەورە ئەبێ و ژن و مناڵی ئەبێ و خۆی دەسەکا بە گیرفانی خۆیا بۆ خەرج و نەفەقە، هەر کوڕە پاشاکە خەرجی ئەکێشێ. بڕوانە ئەم جەوانمەردە لەبەر خوا چ کارێکی کردووە بۆیە وتوویانە:

ئەگەر گەرەکتە بەهەشت بنۆشی    نەوسێ کوێر بکە و سرێ بپۆشی

* * *

«٣٢»

## نامەحرە م و ژنی بە حەیا و پاک داوێن

ئەگێڕنۆ لە زەمانی زوودا ژنێ شوو ئەکا لە دوور وەکوو لە شارەزوور بێ بۆ مەریوان. زۆری پێ‌ئەچێ، تاقەتی ئەچێ بۆ ماڵ باوکی. بارگەیەکی بۆ ئەڕازێننۆ نۆکەرێ ئەخەنە تەکی کوڕەکەی بۆ هەڵئەگرێت و ئەکەوێتە بەرێو ئەڕۆن، ئەم نۆکەرە چەن ساڵە حەز لەو ژنە ئەکات ڕێگەی پێ‌هەڵە ئەکات بۆ ئێوارە ئەڕۆنە ناو ئەشکەوتێ لە نیوە شەوا ئەڵێ بە ژنەکە: من چەن ساڵە حەز لە تۆ ئەکەم و بۆیە ڕێگەم لێ ون کردی‌کە ئیمشەو مەیلم بەیتێ. ژنەکە ئەڵێ: تۆ مەحرەم ماڵ باوک من بووی بۆیە منیان داوەسە دەس تۆ خەیاڵ وا مەحاڵە. زۆری بۆ یەنێ ملی پێ نادا لە ئاخرا ئەڵێ: مەیلم نەدەیتێ ئەم کوڕتە بەم خنجێرە ئەکوژم کە بە هیچ جۆرێ ژنەکە قانیع نابێ، کوڕەکەی ئەکوژێ. دووبارە بەگیری یێنێ کە بۆی رازی نابێ، هەڵەچن لە یەک ژنەکە خنجێرەکەی ئەکەوێتە دەس و ئەیکا بە سک نۆکەرەکەدا ئەیکوژێ و بە تەنیا خۆی لەگەڵ دوو مەیتا لەو ئەشکەوتا ئەمێنێتۆ. لە ماڵی باوکیا جەماعەتێ کۆ ئەبنۆ گرەو ئەکەن کە کێ ئەتوانێ بە تەنیا بڕۆ بۆ ئەو ئەشکەوتە و ئەو دیارەیە دانێ ئەونە جایزەی پێ‌ئەدەین برای ئەو ژنە ئەڵێ: من ئەڕۆم. کە نزیکی ئەشکەوتەکە ئەبێتۆ دەسی نۆکەرەکە ئەبڕێ و ئەیخا بۆی ئەڵێ ئەگەر دوڕەندە بێ

ئەیخوات و ئەڕوات. براکەی دەسەکە هەڵئەگرێ مل ئەنێ و ئەڕوا، دەسێ‌تری بۆ ئەخا هەر ناگەڕێتۆ و ئەڵێ جینی یا ئینسی یا دوڕەندەی، من گوێ نادەم پێمە ژوورۆ دەنگی براکەی ئەناسێ، بە ناوی خۆی بانگی لێ‌ئەکات ئەویش دەنگ خوشکەکەی ئەناسێ لە یەک ئاشکرا ئەبن و بەو هەموو خەمۆ بە یەکۆ یێنۆ بۆ ماڵ باوکی. بۆیە وتوویانە:

هەرکەس بێگانە بکەرۆ بە خویش — بدا بە سەریا بە هەردوو دەس ویش

بۆیە حەدیس ئەفەرموێ: ژن و پیاوێ بێگانە کە بە تەنها بە یەکۆ بن دوان نین و سیانن، شەیتان وا لە بەینیانا، خزیلکیان ئەدا بۆلای یەک.

رەفیقی شەیتان مەکە بەو جۆرە — با تۆیش تووش نەبی بەو دەردە زۆرە

شەیتان هەمیشە وا لە کەمینا — کەمین دائەخا بە سەر زەمینا

هەرکەس پێوەبێ وا بەد بەخت ئەبێ — بە هیچ ئەنواعێ چارە سەر نابێ

* * *

«۳۳»

## یەک بوون

پیاوی رۆژێ لە ناو منالەکانیا دانیشتبوو، دەسەیێ گسکە تووڵینەی پێ‌دان وتی: بزانم کامتان ئەتوانن بیشکێنن. یەکە یەکە خەریک بوون کەسیان نەیتوانی بیشکێنن دایانۆ بە دەسیۆ. وتی: رۆڵە ئیوە رەوڵەکەی نازانن بۆیە بۆتان ناشکێ. دەسەی گسکەکەی کردۆ و یەکە یەکە هەمووی بە ئاسانی شکان. وتی: رۆڵە ئەمە مۆجگاری ئێوە ئەکەم. ئێوەیش تا وەها بە یەکۆ بەسرابن و وابەستە بن بە یەکۆ کەس زەبەرتان پێ نابا، وەختێ لەیەک چڕان دوژمن یەکە یەکە بە ئاسانی ئەتان‌شکێنن هۆشیار بن هەمیشە یەکیەتیتان بێ.

کافرانی زوو بی دینانی دوون — «فرّق تسد»یان کردووە بە قانوون

یانێ یەکیەتی لابە لە بەینا — خۆت کە بە ئاغە، بێ خەم لەو بەینا

* * *

................................................................

«٣٤»

## پاساو

درۆزن و پەڕۆزن ئاغە و نۆکەرێ ئەبن کە ئاغەی درۆزن ئەڵێ هەر درۆیەکم بۆ پەسا دەی دوو قەرانت پێ ئەدەم. مەسەلەن رۆژێ ئاغەی درۆزن ئەڕوانێ بۆ ئاسمان و ئەڵێ ئەوە ڕێی کاکێشان خوایە، پەڕۆزن ئەڕوانێ بۆ ئاسمان و ئەڵێ: وەی پووشێ کەوتە چاوم، درۆزن رۆژێ درۆیێ زۆر گەورە ئەکا پەڕۆزن بیرێ ئەکاتۆ زۆر نارەحەت بۆی پەرۆ ئەبێ، ئەڵێ: ئاغەگیان ئەمیشە هەر دووقەرانییە؟ ئەڵی: نەخەیر دوو قاتی ئەکەمۆ بۆت. ئەویش بۆی ئەگونجێنێت جا بزانین دوو قەرانی ئەو وەختە دوو مریشکی خۆ ولاتی کردووە.

❊ ❊ ❊

«٣٥»

## دەروێشی ئازا

رۆژێ دەروێشێ رووی کردە ماڵێ گەورە کە درگایێ زۆر گەورەی بوو لاشیپانەکانی بەرز بوو، هۆی پێکاو وتی: نان و نیعمەتتان زیاد بێ بەشی دەروێش بێنن با لەتێ نانیش بێ. ساحێب ماڵ هەیبەتی نوان وتی بە کارەکەرەکانی: بڵێن نان حازر نیە. مەسەلا وتی: بەیخان بڵێ بە ڕێحان بڵێ بە قومری قومری بڵێ بە نەشمیل نەشمیل بڵێ بە سوەیبە سوەیبە بڵێ بەو دەروێشە نەوێسێت نان حازر نیە. دەروێشەکە وتی: خوای گەورە جوبرەئیل بڵێ بە ئیسرافیل ئیسرافیل بڵێ بە میکائیل میکائیل بڵێ بە حەنبائیل حەنبائیل بڵێ بە عیزرائیل گیانی ئەم خەسیسە پیسە کێشێت. لە ترسا ساحێب ماڵ لەرز کەوتە بەدەنی هاواری کرد: برۆن لەتێ نانی بۆ ببەن. وتی: لەویا داینێن. بە عەساکەی دەستی بەربووە لاشیپان دەرگاکە پێکەنی و وتی: ئەم درگا بە کاری ئەم ماڵە نایێ. یا نانەکە بە قەی درگاکە لێبکەن یان درگایێکی تێ بخەن بە قەی نانەکە بێ. نۆکەرێ لە نۆکەرەکان حاکم گوێی لەم مشت و مڕۆ بوو رۆیی گێڕایۆ بۆ حاکم وتی: برۆن ئەو دەروێشمە بۆ بێنن. رۆین هاوردیان بۆلای حاکم وتی: چۆن بوو بۆم گێڕەوە بێکەم و زیاد. چیرۆکەکەی بۆگێڕاوە. حاکم ناردی بە

شوێن ساحێب مالا وتی: ئەم ماڵتە ئەگەر ئەیفرۆشی بیدە بە من. بە پارەیێ گەزاف لێی سەند و دای بە دەروێشەکە وتی: ئەم ماڵە لایەقی تۆیە کە ئەونە شەجیعی.

* * *

«۳٦»

### کەم خۆر بە

نەفەرێ ئەڕوا بۆ زیارەت حەزرەتی غەوس بۆ بەغدا کە دۆعای بۆ بکا خواردنی پێناخورێ لائەداتە دیێ ژنێ لە سەر تەنوورێکا نان ئەکا ئەڵێ دادە برسیمە، نانم بەرێ با بیخۆم. ئەڵێ دانیشە بخۆ هەر نان ئەکا و ئەیخوا. لێی ئەپرسێ بۆ کوێ ئەڕۆی ئەڵێ:ئەڕۆم بۆ بەغدا خواردنم بۆ ناخورێ بەشکوو بە هیممەتی غەوس تەبیعەتم بەربێ. ژنەکە ئەڵێ: پیاوی چاک بە لەو سەرۆ هاتیتەوە لێرەوە مەیەرۆ. بۆیە وتوویانە:

ئەونەی تێبکە بتبا بەڕێوە ئەونەی تێمەکە بیبەی بەڕێوە
نەئەونە زۆر خۆ لە دەمتۆ بیتۆ نەئەونە کەم خۆ دڵت بووریتۆ

* * *

«۳۷»

### با کوڕ بێ!

ژنێ رۆیی بۆلای دۆعا نووسێ وتی: منالم نیە دۆعایەکم بۆ بنووسە منالێکم ببێ. کە خەریک بوو دۆعاکەی بۆ بنووسێ، وتی: خۆ تۆ زەحمەتەکە ئەکێشی با کوڕ بێ.

* * *

«۳۸»

### بیر خستنەوەی شەرعی

رۆژێ مەولەوی تاوەگۆزی لە مزگەوتێکی سلێمانیا گەرەکی بوو بە جەماعەت نوێژ دابەسێ فەرەنجییەکەی لە بەرا بوو، یەکێ لە هاوشانەکانی وتی: کاکە تۆ نازانی فەرەنجی نانوێژییە بۆچی نوێژی پێوە ئەکەی؟ فەورەن دایکەند و داینا و نوێژەکەی دابەست. دوای نوێژەکە ئەوانەی کە ئەیانناسی وتیان: مامۆستا

..........................................................................................

مەولەی بۆچی ئەو هاوشانتە حاڵی نەکرد کە من بەرگن ئەم فەرەنجیمە نوێژی کردووە بۆیە لە نوێژا بێ‌خەم نوێژی پێوە ئەکەم؟ مەولەوی لە جوابا وتی: من تا ئەوم حاڵێ کردایە، جەماعەتەکەم لە دەس دەرئەچوو. ئەڵبەتە پێی خۆش بووە کە ئەم هاوشانیە دەسووری شەرعی بیر خستوەتۆ.

ئەمر بە مەعروف، نەهی لە مونکەر          دین راگیر ئەکا تا رۆژی مەحشەر

کۆتایی مەکەن لەم دوو مەبەســـە          بۆ هەردوو دونیا ئەمەمان بەســـە

❊ ❊ ❊

«٣٩»

### ئەم نانە بەو رۆنە

رۆژێ کورێ پرسی لە دایکی ئەم خیگە رۆنە چیە کەوا دەس لێ‌نەدراو دانراوە؟ دایکی وتی: رۆڵە ئەم خیگە رۆنە وەختێ کە باوکت ئارەزووی چەوری ئەکرد ئەهات نانی تێ‌ئەساوی و ئەیخوارد. وتی: دایە ئەی باوکم نەئەترسا لە وەکە نانەکە خیگەکە کون بکا. دایکی وتی: نەخێر. وتی: دایە دەی من ئەترسم و لە دوورۆ نانەکەم روو بە خیگەکە رائەکێشم و ئەڵێم ئەم نانە بەو رۆنە و ئەی خۆم.

پیاو ئەگەرووەها وەجاخ رۆشن بێ          نابێ ئیتر خەم لە دڵیا ڕیی بێ

لە ئیحتیاتــا زۆرتر تێ‌کــۆشــا          لە دوورۆ نانی بۆ رائەکێشــا

❊ ❊ ❊

«٤٠»

### قەباحەت

رۆژێ ئاغەیێ وتی بە نۆکەرەکەی: ئەمەوێ تا لەم پلانە سەر ئەکەوم کارێ نالەبار بکەیت و عوزرێ بێنیتۆ لە قەباحەتەکە خراب‌تر بێ. ئەویش دەسێکی برد بۆلای رانی ئاغە و وتی: بۆچی وائەکەی؟ نۆکەرەکە وتی: بم بەخشە وام زانی رانی ئاغەژنمە.

❊ ❊ ❊

«٤١»

## تەلەفوون

لە دەوری سالی ١٣١٤ شەمسییا پاسگای ..... تازە تەلەفوونی تێ هاتبوو، مالێ نزیکی مخابراتەکە بوو کە تەلەفوونیان ئەکرد جاری وا بوو کەریکیان بوو ئەی‌سەڕاند تێکلاو تەلەفوونەکە ئەبوو لەو تەرەفۆ ئەیانوت: ئەم دەنگە چیە لاییەن. پاسگای .... ئەیانوت بە هاوسێ‌کەیان: ئەم کەرە دوور خەن لەم تەلەفوونە بۆ ئێمە زۆر شوورەییە. ژنی ساحێب مالەکە ئەیوت: ئێوە بیانوو بە ئێمە ئەگرن ئەگەرنا تەنیا ئەم کوتە ئاسنە و تالە بەنە چۆن قسە ئەکا و ئەیبات. ئەوانیش کە ئەیان زانی بۆیان حالی نابێ بە ئەهوەنی ئەلێن تۆ لە جێگایێ کە تەلەفوونی پاسگای تیابێ کەسێ ناناسی؟ ئەلێ: بەلێ لە دێی .... دا ژنێ هەیە ناوی مینایە تەلەفوون ئەکەن بۆ ئەوێ. مینای .....یی بێتە سەر تەلەفوون ئەمیش هەر ناوی مینا ئەبێ لەوێوە بانگ ئەکا مینا ئەویش جواب ئەداتۆ. دوای چاک و چۆنی خەبەر پرسی، لە مالۆ ئەپرسێ بەردە پانێ و بەردە قنجێ ماون؟ مینای ..... ئەلێ: نەخێر بەردە پانێ منالان شکاندیان بۆ کەلای مازوولێن و بەردە قنجێ چەور بوو پشیلەیێ خواردی. ئەویش زۆر فەقیر حال ئەبێ بڕوا ئەکات و دەس ئەکا بە گریان ئەلێ: ئەو بەردانە چۆن نەماون ئێمە بە منالێ لە سەریانا گەمەمان ئەکرد. ئیتر مینای .... یی بڕوا ئەکا کە ئەو کوتە ئاسنە دەنگ ئەبا بەم لاولادا ئەیهێنێ. ئێستە تەلەفوون کەم مال نەیبێ. تەلەفوون وەکوو زوانی خۆمان وایە نەفع و زیانی هەیە.

❋ ❋ ❋

«٤٢»

## حەز و ئاوات

سالی ١٣٦٥ لە شاری سنە ئاوارە بووین وتیان کوڕی پیاوێ فەقیر حەزی ئەکرد لە کچی مالێ دەولەمەند. هەردووکیان کەلاس یانزە بوون. باوکی کوڕەکە تێگەیشتووتر بوو چشیەکرد لە خوێندن و دواکەوتنی کوڕەکەی داوای ئەوکچیە بۆ کرد. مال باوکی کچەکە ئەیانوت: چۆن ئێمە کە دەولەمەنین ئەم کچە تەرچکمانە

ئەدەین بەو کوڕە فەقیرە. بە وەسیلەی تەلەفوون بڕیاریان دا ئەم کچ و کوڕە بە نەوت و ئاور خۆیان بسوتێنن بەیانی زوو تازە ئاویەر خۆری لێ کەوتبوو رادوێ خەبەری دا کە ئەو دوانە ئاوری عەشق هەڵی ناون خۆیان بسوتێنن.

| | |
|---|---|
| بێ رەحمی وەها کەس نەیکردووە | ناپیاوی وەها کەس نەیکردووە |
| مەر پیاوێ وەکوو باوکی ئەو کچە | نەیدا بە دەسۆ وتی تەرچکە |
| ئەویش خۆی سوتان بەو هەموە خەمۆ | تا ماوم هەروا دەوری ئەکەمۆ |

* * *

«٤٣»

## بانێکە و دوو هەوا

پیرە ژنێ لە هەجیجا هاوین بوو لە سەربانا خەوتبوون، بووکێک و کوڕێکی لە سووچێکا خەوتبوون، کچێک و زاوایەکیشی لە سووچێکیترا، دوای خەوتن و ئارام گرتنیان پیرەژنەکە کەوتە هات و چۆ لە بەینیانا. ئەڕۆیی بۆلای کوڕ و بووکەکەی ئەیوت: گەرمە دوور لە یەک بخەون، بەرگێکی لێئەگرتنۆ بۆ زاوا و کچەکەی. ئەڕۆی بۆلای کچەکەی و زاواکەی بەرگەکەی ئەدا بە سەریانا و ئەیوت: پاڵ بەن بە یەکۆ ساردە. تا بەیانی ئەم پیرەژنە فەقیرە لەم هات و چووا بوو. بەیانی کە کوڕەکەی لە خەو هەڵسا تەماشای وەزعیەتی کرد، وتی: دایە گیان بۆچی بانێکە و دوو هەوا؟! ئەم بەسەرهاتە ئایەتوڵلا مەردۆخ نووسیویەتی.

* * *

«٤٤»

## زەڕە تاڵ و شیرین

کوڕێ بوو ئەیوت ئێمە دوو براین و حەوت خۆشکمان هەیە کە منالی خوشکەکانم ئەڕۆن بۆلای دایکم ئەچێ بە دەمیانۆ و ماچیان ئەکا و ئەڵێ بەخێر بێن، بڕوانن بۆیان چەنێ ئێسک سووک و زەڕە شیرینن. کە منالی من و براکەم ئەڕڕۆن بۆلای ئەڵێ ئەم سەرزلە ملپانە ورگ قەوییانە لە کوێ پەیا بوون، بڕۆن بەولاوۆ شکلێتان نەبینم ئەونە زەڕە تاڵن. دەریان ئەکا.

| | |
|---|---|
| زاوا میوانە قڕ مریشکەکانە | بیگرە سەری بڕە و مەگرە بەهانە |

زاوا بێگانەیە ئیحتیاجی بە زیادە موحەببەت هەیە، بۆیە دایک وایە لە گەڵیا. کوڕ و بووک کە بە خۆیی‌تریان ئەزانێ ئەونە گوێیان ناداتێ ئەگەرنا بیستوویەتی لە قەدیمی وتوویانە: «خوا بدا مەرگم زاوا نەکا بەرگم».

* * *

«٤٦»

### مەکری ژنان

ئێمە مناڵ بووین بۆیان ئەگێڕاینۆ کە مەلایێ دوای ئەوە کە عیلمەکان تەواو ئەکا بارێ کتێب ئەنێ لە کەرێ ئەڕوا بە شوێن ئەوا کە مەکری ژنان ببرێ. رێی ئەکەوێتە ماڵێ، شەو لەوێ میوان ئەبێ، لە نیوە شەوا ژنی ساحێب ماڵەکە کوچک ئاورێ یەنێ چەوری ئەکا. مەلا ئەڵێ: ئەوەتە بۆچیە؟ ژنەکە ئەڵێ: ئێمە لە ئێوارەدا زۆر بەقەدروحورمەتین بۆ میوان، بەڵام لە نیوە شەوا ئەم کوچک ئاورە چەورە ئەکەین بە دوایا. ئەویش لە ترسا بەو شەوە رائەکا و بارە کتێب بە کەرەکەیۆ جێ یێلێ و بەیانی کە یێتۆ بەسەر وەخت کەر و بارۆ ژنەکە ئەڵێ: مامۆسا خاسم خەڵەتانی و بە درۆی من بڕوات کرد و بەو شەوە رات کرد. بە شوێن مەکری ژنانا مەگەڕێ بۆتۆ نابڕێ هەریەکی خوای گەورە عەقڵێکی پێ‌داوە و تایبەتییە بۆیە وتویانە:

قورئانم خوێند و کتێبم ماوە لە مەکری ژنان سەرم سڕ ماوە

منیش وتوومە:

مەکری‌شەیتان زەعیفەمەکری ژنان‌عەزیمە هیچ‌سەرت‌سڕنەمێنێ نەسسی ئایەی‌کەریمە

مەکریان لە یۆسف کرد تووشی مووسیبەتیان کرد، تۆیش ئەگەر ئارام نەبی هیچ زیاتر نیت لە نەبی.

* * *

«٤٧»

### گۆرەویلە

لەو جۆرە شتانە کە زۆر سەرنجی بەشەر رائەکێشێ چۆلەکەیێکە کە پێی ئەڵێن: گۆرەویلە. ئەبێ لە پلووپووش هێلانە دروس کات و بەری باتۆ بە داریکا، زۆرتر ئاوێزانی داری بی کردووە، شۆڕی ئەکاتۆ و ئەڕواتە ناوی هێلکە ئەکات و

زۆرتر ئاویزانی داری بی کردووه، شۆڕی ئەکاتۆ و ئەڕواتە ناوی هێلکە ئەکات و ئەبێ بە بەچکە، هەر ڕۆژێ چەن را ئەڕواتە ناوی ئەو گۆرەویلە کە بە حەواوە ئاویزان بووە کە تەماشای بکەی زۆر سەرت لە قودرەتی خوا سڕ ئەمێنێ کە چ عەقڵ و قووەتێکی داوە بەو چۆلەکە لە چاو خۆی هیچ موهەندیس و میعمارێکی پێ ناگا کە لە پلووپووش ئەو گۆرەویلە دروس ئەکا بەو حەواوۆ.

تەماشای قودرەت خوای خۆت بکە　　جا بە ئیمانۆ بڕوای پێ بکـــە
چۆن ئەو چۆلەکە بێ خوێن و گیانە　　بەو دارە بەرزۆ چۆن ئاویزانە

* * *

«٤٨»

## دوو ژنی

دوو نەفەر لە دێیێکا ڕەقیب ئەبن لە زوو هەڵسانی بەیانیا بۆ نوێژ هەر بەیانییە یەکێکیان ئەکەوێتە بەرۆ تا وای لێ هات هەموو بەیانیێ یەکێکیان فێر بوو زووتر ئەهات بۆ مزگەوت، جێماوەکە وتی: چیە بەینێکە هەرتۆ پێشم ئەکەوی؟ وتی: کاکە نەت زانیوە ژنی تازەم هێناوە، لەو ساوە هەر من پێشی تۆ ئەکەوم بەیانی هەڵئەسم ئازا دەسنوێژ ئەگرم و جلەکانم بۆ یێنن و کەوشەکانم بۆ دائەنێن و ڕێکم ئەخەن و ئەمخەنە بەرتۆ وتی: منیش بیکەم بە دوان هەروایە؟ وتی: بگرە خاستریش بێ! ئەمیش کردی بە دوان. لە سەحەرەوە دەسیان ئەکرد بە شەڕ تا ئێوارە ئەویش لە ترسی شەڕ ڕای ئەکرد بۆ مزگەوت، بەیانیێ لە سووچی مزگەوتەکە کزی کردبوو ئەوی تر کە هات وای ئەزانی جنۆکەیە بە «بسم الله» کردن چووە بەرۆ وتی: کێیت؟ وتی منی قوڕ بە سەرم وەڵا ئەوەسە کردوومە بە دوو ژن هەموو سەحەرێ بە شەڕ ئەوانۆ خەبەرم ئەبێتۆ، چ پەنێکت پێدام برا. ئەمیش وتی: بە ڕاسی منیش ئەو دەردەم بوو. وتی: جا برا خوا لێت هەڵنەگرێ ئەم پەنتە بە من دا. وتی: ئەی خوا هەڵئەگرێ بە تەنیا من لە عەزابی سەختی جەهەننما بم.

پیاوی دوو ژنە جەرگی کون کونە　　ئەمە تەجرەبەی چەن ساڵەی منە
ئەگەر بۆت کرا هەر نەبێ باشـــە　　کە ناچاری بێ هەر یەکێ باشـە

ناری وتوویە:

بە قانوونی شەریعەت سەعبە ناری　　موداراکەی لە بەینی دوو هەویدا

تـا یـەکـێ لـەوان نـارازی نـەبـێ ئـەوی‌تریانـت بـۆ رازی نابـێ
تا یەکێ لەوان سەری تەڕئەکـەی خۆت لەگەڵ ئەویان ئاوقەد شەڕ ئەکەی

* * *

«٤٩»

## داخ و مردن

ژنێ کچێکی بوو ناوی خەرامان بوو، شووی کرد بە قەومێکی خۆیان هەتیوومەتیو کەوتنە شوێنی بە جوانە جوانە، ئیتر لای شووەکەی دانەنیشت پێ لە حاشا بوو، لە ماڵ باوکیا دانیشت و دوای ماوەیێ تووشی نەخۆشینێ بوو وازی لێ‌نەهانی تا دوای زەحمەتێ زۆر مرد، دایکی دوای ئەو ئەونە شیوەن و زاری بۆ کرد ئەویش تووشی نەخۆشینێ هات و سکی زۆر ماسی و بێ‌قەرار بوو لەوە پێش خەلک سەرزەنشتیان ئەکرد و تەمسیلیان بۆ ئەهانیێ گوێی نەئەدا، کە نەخۆشینەکەی زۆری لێ‌سەند ئەیوت: بڕۆن پێشەکانی خەرامان بێننە دەرۆ بیسوتێنن بیکەن بە دەرمان بۆ سکم با خۆشەوە بم تازە بێ‌فایدە بوو، کچەکەیشی و خۆیشی تیا چوون.

هەرچی بکەی بۆ مردوو غەیر سەبر و خۆڕاگرتن
زەرەری زۆری هەیە بۆ ژیان و بۆ مردن
بیر لە مردن خۆت کەرۆ ئەو لە بیری خۆت بەرۆ
سۆزی تۆیش وەک ئەو ئەمری لە ماڵ ئەتکەنە دەرۆ
تۆ خۆت لەو میرە ماڵە هەر کفنت بێ‌حەلالـــە
تازە هی میرات خۆرە ئەو سەرووەت و ئیقبالـــە

* * *

«٥٠»

## ترسنۆکی

رۆژێ کەروێشکێ بیر ئەکاتۆ لە ترسنۆکی خۆی ئەڵێ لە داخا ئەڕۆم خۆم ئەخەمە ناو ئاوی زرێبار. کە نزیک ئەبێتۆ لە ئاوەکە رەقە لە ترسا خۆیان ئەخەنە ناو ئاوەکە. دەس یێنێ بە سەر و سمێلیا و ئەڵێ: شوکور لە منیش ترسنۆک‌تر هەیە. بە خۆشییۆ یێتۆ لە ماڵا دائەنیشێ.

ئەمە تەجرەبەی کوردانی زووە        بۆیە ئەمەیان زووتر وتـووە

* * *

«٥١»

### ڕێوی فێڵبازە

ڕێوی زۆر فێلاویە. تا ڕێوی نەڕوا بە سەر زرێبارا کەسی‌تر بە سەریا ناڕوا. وەختێ کە یەخ زرێبار بەستی ڕێوی ئەڕوا لـە قـەراخـەکانیـەوە گـوێ ئـەنـێ بـە یەخەکەوە و لە لوورە کەوت، بێ‌خەم ئەڕوا بە سەریا. دوای ئەو خەڵکیش ئـەڕۆن بە سەریا. ڕۆژێ مووساییێ بە نەزانی بە سەر یەخی زرێبارا ئەکاتە ئەوبەرۆ لەو بەرۆ پێی ئەڵێن ئەمە کە بەسەریا هاتی زرێبار بوو. لە ترسا زیڕە ئەکا و ئەمرێ. ئێستەیـش کەسێ کە زۆر ترسنۆک بێ پێی ئەڵێن ئەوە چیە بووی بە مووساییەکەی زرێبارۆ لە ترسا زیڕەت کردووە.

زرێبار و بە هاری بەهەشتی کوردەواری

ئەگەر بڕوام پێ‌ناکەی بەهار بڕۆ بۆ دیاری

زووتـر زرێـار زڕیـن بـار بـووە        دەماو دەم کەوتووە وای پێ هاتووە

سەدوومی سوغرا ناوی زووی بووە        ڕووچوونی نیشان ئاخیرەت بـووە

* * *

«٥٢»

### هاومەرام

مەلایێ لە دێیەکا بوو حەزی ئەکرد لـە کچ خـەیاتـێ کـە بیخـوازێ بـۆ کوڕەکەی. مامۆستا چەن نەفەر لە پیاو ماقووڵی ئاوایی ناردبوو بۆ داوای و هێجبی، خەیاتەکە جوابی کردن. یەکێ لە ئەهلی ئاوایی وتی: مامۆسا ئەگەر ئیجازە ئەدەی من ئەم کارتە بۆ دروست ئەکەم. مامۆسا وتی: ئیجازەم هەیە و مەمنوونیشت ئەبم. ڕۆیی بۆلای خەیاتەکە هەر لـە دوورەوە دەسـی کـرد بـە جـوێن پێـدانی، ئـەویش هەرواهات بە دەمیۆ دوای شەڕە جوێن و دەمەقاڵەیەکی زۆر وتی: بۆچی نەفام ئـەو کچتە نەدا بەو کوڕە چاکەی مامۆسا؟ وتی: تا ئێستا مامۆسـا نـەیزانیـوە هـێجبی بکـا بۆیە نەمداوە، هەر زوو پیاو ماقووڵێ وەک تۆی بناردایە من سەرم پێوە نەبوو. ئـەوا

ئێستە پێشکەشی تۆی ئەکەم. ئیتر ئەو کوڕوکچە بنەماڵەیان دروست کرد و عومرێکی زۆر بە خۆشی بە یەکەوە بوون.

هەرکەسێ لە گەڵ هاوتەبعی خۆیا — دەماخی چاخە و یێتۆ بەخۆیا
مەدە لە زەوقی تا ئیمکانی بێ — کارت بەبێ ئەو نابێ جێبەجێ
بڕۆ هاو تەبعی خۆی بدۆزەرەوە — کاری خۆت بە ئەو ببەبەرەوە

* * *

«٥٣»

## ناو و فامیلی باش

داوا ئەکەین لەوانە کە فامیل خراپیان بۆ دانراوە داواکەن لە سجیل ئەحواڵ کە فامیلەکەیان بە فامیلێکی باش بگۆڕێ بۆیان. نەفەرێ چووە خزمەت حەزرەتﷺ فەرمووی ناوت چیە؟ وتی: ناوم «حَرب»ە واتە شەڕ. فەرمووی: ناوت «سَهل» بێ. واتە ئاسایش و خۆشی. هەروا حەزرەتﷺ ناوی زۆر کەسی گۆڕیوە بە چاک و لە هەموو کەسێ پرسیویە بۆ ناوی. وە خوای گەورە لە سوورەی «حجرات»دا لە ئایەتی ١١ ئەفەرموێ: بە ناوی خراپ بانگ لە یەک مەکەن هەرکەس لەو کارە تەوبە نەکا هەرئەوانە زاڵمن. ئەم ئایەتە لە بارەی ئەوانەوە نازڵ بووە کە زووتر گاور یا مووسایی بوون، لە دوای ئەوە کە موسوڵمان بوون هەر پێیان وتوون مووسایی و گاور، یا فاسق بوە و تەوبەی کردووە ئیستەیش هەر پێی ئەڵێن فاسق. خوا فەرمووی: لە دوای ئیمان و تەوبە ئەو ناوە کە زوو وتووتانە پێیان ئێستە مەیڵێن.

* * *

«٥٤»

## رزق بە دەس خوایە

ئەڵێن کە لە ساڵێکی قاتی و کەم بارانییا جنۆکە زەماوەنیان ئەبێ. کوڕێ گۆرانیبێژ ئەدزن کە لەگەڵ یەکێ لە خۆیانا گۆرانیان بۆ بڵێ. کە نۆرەی گۆرانی ویژەکەی خۆیان یێ ئەڵێ: بە گیان کاکە جاتری با لە باران چاتری دانی لە کا زۆرتری. ئەگێڕنۆ وا ڕێ ئەکەوێ خەرمانی ئەو ساڵە لە هەمووو ساڵێ قەوی‌تر

ئەبێ. لەم دوو سێ سالانەدا ساڵێ لە مەریوانا قاتی و کەم بارانی بوو ئەو ساڵە لە هەموو ساڵێ خەلە و خەرمان زۆرتر بوو بۆیە وتوویانە: رزق بە باران نیە بە دەس خوایە و بە رەحمی خوایە.

* * *

«٥٥»

## کاری ئیمڕۆمەخەرە بەیانی

پیرەژنێک و کچێکی بێکەس ئەبن و بێنەوا لە ماڵێکی چۆلا لە هاوینا. پیرەژنەکە بە کچەکەی ئەڵێ با بڕۆین بۆ جاڕی خەڵەی خەلک گولۆچنی کەین بۆ زسانمان. کچەکە ئەڵێ دایە تا زستان من شوو ئەکەم و تۆ ئەمری ئیتر شتمان بۆ چیە، تا زسان نە ئەو شوو ئەکا و نە پیرەژنە کە ئەمرێ، زۆریان بۆ یێ لە برسا ئەڕۆن بۆ جاڕی گەنمی ماڵ پاشا بۆ گولۆچنی. ئەڵێن بۆ کوێ ئەڕۆن داپیرە؟ ئێستە زستانە گوڵ لە عەرزا نەماوە ئەبوا هاوین گوڵ چنیتان بکردایێ. بۆیە وتوویانە: کردە پەشیمان باشترە لە نەکردە پەشیمانی.

| | |
|---|---|
| ئەو پیرە ژیرە وتی بە کچەکەی | هاوین باشترە گوڵ چنی بکەی |
| کە بە گوێی نەکرد زستان وا دامان | تۆ وەها نەبی ئامان سەد ئامان |
| سەر زەوی زستان دانەی تیا نیە | کەی وەختی هەوڵ و گوڵ چنینیە |
| تا دەمت ماوە داوای چی ئەکا | نەڕۆی بە دەمیۆئاوات پێ ئەکا |

* * *

«٥٦»

## مەلا جیمە

رۆژێ ژنی جۆلایێ ئەڕوا بۆ حەمام تەماشا ئەکا بە دەور حەماما ویساون، نایەڵن کەسێ عوبووری حەمام بکا، ئەڵێ نایەڵن منیش بڕۆم بۆ حەمام ئەوانیش ئەڵێن ژنی قازی وا لە حەماما تا ئەو لەوێ بێ کەس ریگەی نیە بڕوا بەو دەورا. ئەویش یێتۆ بە مەئیووسی، ژنەکە زۆر ئەکا لە شووەکەی ئەبێ تۆیش بی بە قازی با منیش وەها ماقووڵ بم. جۆلا ئەڵێ: من تا «جیم»م خوێندووە چۆن ئەبم بە قازی ئەڵێ: نەبی بە قازی بەلاتۆ دانانیشم ئیتر مەجبوور ئەبێ ببێ بە قازی مێزەرە و دەستێ

لیباسی رۆحانی ئەکاتە بەری و ئەڕوا بۆ سەرای حاکم ئەویش ئیحتیرامی زۆری لێ‌ئەگرێ و ئەڵێ: تا ئیسە بە خزمەتت نەگەییوم بە زوانێکی تەڕ و پاراو جوابی ئەداتۆ. خۆش بەختانەی جۆلاکە لەو وەختا خەبەر ئەبەنن بۆ پاشا کە چل نەفەر رۆینە سەر خەزێنە چل کۆڵ پارە و جەواهێریان بردووە. ئەویش ئەڵێ: بە جۆلا مەگەر تۆ ئەم دزانە پەیا کەی. ئەڵێ: بە مۆڵەت باشە. چل شەو مۆڵەتی بۆ دائەنێ. ئەڕوا کە شەو دێ ئەڵێ بە ژنەکەی: ئەمە یەکێ لە چلان واتە یەکێ لە چل شەوەکان. یەکێ لە دزەکان کە لە سەربانا ئەبێ وائەزانێ بەوی زانیوە و ئەڵێ: ئەمە یەکێ لەدزەکان سۆزی شەو دوان لە دزەکان لەسەر بان ئەبن ئەڵێ: ئەمە دوان لە چلەکان، واتە لە چل شەوەکان دزەکان. وائەزانن کە ئەڵێ ئەمە دوان لە چل دزەکان. شەوی سێهەم سیانیان یەن بۆ سەربانەکە ئەڵێ ئەمە سیان لە چلان واتە لە چل شەوەکە. دزەکان وائەزانن بەوان ئەڵێ. ئەڵێن کە پێیان زانیوین با بڕۆین بۆلای ئیقرارکەین و دزیەکە بەینۆ بەشکوو تکامان بۆ بکا ئیعداممان نەکەن. ئەڕۆنە خوار و ئەکەونە خاکی پێی و راسی رەفێقەکانیان ئەڵێن و زۆری لێ‌ئەپاڕێنۆ کە هۆشت پێمانۆ بێ، مەلا جیمە ئەڵێ: بڕۆن خۆتان و رەفێقەکانتان چل کۆڵەکە بە ساقی ببەنۆ بۆسەر خەزێنەی پاشا نایێڵم لە گوڵ کاڵترتان پێ‌بێژن. هەر چل نەفەرەکەیان چل کۆڵەکە لەگەڵ مەلا جیمە ئەبەنۆ بۆ سەرای پاشا. مەلا ئەڵێ: بەو شەرتە ئەمانمە هێناوە بۆلای تۆ کۆڵەکەیان لێ‌وەرگری و ئیتر حەبس و ئەزیەت و ئازاریان نەکەی پاشا لێیان ئەبوورێ. جا ئەمە کەی عەجایبە خوا کەڵەک هەڵچنێ بۆ هەرکەس ئەتوانێ. مەلا ئیتر نانی کەوتە شۆلا و مەعاشی زۆریان بۆ بڕیۆ. هەر خۆی حەساب ئەبێ مەلاژنیش زۆر حورمەت پەیا ئەکات بە دڵ خۆی.

قازی‌کە ژیر بێ بە سەهل و ئاسان ئەبێ بە موجری ئەحکامی قورئان

وەک ئەو قازییەکەم دەس بکەوێ کە دز پەیا کات بێ‌خەم ئەخەوێ

* * *

«۵۷»

## خۆت مەکوتە جەوتە

رۆژێ دوو دەروێش بۆ فەقیری ئەڕۆنە دێیەک تەماشا ئەکەن کە لەسەر بەرزیێکا ژنان زۆر کۆبوون و قازانێ گەورەیان ناوەتە سەر و دەوریان لێداوە. ئەمانیش زۆر برسیان بوو خۆیان کێشا بۆلای تیانە. یەکێکیان کە بە قەوەت‌تربوو زووتر رۆییە سەری و تەماشای کرد جەوتە، ژنان ئەیکولێنن بۆ رەنگ کردن مەشکەی پێسە خاو. جا بانگی کرد لە رەفێقەکەی و وتی: خۆت مەکوتە جەوتە.

خۆت مەکوتە جەوتە ئەی مامە دەروێش
با زۆر برسیتە سکت بێتە ئێش
مەر لە جێیەتر شتێ پەیاکەی
خۆ بەبێ خواردن قەناعەت ناکەی

* * *

«۵۸»

## بۆ دۆعا نووس نەخلەتێی

رۆژێ ژنێ بۆی گێرامۆ، وتی: چوار کچم بوو کوڕم نەبوو. رۆژێ دۆعا نووسێ رووی کردە ماڵمان وتم: کوڕم نیە دۆعایەکم بۆ بنووسە. وتی: دۆعای قورست ئەوێ. لەسەر قەڵەمانەکەیا رێک کەوتین. وتی: شەرتی ئەم دۆعا ئەوەیە کە لە سەر بەرمووسڵانتا بێنووسم. وتم: شووەکەم تا رایێ بەرمووسڵانمی نیشان ئەدەم سویێ ئەبێتۆ، چۆن ئیسە بە زوانی لووسی تۆ بەرمووسڵانم ئەخەمە بەر دەس تۆ. ئێتر هەی تڕەم لێ‌کرد و بانگم کرد لە قەوم و کەس و بەروو بەراوسێ بێن بێ‌کوژن. حەیفێ بە پێ‌بوو بەبێ وەی و بێ‌گوڵمەز دەرچوو.

حەیفێ ئەو پیاوە ئەو درۆزنە — کە دوژمن هەزارکەس وەکوو منە
بەبێ گوڵمەز و بەبێ‌وەی دەرچوو — چی بکەم بە شوێنیا کەگیانم دەرچوو

* * *

.......................................................................

«۵۹»

## دوو دەروێش

ئێمە منالْ بووین مامۆسایەکمان بوو بە شۆخیۆ هەموو رایێ بۆی ئەگێڕاینۆ کە دوو دەروێش ئەڕۆنە ئاواییەک یەکێکیان کە لە بەرۆ ئەبێ تووشی پاچێ ئەبێ تەماشای دەوروبەری خۆی ئەکا کەس دیار نیە ئەڵێ بە رەفێقەکەی: «درویش محمد رضا از این قلنگ چەگوی» واتە: دەروێش حەمەڕەزا لە بارەی ئەم پاچۆ ئەڵێی چی؟ ئەویش ئەڵێ: «بردار و تربە انداز صلوات برمحمد» هەڵی گرە و بیخە تورەکەکە.......

* * *

«۶۰»

## هەر پیاوەکەی جارانی

پیاوێ ماڵی لەلای قەلآیێ بەرزا بوو ژنێکی بوو لە خۆی جوان عومرتر بوو، بیست ساڵ تەفاوت عومریان بوو. هەموو رۆژێ رایێ ئەڕۆیی بۆ لووتکەی قەلآکە بازێ خۆی نیشان ژنەکەی ئەدا و ئەهاتە خوارۆ بۆ ئەوە ژنەکەی پێی نەڵێ پیری ئەم مەینەتەی ئەدا بەر خۆی.

ژنەکەت ئەزانێ چەنێ باز ئەبەی     لە ناهەق بۆچی خۆت مانوو ئەکەی

* * *

«۶۱»

## برایش خۆشە نەک وەک شوو

برایێ لەگەڵ خوشکێکی رۆیین بۆ سەفەر. لە رێدا باران و سەرمای زۆر زۆری بۆ هانین و چوونە ناو ئەشکەوتێ. ئەونە خوشکەکە سەرمای بوو براکەی بە داری تفنگەکەی ئاگری بۆ کردۆ کە گەرمی هاتۆ. وتی:

خۆشە ئاور خۆشە دو     برایش خۆشە نەوک شوو

براکەیشی وتی: راسیان وتوە قەدیمی کە خۆشک بروای پێ مەکە هەر وەسە دوو پشک:

له خەم و خەفەت ئەوا شەریکی | له نازو نیعمەت ئەوا تەریکی

* * *

«٦٢»

## ریشی سپی و ریز لێی

پیاوێ تەماشای ئاوێنەیەکی ئەکرد تەماشای ریشی خۆی کرد کە سپی بووە وتی بە ریشی: شەرت بێ نەیێلم کەس لێت بنەوێ. هاومالی ئاگای لێ بوو لە بەر خۆی وتی: تاقیت ئەکەمۆ. وەختێ ئەو پیاوە نۆرەی ئاوی هات و هاومالەکەی بۆ بیانوو رۆیی وتی: ئیمرۆ نۆرە ئاو ئێمەیە ئاوەکەت ئەبڕم وتی: خۆت ئەزانی نۆرە ئاوی ئێمەیە پیاوی چاک بە مەیبرە. کە زانی بێ دەنگ نابێ وتی: براگیان قەیناکا ئیمرۆ تۆ ببیە من قیرە ناکەم لەگەڵتا ئەگەر ماین ئێمە بۆ سۆزی. کە زانی راس ئەکا وتی تۆم تاقی کردۆ ئاوەکە بۆ تۆ.

ریش سپی وەها کەم دەس ئەکەوێ | بۆ تەمای دونیا نەخزێ و نەکەوێ
تۆیش ئەگەر پیاو بی ئەگەر وەهابی | تۆش قیرە و نیرە و مەینەتی نابی

* * *

«٦٣»

## حەرەم‌سەرا و نامەحرەم

حاجی سەیید حەسەن چۆڕی کە خۆی زۆر دەولەمەند بووە قازی هەورامان و مەریوان بووە، لەسەر خەرجی خۆی فەقێی بەخێو کردووە و خۆی دەرسی پێ‌وتوون. وەلێ رێی‌نەداون کە برۆنە ناو خێزان و مالی بۆ جیرە و راتبەی فەقێ. لە دوورۆ «تق‌الباب»یان کردووە و هەرچێکیان ویستووە لە نان و پێخۆر پێیان داون و رۆیشتوون.

رەحمەتی لێ‌بێ بۆ یاسا و رەسمی | ئافەرین له خۆی بۆ عەقل و فەهمی
فەقێ هەریەکێ لە جێیەکۆ بێـــت | بە کاری حەرەم سەراکە نایـــێت

* * *

«٦٤»

## پیاوی خوا لە کەس ناترسێ

مەلا سێ جۆرە: مەلای دەم گورگ بەس. مەلای جومعە و جەماعەت. مەلای مودەڕڕیس. لەم سێ نەوعە بازێکیان قەناعەتیان کردووە بە بەشی خواو لە ماڵۆ بەوهیواوۆ دانیشتوون و بازێکیان بۆ ڕەفاهی خۆیان، یان کاسبی زیادە ئەکەن یان خۆیان هەڵسپاردووە بە دەوڵەتا. یەکێ لەوانە قەناعەتی بە بەشی خوا کردووە لە بیرەوەری ئێمەدا مەلا حەمەمین چیچوورانی بووە کە مودەڕڕیس و ئیمامی جومعە و جەماعەتی دێی ڕەشەدێ بووە لە مەریوانا. لەو وەختا کە قەباڵەی مولک بە مۆرو ئیمزای مەلا گەورەکان ئیعتیباری پەیا ئەکرد قەباڵەیێکیان پێدابوو ئیمزای کا ئەویش ئیمزای نەکردبوو وتبووی: من خەڵکی ئەم ولاتە نیم، خەبەرم لێ نیە و ئیمزای ناکەم. لەبەر ئەوە لە زەمان ڕەزاشا تەقریبەن لە ساڵی ۱۳۱۲ شەمسیا کە سەرهەنگ لە مەریوانا خۆی حەساب ئەبێ ئیرادەتی مامۆسا پەیا ئەکا و ئەڵێ ئەڕۆم بۆ زیارەتی بۆ ڕەشەدێ. کەیخواو ریش چەرمووی ئاوایی کە سەرهەنگ ئەڵێ یێم بۆ دیتان زۆر خۆشحاڵ ئەبن ئیستیقباڵی گەرم و میوانداری باشی ئەکەن مامۆستا دەعوەت ئەکەن بۆلای. ئەویش نارِوا بۆلای. ئەترسن بێ ئەزیەتی کا کەچی هیچ بێ ئەدەبی ناکا بۆیە وتوویانە:

هەرکەس بۆ خوابێ خوایش بۆ ئەوە کۆمەکی ئەکا رۆژە یا شەوە
هەرکەس بەڕاسی لە خوای خۆی ترسێ بێ شک هەمووکەس لە ئەو ئەترسێ

* * *

«٦٥»

## ژن و هەوێ

ژن و مێردێ زەمانێ زۆر بە یەکەوە بوون زۆر بە یەکەوە خۆشیان بوو منالێ زۆریان لە یەک بوو هەموو جارێ پیاوەکە ئەیوت: من ژنێ بێنم ئەم خۆشی و خۆشەویسیمانە نامێنێ ژنەکە ئەیوت: من لە ژن ناترسم و بە ژن هانینت نارەحەت نابم. رۆژێ بۆ تەجرەبەی ژنەکە کە لە ماڵۆ نەبوو پیاوەکە نەوگێکی لولە کرد و دەسێ لیباسی ژنانەی کرد بە بەریا و بە پێوە ویسانی لە سووچێکی تاریکا داینا کە

ژنەکە هاتۆ وتی: میوانێکمان هاتووە ژنەکە بڕۆ بەخێرهاتنی بکە ژنە ڕۆیی سەلامی لێ کرد و بەخێرهاتنی کرد جوابی نەبوو پیاوەکە وتی: ئەم ژنە لەبەر خەجالەتی خۆی کە شووی کردووە بە سەر تۆا، ڕووی نیە بێتە جواب. ژنەکە لە داخا داراوۆ کەوت بە عەرزا، پیاوەکە رای کرد بۆلای تەماشای کرد بێ‌هۆش کەوتووە هەرچی دای بەم دیوو بەو دیوا نەجوولاوۆ. دوای ماوەیێ زۆر نەختێ هۆشی هاتۆ بەخۆیا پیاوەکە نەوگەکەی برد بۆلای نایە بەردەمی وتی: ئەمە نەوگەکەیە لیباس تۆم کردووەسە بەری. وتی: لایبە سەدکا نەوگە هەر هەوەگە بەم حالیشۆ. ئەلێن: هەوێ لە تەشتێکا جلیان ئەشۆرێ هێوەرژن لە دەشتێکا ناشۆررێ.

* * *

«٦٦»

## بووک و خەسوو

ئەلێن خەسوویێ وتی بە بووکەکەی: ئەم بەیانیە تۆ حەیوانەکان بدۆشە. ئەویش دۆشی و کەفی کردبوو زۆر بوو کە کەفەکەی نیشتۆ کەمۆ بوو لە ترسی خەسووی کە پیا هەڵنەکالێت پاڕاوۆ لە خوا کە بیکا بە پەپووسلێمانە. خوا دۆعاکەی قەبووڵ کرد باڵی گرتۆ و چووە سەرچڵ حەوشەکە وتی: پەپوو خەسوو کەف‌بوو. کەم بوو. ئێستەیش کە پەپووسلێمانە ئەخوێنن وەهای لێ‌وەرئەگیرێ کە ئەلێ: پەپوو خەسوو کەف‌بوو کەم بوو. خەسوو هەرچی پاڕاوە ئیتر نەهاتۆ.

زووتر کە خەلکی تەمیس و پاک بوو دۆعای لای خودا زوو قەبووڵ ئەبوو
ئیستە کە گوناح رەشی کردوینۆ دۆعا و نزامان رەد ئەکرینۆ

* * *

«٦٧»

## خێلی جاف

خێلە جافێ لە خێلەو ژوورا لە دەوری شلێرا ژنێکیان دوو کوڕی بووە وتی: من بەم هەموو زەحمەتۆ دوو منالم بۆ بەخێو نابێ هەردووکیانێ گۆچ کرد و کردنی بە مەلۆتکە و یەکێکیانی برد لەگەڵ خۆیا و یەکێکیانی نا ناو قولۆرە دارێ.

شوانێ کە هەموو رۆژێ رانەکەی ئەبرد بۆ ئەو دەورە خوا بزنێکی بۆ موسەخخەر کرد هەموو رۆژێ ئەڕۆیی تێر شیری پێ‌ئەدا. تا چل رۆژ ساحێب بزنەکە زانی کە شیرەکەی نایەنێتۆ پرسی لە شوانەکە چیە ئەو بزن ئێمە هەموو رۆژێ شیرەکەی نایەنێتۆ. شوانەکە وتی: من خۆم نەم دۆشیوە و شک نابەم کەسێ دۆشیبێتی. رۆژێ ساحێب بزنەکە ئەکەوێتە شوێن بزنەکە تەماشای کرد رۆیی بۆلای دارێکی قولۆر، تەماشا ئەکا منالێ جوان‌خاس و تەمیس وا لە قولۆر ئەو دارا خوا ئەم بزنەی وا لێ کردووە کە نەیەڵێ لە برسا بمرێ. ساحێب بزنەکە منالەکە ئەباتۆ بۆ مال وەکوو منال خۆیان بە خێوی ئەکەن. کە خێلە جافەکان گەڕانۆ گەیینۆ ئەو شوێنە ئەڵێن با سەرێ بەین لە دارە قولۆرەکە ئەپرسن لەو دەوروبەرە ئەڵێن ئەو منالی ئێوە وا لە مالی فلان‌کەسا ئەڕۆن شاد ئەبنۆ بە منالەکەیان.

قودرەتی خودا لەوە زۆرترە    لە باوک و لە دایک هەرزۆر چاترە
بە بزن منال جاف بەخێو ئەکا    ساحێب بزنەکەی بۆ دل نەرم ئەکا

* * *

«٦٨»

## دوکتۆری گورگ

رۆژێ دوو کەر لە ئالف‌جارێکا ئەلەوەڕان گورگێ چاوی کردن تەمای خواردنی تێ‌کردن. رۆی بۆلای یەکێکیان لە ترسا خۆی شەل کرد، گورگەکە وتی: ئەوە چ خێرتە وتی: دڕکێ گەورە چووە بە پاما زۆر نارەحەتی کردووم. وتی: بێنە با تەماشای کەم کرد جووتەیەکی دابە ناودەم گورگەکەدا و خۆی رای کرد. دوای ئەوە گورگەکە هۆشی هاتۆ بە خۆیا وتی: من کە لە دوکتۆری نازانم ئەگەر گەوج نەبوایەم لە دوکتۆری کەرم چی بوو.

تاتێ‌نەکەوتووی هۆشت‌لەخۆت‌بێ    عیلاج واقیعە ئەبێ لە پێش بێ

* * *

«٦٩»

## بەسەر ئاو حمامۆ دۆس ئەگرێ

ماڵمان لە دێیەکا بوو میوانێ زۆرمان ئەهات ژنێ کە زۆر حەزی لە قسە ئەکرد هەر میوانێکمان ئەهات ئەویش ئەهات بۆلای، هەرکامیانی بە قسەخۆشتر بزانیایێ سوێنی لێ‌ئەخوارد ئەبێ تا سێ رۆژ لەم ماڵا نەچیتە دەرۆ. ئیتر هیچ خەمی نەبوو ئەم میوانە چۆن بەڕێ‌ئەکرێ. بێ‌خەم بوو لەوە کە شەرعی ئیسلام ئەفەرموێ تەعاروف بە سەر ماڵ خەڵکۆ دروس نیە حەتا میوان لە وەختی نان خواردنا حەقی نیە بەش پشیلە بدا.

| | |
|---|---|
| تەعاروف بە سەر ماڵ خەڵکۆ مەکە | خۆت لەوە زیاترلەکە دار مەکە |
| ئاشنایی بە سەر ئاوی حەمامۆ | مەگرە هەر زووتر لە تۆ پاڕامۆ |

* * *

«٧٠»

## مانگای زرنگ

مانگایێ بە زەهەوە لە گاگەل جێ ئەمێنێ ئەڕواتە کەناوێ ئەزێت و گوێرەکەکەی گۆچ ئەکا دوای ئەوە گورگێ یێت بیانخوات مانگاکە ئەینێ بە شاخێ ئەینێ بە کەناوەکەوە بەری نادا تا ئەتۆپێ بەیانی خاوەنەکەی ئەڕوا لە کەناوەکەدا ئەیدۆزێتۆ کە گورگەکەی کوشتووە خۆی و گوێرەکەکەی بە ساقی ماون.

مانگا کە زۆری بۆبێ لە هەڵمەت گورگ ناترسێ
ئەینێ بە نووکی شاخێ هەتا تەواو ئەتاسێ

* * *

«٧١»

### دەورە میوانی

ئەڵێن لەقلەقێک و ڕێویێ برایبان گەرم بووە، ڕۆژێ لەقلەقەکە ڕێوی برادەری دەعوەت ئەکا دانوولەی لە گۆزەێکا بۆ دائەنێ، هەرچی ڕێوی بە دەوریا یێ سەری پیاناچێ و هیچی بۆ دەرنایێ بیخوا، بە برسی ئەڕواتۆ. لەقلەق دانەدانە

دەری یێنێ و ئەیخوا. رۆژێ رێوی ئەڕوات بە شوێن لەقلەقا ئەڵێ دەعوەتی بۆ ماڵ ئێمە رێوی سایلەی بۆ لێ‌ئەنێ ئەیکاتە دەوری و بۆی دائەنێ لەقلەق هەرچی خەریک ئەبێ بە دەنووک هیچی بۆ هەڵناگیرێ بیخوا بە مەئیووسی و برسی ئەڕوات و دەسەوامی لەقلەق ئەداتۆ و خۆی بێ‌خەم هەمووی ئەلێسێتۆ و ئەیخوات.

ئەو پەنە لەقلەق داویە بە رێوی  کەس‌نەیدا بەکەس لە رووی سەرزەوی
ئەو دەسەوامە رێوی داویەتۆ  هەقی لە لەقلەق تەواو کروەتۆ

* * *

«۷۲»

## ئاگر

لەوە پێش وەسیلەی ئاور کردنەوە یا نەبوو یا کەم بوو. حەتا لە بیرەوەری منیشا خەڵکی ماڵەماڵ ئەڕۆین بۆ ئاور، سکلێکیان ئەهانی پووش و پەلاش و چڵ‌وچێویان ئەکرد بە سەریا دووکەلێکی زۆری ئەکرد و نەیئەگرت، جا پێیان ئەوت: ئاور هەوێ هات وا رێ‌ئەکەوت ئاوری ئەگرت بۆیە ژنان ئەیانوت: هەوێ ساری زۆرگرانە زەحمەتە ئەو سیانە ئێمان دەربەن. شووەکە و دوو هەوێکە وەختی وابوو بە گەرمی زەڕەبین کە ئەیاندا بەر خۆر ئاوریان ئەکردۆ وە لە وەختی زۆری شیرا ژنان ئەیانوت: ئاور مەدەن بە ئاوسێکان بۆ شیری حەیوانەکان زەرەری زۆرە. وەختی وائەبوو بە بەرد و چەخماخ ئاوریان ئەکردۆ.

هەتا پێت ئەکرێ دووژنی مەکە  خۆت بە جوانی خەفەت‌کوژ مەکە
پیاوی دووژنە جەرگی کون کونە  ئەمە تەجرەبەی چەن ساڵەی منە

* * *

«۷۳»

## کوێخا

وتیان ئەمە قێخایە؟ وتیان کورە بە کاری کوێخایی نایێ. وتیان: کەر نەبێ نایکا و کەر نەبێ نایکەن.

* * *

«٧٤»

## گەوج

نەفەرێ چوار کوڕی بوو وەسیەتی بۆ کردن کە دوای میرات بەش کردن تفەنگێ باشی بوو بیدەن بە کەسێ کە لە هەموو کەسێ بە گەوجتری بزانن، یەکێ لە کوڕەکانی بۆ ئەم کارە کرد بە سەر وەسیەت. رۆی زۆر گەڕا کەسی بۆ پەیا نەبوو و نەیئەتوانی پرسێ کێ لە هەموو کەس گەوجترە. تا ریێ کەوتە دیێ تەماشای کرد ئەهلی ئەو دێ کۆبوونەسۆ لە دوو نەفەر، یەکێکیان زۆر بە جوانی رازاندووەتۆ و سەرو ریشی لێ تاشیوە و زۆر حورمەتی لێ ئەگرن و لەسەر سەنگەڵییێکا دایان ناوە، سمێلی لە خۆشیا توورەکە دۆ هەڵئەگرێ. یەکێکیان کردووە بە پەن و مەسخەرە سەرو ریش و سمێڵ و برۆیان تاشیوە ئەیگێڕن ماڵە و ماڵ، هەر ماڵێ تف و لەحنەتێکی لێ ئەکەن و خۆڵ و بووڵ ئەکەن بە سەریا. پرسی: ئەم دوانە کێن و چ کەسێکن؟وتیان ئەو پەنە قێخای کۆنە ئەم جوانە رازاوە قێخای تازەیە. وتی: گەوجی خۆم دۆزیوەتۆ کە بیر ناکاتۆ دوای ماوەیێ ئەویش ئەبێ بە پەن. رۆی سەلامی لێ کرد و دەسی ماچ کرد و وتی: باوکم وەسیەتی کردووە ئەم تفنگە بەم بە کەسێ کە لە هەموو کەسێ بە گەوجتری بزانم، وا دیارە تۆ وابی کە لە عاقبەتی خۆت بیر ناکەیتۆ هەرچەن ناخۆشبوو تورە بۆ تفنگەکە زۆر چاک بووە رێ گرت.

بیر لە عاقبەت کاری خۆت کەرۆ — بۆ هەموو کاریێ مەڕۆرە بەرۆ
با تووش زەحمەت و ریسوایی نەبی — لە ئاخر عومرا بێ حورمەت نەبی

* * *

«٧٥»

## فرمانکەر شیرینە

کەسێ کارکا خۆشەویستە. رۆژێ لە رۆژان بولبولێ وتی بە بازێ: من لە حاڵی تۆ و لە حاڵی خۆم سەرم سڕ ماوە، تۆ ماقووڵ و خۆشەویستی لای خەڵک و پیاوە ماقووڵەکان، هەڵتئەگرن و ئەتنێن بە سەر دەسیانۆ و لەگەڵ ئەوا قسە ناکەی. من زیندان کراوم لە قەفەسدا و بێ قابلم لە بەر چاو خەڵکا کەچی قسەیان بۆ ئەکەم

و گۆرانیان بۆ ئەڵێم، باز وتی بە بولبول: دەلیلی ئەم کارە زۆر ئاشکرایە. ئەو خەڵکە ئیحتیرام لەمن ئەگرن لە بەر ئەوە نەچیریان بۆ ئەگرم و هیچیش ناڵێم، تۆ گۆرانیان بۆ ئەڵێی و هیچ کارێکیان بۆ ناکەی و پێشینیان وتویانە: نوێژ کەری نووری فرمانکەری شیرینی، نوێژ نەکەری قیرینی لات و ماتی نفرینی.

❊ ❊ ❊

«٧٦»

## تەگبیر بەس نیە

ئەڵێن دوو مشک لە هەمارێکا بوون، وتوووێژیان ئەکرد، یەکێکیان وتی: خوشکە رەحم بکە بە دایک و باوکی پیرت. براکەت نەخۆشە شتێکی بۆ پەیاکە وتی: ئەم خەڵکە زۆر بێ رەحمن بۆ فەقیرو لێ قۆماو لە هەمارا هیچێ جێ نایەڵن بۆ ئەوان. ئەویتر وتی: سەرت سڕ نەمێنێ ئەوان لەبەین خۆیانا بۆ بێ بەش و لێ قۆماویخۆیان رەحمیان نیە. ئێمە هەر لە زوو زوڵم لێ کراوین. نابینی پشیلە چ زوڵمێکمان لێ ئەکا. من فکرێکم بۆ هاتووە بە گوێم کەن، زەنگێ پەیا کەین بیکەینە مل پشیلەکە، هەروەخت هات بۆمان ئەیبیسین و رائەکەین. وتیان زۆر چاکە با بڕۆین بۆلای باوکمان پرسێکی پێکەین ئەو فکری زۆر تیژە و سەردەرچووە. باوکیان کە قسەکەی لێ بیستن، وتی: زۆر فکرێ باشنان کردووە، وەلێ کێ بێ ئەونە جورئەتی بێ ئەو زەنگە کاتە مل ئەو پشیلە. کە بێدەنگ بوون، ئا لەو بێ دەنگ بوونا بۆ هەمووکەس مەعلووم بوو کە بە تەنیا پرس و راکردن کار دروس نابێ. ئەوە کە زور موهیممە کار کردن و لەسەری رۆیشتنە.

بی وچان کارکە رۆژ تا ئێوارە     کارکردن مایەی ژینی هەژارە
سەربەرز و ڕووسوور هەردوو دونیا تۆی     خۆت مانوو بکەی نانی خۆت بخۆی

❊ ❊ ❊

«٧٧»

## سەرمەشق

مووسا ناوێ لەبەر خۆیۆ ئەیوت: گورگ هەر رۆژێ لە لایەکۆ مەڕەکانمان ئەدزێ و ئەیخوا ئەبێ ئێمە هەقی لێسێنین. رۆی بۆ دەوری کشت و

کاڵەکەی لەو کاتا خوشکێکی چاوی پێ کەوت وتی: ئەم گورگە خوێن مژە مەڕەکانی دزین زۆر بە هەڵمەتە و بە قووەتە و قاتڵە ئەبێ لە ئەزیەت و ئازاری زۆر بترسین. مووسا لە ڕێی گورگەکەدا تەڵەیێکی دانا گورگەکە بووبە تەڵەکەوە. مووسا گرتی و نەوتی کرد بە کلکیا و ئاوری دا. گورگەکە لە ترسا رای کرد بۆ ناو کشت و کاڵەکەی هەمووی ئاوری گرت و سووتا. مووسا زۆر ناڕەحەت و غەمبار بوو دایکی بەم هەموو خەم و خەفەتۆ چاوی پێ کەوت وتی: ڕۆڵە خەم مەخۆ ئەمە سەر مەشق و عیبرەتە بۆ تۆ کە ئینتیقامەکەت ناڕەوا بوو. چاودێری کردنی ئوسووڵی ئەخلاقی حەتا لە حەق سەندنا زۆر پێویستە.

مووسازوڵمی کرد لەگەڵ ئەوگورگا　　بەو هەموو خەمۆ کەوت بە سەر ورگا
جا دایکی پێی وت ئەمە عیبرەتە　　سەر مەشقە بۆ تۆ ئەم سەر گوزەشتە

* * *

«٧٨»

## ئەویش ژیانی ئەوێ وەک تۆ

نەفەرێ ئەڵێ من نەچیرەوان بووم، سەفەرم ئەکرد بۆ هەموو وڵاتێکی جۆراوجۆر بۆ نەچیری حەیواناتی نایاب. لە یەکێ لەو سەفەرانما حەوت ڕۆژ تەواو گەڕام بە شوێن نەچیرێکا لە یەکێ لە جەزیرە تەختەکانا شوێنەواری ئاسکێکم هەڵ کرد کە شاخی جوانی بوو، یەکێ کە لەویا یارمەتی دام لەو راوا یەکێ بوو لە دانیشتوانی ئەو جەزیرەیە کە ڕێگەکانی ئەزانی و بەڵەد بوو. کە ڕۆژ ئاوا بوو دانیشتین لە ژێر دارێکا کە لە پاڵ تەپۆڵکەیێ ریخا بوو مانگە شەومان لێ دەرکەوت کە وەکوو زیو ڕەنگی جوان بوو ڕەنگی عەرز ئەونە جوان بوو دڵی بینەری ڕائەکێشا بۆلای خۆی لەو وەختا چاوم کەوت بە ئاسکێ بە لەنجەو لارۆ ئەڕۆیی تا گەییە سەر یەکێ لە تەپۆلەکان و دانیشت، وتم بە ڕەفیقەکەم بڕوانە ئەوە ئەو ئاسکە جوانەیە کە لە بەیانیۆ ئێمە ئەگەڕین بە شوێنیا بڕوانە بۆ ئەو شاخە جوان و قیمەتییە کە لەبەر ڕۆشنایی مانگەشەوەکەدا وەک زیو ئەدرۆشێتەوە. ئاسکەکە بە ئێمەی زانی وێسا لە سوچێکا بە حەیرانی تەماشای جوانی مانگی ئەکرد، سیلاحم بۆ دەرهانی وەلێ دەسم سیلاحەکەی نەئەگرت. لە دڵ خۆما ئەموت چۆن من دڵم

بێ ئەو ئاسکە جوانە بکوژم کە عاشقی جوانی و ژیانی خۆشی خۆی بووە وەکوو من لانەی خۆی تەرک کردووە و لە بەین دارەکانا بەم شەوە هاتووە بۆ تەماشای مانگ و وتوووێژ لە گەڵ مانگا. سیلاحەکەم لە سەر ئەرز دانا و وتم بە رەفیقەکەم: نایکوژم، ئەم ئاسکە ناکوژم. تۆ ئەڵێی چی؟ وتی: زۆر چاک ئەکەی حەق بە دەسی ئەمە گیان دارێکە دڵی بە جوانی و ژیانی خۆی خۆشە وەکوو ئێمە.

ئەو ئاسکە جوانە لەو هەرد و بەردە　　زینەتە لەبۆ ئەو بەرد و هەردە

مەیکوژە ئەگەر تۆ خوێنت سەردە　　دەس لە تەماعی دونیایی بەردە

* * *

«۷۹»

## بە تەمای کەس مەبن

وەسیەت چۆلەکە بۆ بەچکەکانی. دایک چۆلەکەیێ وەختێ کە لە هێلانەکەی ئەڕۆییە دەرۆ بە شوێن رزقا بۆ بەچکەکانی ئەیوت: ئازیزەکانم چاودێری هەڵسان و دانیشتنی ساحێب ئەم پەڵە خەلە بکەن کە ئێمە لە ناویا هێلانەمان کردووە. کە هاتمۆ بۆم گێرنۆ. رۆژێ هاتۆ بەچکە زەرنەقووتەکانی وتیان: داوای گەلی کردووە لە هاوسێکانی بۆ کۆکردنەوەی کشت و کاڵەکەی بەیانی هێلانەکەمان ئەشێوێنین. دایکە چۆلەکەکە وتی: هیچ خەمتان نەبێ بەیانی هەریەک بە بیانوویەکۆ نایێن بۆ درەو. بۆیە رۆژێ‌تر وتیان ئەم ساحێب خەلە ئەیەوێ داوا لە کەسەکانی کا کە بێن درەوی بۆ بکەن و کشت و کاڵەکەی بۆ کۆ کەنەوە. دایکەکە وتی: هیچ خەم مەخۆن یەکی بە بیانوویەکۆ نایێن. چەن رۆژێکی پێ‌چوو وتیان دایە ئەم ساحێب خەلە ئەیەوێ خۆی بەیانی بێ بۆ درەو و چی بکەین؟ دایکەکە وتی: رۆڵەکانم ئێستە ئەبێ بترسین و کۆچ بکەین. ئینسان وەختێ تەمایەر خەڵک بوو کاری موهیممی گەورەی بۆ جێ‌بەجێ نابێ. وەلێ وەختێ تەمایەر کەسی‌تر نەبوو خۆی نەبێ. ئەبێ لێی بترسین.

وەختێ تەمایەر کەسێ‌تر نەبی　　کار خۆت بۆ ئەکرێ با قەوی نەبی

وەختێ تەمایەر ئاوسێ و کەس ببی　　هیچت بۆ ناکرێ هەر هەڵویس ئەبی

* * *

«۸۰»

## مێلووره

عالەم گشتی وێساوه بەبۆن عەمەلەوه دەرناچێ هیچ گیانداری لەم یاسای چەند ساڵە کە خوا داینیاوه چکۆلە بێ یا گەوره بێ. وه ئینسان سەری دەرناچێ لە ئەسراری ئەم یاسا مەگەر لە کەمێکی نەبێ. بۆ نموونە: کەسێ تەماشای ژیانی مێلووره بکا شتی زۆری چاو پێ ئەکەوێ کە سەری زۆر لێ سڕ ئەمێنێ تەماشای چکۆلەیی مەکەن کە ئەو موهەندیس و میعمارێکی زۆر چاکە کە لە ژێر خاکا قەڵای مەحکەم بۆ خۆی دروس ئەکا جێ پێی باش بۆ خۆی دیاری ئەکا لە ناو عەرزا. لە هەموو نەوعێ دانەوێڵەی تیا کۆ ئەکاتەوه سەمەری ئەوەی کۆیەکاتەوه لە زستانا دەسیەکەوێ بێجگە لەوه کە ئەم سەرەوسەر دانەوێڵەکە ئەقرتێنێ کە سەوز نەبێتەوه. وەختێ کە زانی تەڕ بووه ئەو دانەوێڵە ئەکێشێتەدەرەوه لە بەر خۆرا هەڵیئەخا با وشکۆ ببێ و زایەع نەبێ جا ئەیباتۆ ژوورۆ. با هەموو ئینسانێ کۆششی ئەم گیانلەبەره بچکۆلەیە بکا بە سەرمەشقی خۆی با هەمیشە بۆ پێک هانینی هەموو مەرامێکی سەرکەوتوو بێ.

| | |
|---|---|
| دەرسێ مێلووره دایئەدا بۆمان | ئێمەیش سەمەر خۆین لە کۆشش خۆمان |
| هاوین زەخیره بخەین بۆ زسان | بێخەم دانیشین لە ماڵۆ زمسان |

* * *

«۸۱»

## گوێ خنین

ماڵە دەوڵەمەنێ زەنگێ قیمەتییان هەڵاوسی بوو بە دەروازەکەیانا کە وەختێ کەسێ هات بزرێتۆ و پێی بزانن. دزێ هات و تەمای کرده ئەو زەنگە کە بیدزێ، وەلێ لەوه ئەترسا کە زەنگەکە بجوولێتۆ و دەنگی لێوه بێ. بیری کردۆ لە خۆیۆ کەوتە سەر فکرێ غەریب وتی: دوو گوێم پڕ کەم لە لۆکە ئیتر دەنگ زەنگەکە نابیسم. هەردوو گوێی پڕ کرد لە لۆکە و ڕۆییە بەرۆ بۆ دزی زەنگەکە بیری لەوه نەکردۆ کە گوێی خەڵک خالیە و دەنگ زەنگەکە ئەبیسن. وەختێ زەنگەکەی زڕاندۆ ساحێب ماڵەکە رای کرد بۆلای زەنگەکە، دزە بێ هۆشەکە

........................................................................

سەرسام ما و وتی: زۆر عەجایبە ئەوان لەو دوورۆ دەنگ زەنگەکە ئەبیسن من لەم نزیکا نای بیسم.

گوێچکەت مەخنە با تۆیش ببیسی      لۆکە نایەڵێ ئەرنا ئـــەیبیسی
دزێ کە ژیرە و فیکری تـــەواوە      نابێ بە جەسەی ئەوە لێقەوماوە

* * *

«٨٢»

## سەفەر و دۆستی گیانی

دارسانێ جوان لە نزیک شارێکا بوو دوو رەفێق گیانی‌گیانی قـەراریـان دا بڕۆن بۆ ئەو دارسانە بۆ راو. یەکـێ لـەو دوانـە کـە زۆر بـە خـۆی خـەڕە بـوو وتی بەویان: مەترسە تا من لە گەڵتابم هیچ دوڕندەیەکێوی ناوێرێ نزیـک ئێمـە کـەوێ، لەو وەختا دەنگ ورچێ هات بەخۆخەڕەکە زۆر ترسا و رەفێقەکەی بەجێ‌هێشت و رووی کردە دارێک و چووە سەر دارەکە، ئەمی‌تریان کـە ورچـەکـەی لـە نزیـک خۆیا چاو پێ‌کەوت لە خۆیۆ وتی: تەنیا کەوتووم رێی راکردنم نیە تـا ئـەو ورچـە لەگرابێ. ناچار خۆی کرد بـە مـردوو ورچـەکـە هاتـە سـەری رۆی بـۆڵای سـەری لووتی لێی نزیک کردۆ بزانێ هەناسە ئەدا بۆی پێوە کـرد و بـە مـردووی زانی و بەجێی هێشت و رۆی. لە دوای ئەوە براگیانی گیانییەکەی لە دارەکە هاتەخوارۆ بـە شەرمۆ و خەجاڵەتییەکۆ لێی پرسی ورچەکـە دەمـی لـێ‌نزیـک کردیتـۆ چـی وت؟ وتی: وتی بە من: رەفێقی لەگەڵ کەسێکدا مەکە کە بە خۆخـەڕە بێـت لـەبـەر ئـەوە ئازایی بە کردارە بە دەم بازی نیە.

رەفێقی راستەقینە یا نیە یا زۆرکەمــە
رەفێق تیکە هەڵگلێن زۆر بە داخۆ وەرهەمـــتە
هەتا تەجرەبەی نەکەی بە باشی بڕوا نەکەی
سەفەر سەنگی مەحەککە لەوێ تەجرەبەی ئەکەی

* * *

«٨٣»

## ئەخلاقی جوان نەک پارتی

مودیرێ شیرکەتێکی بە دەسۆ بوو ئیحتیاجی بوو بە حەسابدارێ بۆ بەڕێوە بردن شیرکەتەکەی. بانگەوازی کرد کە من ئیحتیاجم بە حیسابدارێ هەیە بەم شەرایتە. بە راسپاردەی چەن دۆسێکی چەن نەفەرێ بە کارنامەوە هاتن کەسیانی قەبووڵ نەکرد. تا جوانێ هات بێ‌کارنامە و بێ‌راسپاردە لە رێوە بێ‌قەید و شەرت ئەو جوانە بێ‌تەجرەبەیە قەبووڵ کرد. جا لێیان پرسی لە ناو ئەم هەموو کارنامەدار و تەجرەبەدارو راسپاردەکراوانا بۆچی ئەم جوانتە بێ‌قەید و شەرت و بێ‌تەجرەبە قەبووڵ کرد؟ وتی: لایەقەت‌دار ئەو کەسە نیە کە کارنامەی زۆر و راسپاردەی زۆری بێ، لایەقەت دار کەسێکە کە رەفتاری جوانی بێ. ئەو جوانە لە ناو ئەمانا چوار رەفتاری جوانی نیشان من دا کە ئەوانە پێویستی حەسابدارین:

١. ئەم جوانە کە هات لە پشتی درگاکەوە وێسا و داوای ئیزنی کرد جا هاتە ژوورۆ.

٢. لیباسەکانی با سادە بوو، پاک و تەمیس بوو.

٣. یەکە یەکە سەلامی لە هەموویان کرد.

٤. خۆی هەڵنەئەکێشا و خەڵکی بە سووک تەماشا نەئەکرد.

ئەمانە بوون بە هۆی هەڵبژاردنی من بۆ ئەو.

شەرتی ئینسانی ئەخلاقی جـوانە    پەیرەوی کردن دەستور قـورئانە
حەزرەت موحەممەد سەلامی لەسەر    خولقی عەزیمە تاریفی یەک سەر

* * *

«٨٤»

## لە شا گەورەتر

شایێ وتی: بم‌بەنە جێیێ دامنێن کە لە خۆم گەورەتری تیا نەبێ. ئەوانیش لە قسەکەی حالی نەبوون لە مەنزڵێکا دایان نا منالێ لەویا بوو، بیانووی ئەگرت بۆ تاجەکەی سەر شا، بۆی داگرێ بیکا بە گەمەی منالان. جا شا وتی: نەموت بم‌بەنە جێیێ کە لە خۆم گەورەتری تیا نەبێ. بۆیە وتوویانە نازم هەیە زۆرم نیە.

منالّ ناز نازی هێزی زۆرتـره　　　حوکمی له حوکمی شا زۆر پێشتره
ناتوانن بیانووی بۆبەن بەڕێـوە　　　که ئەونـه سەختـه نـابری بـه ڕێـوه

＊＊＊

«۸۵»

## میوانی له مل نه‌که‌وتوو

ڕۆژێ میوانێ رووی کرده ماڵێ زۆر به روو خۆشییۆ ڕۆیین به دەمێ چەن ڕۆژێ ماوۆ تا یاس بوون له میوانه‌که، روویـان نـه‌بـوو جـوابی کـه‌ن بـه دزی ئـه‌وۆ ته‌گبیریان کرد که بڵێین بارئه‌که‌ین لەم دێ. باریان پێچاوۆ لەگەڵ میوانه‌کـه چوونـه دەرۆ به ناوی ئەوۆ که کۆمەک بێنن بۆ بارکردن. له یەک جیابوونۆ خۆیان شـاردۆ له میوانه‌که چەن ساتێ چوونه ماڵه دراوسێ جا هاتنۆ بۆ ماڵۆ میوانـه‌کـه فـێڵاوی‌تـر بوو ئەیزانی فێڵێ لێ‌ئه‌که‌ن بەرلەوان هاتۆ له ژێر هەرزاڵه‌که‌یانـا خـۆی شـاردۆ کـه هاتنۆ زۆر برسییان بوو و زۆر تاقه‌تیان بۆیەک چووبوو، یه‌ک تـاوه هێلکـه‌ورۆنیـان دروس کـردو لـه‌گـه‌ڵ سـفره‌کـه‌یـان نایانـه ژێـر هـه‌رزاڵـه‌کـه و وتیـان: دوای که‌یف‌کردنمان ئه‌یخۆین. دوای ئەوه پیاوکه هەڵسا وتی به ژنه‌که: ئیسه مـن لـه‌بـه‌ر چاو تۆدا له کێ ئه‌چم؟ وتی: له یۆسۆی میسر ئـه‌چـی. ژنـه‌کـه وتی: ئـه‌ی مـن لـه کێ‌ئه‌چم؟ پیاوه‌که وتی: لەبەرچاو منا له زلێخا ئه‌چی. میوانه‌کـه کـه تـا ئـه‌وان ئـه‌م هانوو هوونیانه‌کرد هێلکه‌وڕۆنه‌که‌ی خواردبوو و تاوه‌که‌ی کرده سه‌ری و هەڵسا و وتی: ئه‌ی من له کێ ئه‌چم؟ وتیان تۆ له میوانه باوه‌حیزه‌که ئه‌چی. ئیتر به ده‌س ئه‌و میوانۆ نه‌جاتیان نه‌بوو بەم فێڵه. بۆیه ژنان به میوانیان وتووه:

کشه کشه پۆپـه ڕه‌شـه　　　میوان شـه‌وێ دوان خۆشـه

میوانی لاساریش وتوویه‌تێ:

کشه کشه پۆپه لاره　　　میوان جێگه‌ی تا به‌هاره

میوان که ته‌کلیف خۆی بدۆزێـتۆ　　　نابێ له سێ ڕۆژ زیاتر مینێـتۆ
که ساحێب سفره یاس‌بووله میوان　　　خۆشی تیا نیه مانه‌وه‌ی ئـه‌وان

＊＊＊

«۸٦»

## بۆچی پارەی زۆرمان بۆ ییتۆ؟

رۆژێ لە مەریوانا ماڵێ پارەی زۆریان لە ئیدارەی ئاوەوە بۆ ییتۆ کە زۆر زەحمەت ئەبێ بە لایانۆ پارە دانەکەی. شکات ئەکەن بۆ زۆری پارەکەیان مەئموور ییت بۆ تەماشای کونتوور و شێرەکانیان. کونتوور ئیرادی نابێ تەماشای شێرەکانیان ئەکا هەموو تکە ئەکەن. مەئموورەکە ئەڵێ: برا گلەیی لە ئێمە مەکەن خۆتان شێرەکانتان خاس کەن. کە نازانن، وەسایێ بێنن با تکەی شێرەکانتان بەسێ و پارەی زۆرتان بۆ نەییتۆ. راسی کردووە ئیسراف لە ئاوا حەرامە و خوا ئەهلی ئیسرافی خۆش ناوێ کە بە کوردی پێیان ئەڵێن: هەڵەخەرج حەتا لە دەسنوێژا لە سێ جار زیاتر شۆرینی ئەعزای بەدەن خراپە مەگەر لەبەر گەرما یان لەبەر لابردنی پیسی یان بە هۆی تەڕ نەبوونی ئەعزا.

| | |
|---|---|
| دەس پێوەگرتن لەگەڵ قەناعەت | سەربەرزییە بۆ دونیا و قیامەت |
| ئیسراف حەرامە مەیبە بەرێوە | دەس پێوەگرتن ببە بەرێوە |
| قەناعەت هیچی تێناچێ بۆمان | مایەیە باشە بۆ ناو ماڵ خۆمان |

* * *

«۸۷»

## رەسم و یاسای زوو بۆ مردوو

باسی مردوو کە لەمەوپێش چۆن بووە، کەسێ بمردایێ تا دەورەی بیست رۆژ مانگێ بە گوێرەی ماقووڵی و ناماقوڵی مردووەکە، پرسەیان بۆ دائەنا و هەرچێ مومکین بوایێ لە حەیوان، ساحێب مردوو رازی بوایێ یا نارازی، سەریان ئەبڕی و سفرەیان لێڕائەخست بە حەرامی، ئەو ماڵیانە تالان بێ هاوماڵ ئەکرد و ئەیان خوارد و بە پیاوەتییەکی زۆر باشیان دائەنا. بێجگە لەمەیش چەن عادەتێکی ناشەرعی و ناپەسەندیان بوو.

۱. مردوو لەپاش ئەوەکە لە دەرۆ ئەیانشۆری لەو جێگە شۆردنیا ئاوریان ئەکردۆ. دوو پێخۆی قوڕیان ئەگرتۆ، هەرکەس ئەڕۆیی بۆ دەوریان چەپۆکێ لەو قوڕیانە ئەدا بەسەریا و دووچەپۆک بەسەر هەر دووشانیا.

٢. دوای پرسە جلی مردووەکەیان ئەهانی وەکوو موجەسسەمەی مردووەکەیان لێ ئەکرد و ئەیاندا بەسەر ئەسپێکا و هەموو بە شیوەن و زاری و واوەیلا و قورپێوان و خاک بە سەرا کردن و یەخە دادڕین ئەکەوتنە شوێنی و ئەم کاریانە چەن را تەکرار ئەکردۆ بە گوێرەی شانی مردووەکە. وە بەمیانە ئەوت ئالای و کۆتەڵ.

٣. ئەو جلانە تا ماوەیێ زۆر نەیانئەدا بە خەڵک بازۆریشی پێ موحتاج بوون و هەموو جومعەیێ ژنان کۆ ئەبوونەوە بە سەریا ئەگریان. یەکێ دەنگ خۆشیان بەتی و بلوورەی بۆ ئەوتن و ئەوانیش بەو نەزمە ئەگریان.

٤. سێ رۆژە و حەوتە و چلەیان بۆ ئەگرت.

٥. لە وەختی مردنا بازێکیان رووی خۆی رەش ئەکرد یا یەخەی کراسەکەی دائەدڕی یا خۆی ئەڕنی یا ئەیدا بە سەرو پرچک خۆیا.

٦. خۆراکیان ئەبرد بۆ سەر زیارەت لە چێشت و گۆشت و کولێرە و هەرچێ مومکین بوایە. بەمیانە ئەوت بەرمەیتانە. جا مامۆستا گەورەکان خوا جەزایان باتۆ زۆر مۆجگاریان کردن و زۆریان پێ تەرک کردن کە هەموو خیلافی شەرعن و ئێمەیش بۆ تەرکی باقیەکەی هەوڵ بدەین.

لە هەموو شتێ بە کەڵکتر بۆ مردوو قەرزدانەوەیەسی لە پێش میرات بەش کردنیا کە خۆی وا لە رەهنی ئەو قەرزیا. دوای قەرز ئەگەر مایۆ بەشی کەن و خێر و خێرات بۆ کردنی و قورئان بۆ خوێندنی زۆر بەکەڵکە هەمووومان فاتیحە ئەزانین بیخوێنین.

جا بزانین شەرعی ئیسلام لە بارەی مردوو مردنۆ چی ئەفەرموێ با بیگرینەگۆی:

چوار شت کە فەرزە بۆ مردوو بیکەن ئەبێ بە تەرتیب بەم جۆرە بیکەن
شۆرین و کفن و نوێژ کردنی بەخاکێکی پاک تەسلیم کردنی

وە چەن شتێ لە پێش مردنیا کردنی سوننەتە: ١.تۆبە پێ کردنی. ٢.یاسین خوێندنی. ٣.وەسیەت کردنی بۆ قەرزو قۆڵە و ئیحسان و ئیسقات و قوربانی و هەرچێ خیلافی شەرع نەبێ. وەسیەت بۆ خیلافی شەرع دانامەرزێ. وە دوای مردنی چەن شتێ سوننەتە کە بۆی بکرێ: ١.چاو قونجاندنی کە بۆق نەبێ.

.................................................................

۲.کاکیله هەڵبەستنی کە دەمی دانەچەقێ. ۳.جومگە نەرم کردنی کە جل‌داکەندن و شۆرینی سەهل بێ. ٤.پشتەوقەفا خستنی و شتێکی قورس بنرێتە سەر سکی بۆ ئەوە کە هەرچێ وا لە سکیا ئامادە بێ بۆ دەرچوون لە پێش شۆرینا، دەس بێنن بە سەر سکیا ئیتر باقی دەستوورات شەرعی بۆ بە جێ بێنن. وەکوو نووسراوە لە شەرعا سوننەتە سەرخۆشی کردن لە کەسووکاری مردوو با تەسلیمی خاکیش نەکرابێ تا سێ رۆژ لە هەر کوێ رێ کەوێ. وەلێ مەجلیس گرتن بۆ هاتن پرسەکەر لە ماڵا یا لە مزگەوتا بیدعەتە و لە دوای سێ رۆژ سەرخۆشی بیدعەتە. پێغەمبەرﷺ بۆ مردن ئەسحابەکانیﷺ لە هیچ کوێ پرسەی دانەناوە

سەر خۆشی بکەن لە پاشماوەکان — تا سێ رۆژ رێ کەوت «بایّ مکان»
لە پاش سێ رۆژە ئیتر بیدعەتە — یانێ موخالیف یاسای حەزرەتە
وەک مەجلیس گرتن بۆ هاتن خەڵکی — رِیایە ئیتر هیچ نیە کەڵکی
خۆراکیان پێ بەن خۆراکیان مەخۆن — خەمیان پێ مەدەن خەفەتیان بخۆن
قەوم و عەشرەت و خزم و کەسووکار — تالانیان مەکەن تەواوی یەکجار
ئیمرۆ لە منە سۆزی لە تۆیە — سۆزی کە نۆرەی خەفەتی تۆیە

وە بە خوشکان ئەڵێم:

بێ رەزای شووەکەت مەڕۆ بۆ پرسە — لە قەهر و عەزاب خوا بترسە
کەسێ نایناسی مەڕۆ بۆ پرسە — کە ناچاری بێ‌هەریەک جاربەسە

ئەوەی کە زۆر چاک و ئیحسانە لە وەختی کۆچی دوایی بۆ کەسووکار دوو شتە: ۱.سەر لێدان و عەیادەت کردنە لەکاتی نەخۆشینیا. ۲.بەڕێ کردن و کۆمەک کردنە لە وەختی بەڕێ کردنیا بۆ سەر زیارەت. ئەگەر بە پێ بتوانێ بڕوا با ئەجری زۆرتر بێ باشترە ئەگەر نەتوانێ بە سواری بڕوا. لە رێیێکو بڕوا و لە رێیێ‌ترۆ بێتۆ با ئەجری زۆرتر بێ.

****

«۸۸»

## ئەشکەوتی سەهۆڵان

لە بەینی بۆکان و مەهابادا ئەشکەوتێ هەیە بە ناو غاری سەهۆڵان و کۆنە کۆتریشی پێ ئەڵین. کە درێژی ئەو غارە شەش‌سەد میترە وسێسەد میتری تەڕە و

سێسەد میتری وشکییە. بازێ جێگەی هەیە تائێستا کەشف نەکراوە وتازە دەوڵەتیان بەم ئەشکەوتە ئاشنا کردووە، هەشت ساڵە وا لە ژێر چاودێری مەهابادا و تا ئێستا سوودی لێ وەرنەگیراوە. وە لە زۆر جێگەوە یێن بۆ تەماشای. وە لە ناو ئەو ئەشکەوتا گۆمێ هەیە کە قووڵی لە بازێ جێدا بیست میتر ئەبێ ئەو ئەشکەوتە زۆر تاریخییە و دیدەنییە تا کەسێ نەتوانێ بڕوا بیبینێ نازانێ چۆنە و پەشیمانە نەڕوا. وە ئەو ئەشکەوتە ئەگەڕێتەوە بۆ پێش زەمانی ئەشکانیەکان و دووەم غارە لە ئێرانا. لە غاری «عەلیسەدر» زۆر موهیمترە چوون بە چاوی خۆم دیومە.

بڕۆن بیبینن ئەشکەوت سەوەڵان    خوا چی سازکردووە لە خاک و خۆڵان
سەیرانی سەرنج ڕاکێش‌وخۆشە    لابەری خەم و دەردی نەخۆشە

* * *

«۸۹»

## قولەی پیرڕۆسەم

لەلای کێوی پیر رۆسەمی هەورامانا کە قەبری پیر رۆسەمی کوڕی پیرشالیاری تیایە قولەیێ هەیە بە ناو قولەی «خان ئەحمەدخان». ئەڵێن لەو وەختا ئاشپەزخانەی ئەو قولەی خان ئەحمەدخانە لە حەوشوبارانی بووە. ئەونە نۆکەر و پێش‌خزمەتی زۆر بووە بە دەساو دەسی چێشتیان بە گەرمی بردووە بۆ ئەو قولە و خواردوویانە. وە لە پشتی شاری هەورامانۆ، قەلایێ‌تری خان‌ئەحمەدخان هەیە کە ئێستاش دیواری زۆری ماوە کە لە بازێ جێیا چوار میتر ئەبێ‌کە لە شاری هەورامانۆ دیارە، من خۆم چوومەتە ناو ئەو قەلا بەرزە.کانیێ لە ژووریۆ هەیە هەرچەن بەرزی و نزمی لە بەینیانا هەیە بەلام بەگونجی خاکی سووریۆ ئەو ئاویانە بردوە بۆ ناو قەلاکە. لەویا بەو ئاوە ژیانیان چووە بەڕێوۆ ئێستاش لە ژێر ئەو عەزرا گونجی زۆری لێ بە جێ ماوە. وە بەو ئاوە باخاتی زۆریان دروس کردووە.

خان ئەحمەدخان ئەردەڵان    لەسەر خاکی کوردستان
قەلای زۆری بەجێ هێشت    ئەو دوانە لە هەورامان
قەلای زەلم و مەریوان    قەلای سنە و پالنگان
چەن قەلای‌ترلە جێگەی‌تر    کە نموونەن بۆ ئەمان

* * *

«٩٠»

## شوان و سوڵتان مەحموود

ڕۆژی سوڵتان مەحموود لەگەڵ ئەیاس‌خاسی وەزیریا ڕۆیین بۆ کێوسانێ بەرز بۆ ڕاو. لە پایین کێوسانەکەوۆ تووش ڕانێک و شوانێ بوون پرسیان لە شوانەکە: ئێمە ئەڕۆین بۆ ئەم کێوسانە بە عەقڵ تۆ لێمان نابارێ؟ وتی: نەخەیر قوربان خۆشەبێ بڕۆن بزنەکان کلکیان قنجە. ڕۆیین کە گەیینە سەر کێوەکە بارانێ زۆریان لێ باری دەزووی وشکیان نەما. کە هاتنۆ سوڵتان مەحموود گلەیی لە شوانەکە کرد کە هیچمان پێوە نەماوە، هەموو گیانمان تەڕ بووە. ئەیاس وتی: گلەیی لە خۆمان بکەین باشە کەسێ هەسێرە شناسی شوان بێ و تەقویمی کلکی بزن بێ، لەوە خاس‌تر نابێ.

بۆ هاتن باران عەقڵی هەموو کەس   بڕناکا، عەقڵی خۆت مەدە لەدەس
بۆ هەموو موشکل فریاد ڕەسێ هەس   فاعیلی موختار تەنیا خوایە و بەس

* * *

«٩١»

## حورمەتی پیری

پیاوێ زۆر دەوڵەمەند و لیرەدار پیر بوو نەیئەتوانی کاسبی بکا دانیشت لە پێی لیرەکانی. تا تەواو بوو سەرفی کرد بە باشی و بووشی بۆ خۆی و بۆ منداڵەکانی لە خۆشی خۆش‌گوزەرانی منداڵەکانی زۆر خزمەتیان ئەکرد. کە تەواو بوو خزمەتیان کەم بوو. ڕۆی بۆلای ڕەفیقێکی وتی: هیچم بە دەسۆ نەماوە. حورمەتم لای منداڵەکانم نەماوە، چی‌بکەم؟ وتی: پڕ یەکێ لە سنۆقە لیرە کانت بکە لە بەردە وردە بێ من بازێ لیرەت پێ ئەدەم بە بەرچاو ئەوانۆ بێ‌ژمێرە و بیخە سەرسنۆقەکە و بڵێ: ڕۆڵە دڵم نایێ ئەم لیرانە خەرج کەم دوای مردنم بەشی‌کەن لەبەین خۆتانا. بە عادڵانە بەشی هەمووتان ئەکا. جا بە دزی ئەوانۆ لیرەکانم بۆ بێنەرۆ کلیلێ باشی لێ‌بدە. ئەویش وای کرد لە خۆشی لیرەکان باش‌تر لە جاران خزمەتیان ئەکرد تا مرد. کە تەماشایان کرد پڕیە لە بەردەوردە و فێڵی لێ کردوون. جا ڕەفیقەکەی ئەم بە سەر هاتیە بۆگێڕانۆ.

پیاوی پیر ئەبێ تەگبیری وابێ | هەرتاحورمەتی‌لای منال مابێ
نەکاتە کارێ پشکی لێ دەرخەن | بەلاتە لاتە بێ‌حورمەتی کەن

* * *

«۹۲»

## خارق العاده

لە رۆژی ۱۳۸۱/۹/۱۷ ه.ش بیستم کە لەم سالانا لە ولاتی «تانزانیا» منالێ لە دایک بووە لە عوومری چوار مانگی بانگی موحەممەدی بە ئاشکرا داوە، لە عومری چوار سالییا تەواو قورئانی بە فەسیحی خوێندووە و تەفسیرەکەی تەواو زانیوە و بەیانی کردووە و بە سێ زوان قسەی کردووە. بردوویانە شارەوشار کە وەکوو موعجیزە نیشانیان داوە بە خەلک بۆ ئیسبات حەقانیەتی ئیسلام و بە رادوێ و تەلەویزیۆن و ویدیۆ و بە رۆژنامە و گۆڤار بە دونیادا بلاوکراوەتۆ کە هەمووکەس بیستوویەتی.

بۆ یادگاری، بۆ داهاتووەکان | ئەم باسەم نووسی بۆ ئێوە و ئەوان
کە دینی ئیسلام سابت و حەقە | موخالیف هەرچێ ئەلێ ناحەقە

* * *

«۹۳»

## شیرین و فەرهاد

فەرهاد کە زۆر حەزی لە شیرین ئەکرد، قەولیان پێ دابوو کە ئەگەر بەو دەسوورە کەئێمە پێت ئەدەین، تاقەوسان و عەکسی شیرین دروس کەی لە بەرد، ئێمە شیرینت پێ ئەدەین. لە خۆشی شیرین بە ماوەیێکی زۆر، ئاساری تاریخی لەویا دوروس کرد. یەک دوو رۆژێکی مابوو تەواوی کا، شێرۆ ناوێ‌کە زۆر حەزی لە شیرین ئەکرد، وتی بە پیرەژنێ: دایەپیرە فەرهاد نزیکە کە کارەکەی تەواوکا، تەگبیرم چیە؟ جا خۆ شیرین دەس ئەو کەوێ من زیرە ئەکەم! پیرەژن وتی: ئەو دیتانەکە لە فەرهادۆ نزیکە دەسووریان پێ بدە، شەو و رۆژێ ساوا نەخەنە ژێر حەیوان، تا من خۆم پێت ئەلێم، دوای شەو و رۆژەکە وتی: بە شێرۆ ئەڕۆم بۆلای فەرهاد کە نزیکۆ بووم حەیوانەکان بەن بۆ نزیک ساواکان با هەریەکێ چێتە ژێر

دایکی. خۆی که نزیکۆ بوو له فەرهاد، بوو بە هەرایێ، قاڕەی ساواو و باڕەی دایکیان و قیڕەی ساحێبەکانیان، فەرهاد وتی: دایە پیرە ئەوە چیە؟ وتی: شیرین مردووە، ئەوە شین و واوەیلای ئەوە ئەیکەن. فەرهاد کە بەم خەبەرە زۆر نارەحەت بوو، لە پێشا پیرەژنەکەی هەڵ قلیشاند، دوای ئەوە قولنگەکەی دابەسەر خۆیا و خۆی کوشت و شیرینیش لە دوای فەرهاد لەسەر قەبرەکەیا خۆی کوشت.

پیرەژنی فەرهاد کووژ ئەو پەنیە دا بە فەرهاد
عومری عەزیز و رەنجی هەموو خستوەتە بەر باد

وتوویانە:

شینەکەی فەرهاد تەمام نەکەردەن
شینەکەی خەسرەو ئامان بە گەردەن
چەن کەس وەک فەرهاد مردووە بەو ئاخۆ
سەری ناوەتۆ بەو ئاخ و داخۆ
چی بکەین لە دونیا بەزمی هەر وایە
لەیلێ دەوڵەمەن، مەجنوون گەدایە
مەجنوون تفلێ بوو لە قوتابخانە
بە عیشقی لەیلێ بوو بە دێوانە

ئەم بەسەرهاتی فەرهاد و شیرینە وەکوو «المنجد» نووسیویە، فەرهاد و شیرین عاشق یەک بوون بە شیعر و نەسر داستانی زۆریان بۆ نووسیون، شیرین ژنی کیسراى شاى ئێران بووە. لە ئەسلا مەسیحی بوون، فەرهاد یەکێ لە وەزیفەخۆر و پیاوەگەورەکانی بەردەس شووەکەی شیرین بووە، شاعیرە فارس و تورکەکان حیکایەتی زۆریان نووسیوە لە بارەی عاشقی فەرهاد بۆ شیرین و مردنی فەرهاد بە داخی شیرینۆ.

* * *

«۹٤»

### میوانداری

رۆژێ یەکێ لە سەرە کۆمارە جافەکان لە دەشتی ساباقا لە هاوماڵ و ئاوسێکانی دەعوەت ئەکا لە دیوەخانیا لە دەوارا دائەنیشن سفرە رائەخەن. لەو وەختا مارێ هاتبووە ناو دەرپێکەی. هیچ خۆی شپرز ناکا با میوانەکان لێیان نەشێوێ. وردە وردە بیری پێ ئەدا بزانێ سەری مارەکە وا لە کوێوۆ. دەس ئەبا سەر مارەکە ئەگرێ دەسی لێ نادا تا ئەهلی مەجلیس بڵاوەی لێ ئەکەن، جا بە دەرپێکەیۆ تووری ئەدا تەماشا ئەکەن مارەکە تۆپیوە.

برِوا بۆ جورئەت ئەو سەر کۆمارە   هیچ خۆی نەشەمزان لە بۆ ئەو مارە
بـا میوانـەکـان نـەشـێوێ لێیـان   تێک نەچێ لێیان شایی و خۆشیان

＊＊＊

«۹۵»

## کوێخا و فەقێ؟!

کوێخادێێ کوڕێکی برد بۆ دێیێ‌تر کە مـەدرەسـەی دینی تیـابوو لـە دڵ خۆیا وتی: دوو کوڕم هەیە ئەمیانـە بابێ بـە مـەلا. ڕۆیـی بـۆ مـاڵ ئاشـنایەکیـان بـۆ ئیسڕاحەت و بۆ ڕانمایی و جێگە و ڕێگە و مـەلا و مزگـەوت و حـوجرەی فـەقـێ. دوای مانووحەسانەوەی ساحێب ماڵ لێی پرسی: بۆچی هـاتووی قێخـا فلانـەکـەس؟ وتی: ئەمەوێ ئەم کوڕمە بکەم بە مەلا، ڕێگەم بـۆ تـاقی کـەڕۆ. وتی: مـن و تـۆ لـە زووۆ ئاشناییمان گەرمە، تکات لێ ئەکەم بیبەرۆ بـۆ ماڵـۆ بـا کـۆمـەکییـەکـت پـێ بکات، کارێکت بۆ بکات. ئەم هەویرە، نانی باشی لێ دروس نابێ، لە تۆو لـە قێخـا ژنۆ لە خاڵۆیۆ لە نان و نعمەت قێخایی، لەوە ناچێ مەلایێکـی لـێ دەربچـێ کـە بـە دەردی موسوڵمانان بخوا، خاترت لێ ئەکەم بیبەرۆ. بەگوێی نەکرد هەر نـاردی بـۆ فەقێتی. بەناو بوو بە مەلا، وەلێ ڕەفتاری هەروەک کوێخا وەهابوو تا لەئاخریـا بـوو بە تفەنگ بە دەسی هەردی. ئەو کوڕە خۆی ئەیوت: ئیسە کە خۆم وام لێ هـاتووە ئەڵێم ئەو پیاوە زۆر ژیر بوو. پێش‌بینی باشی بۆ کردم شەڵڵا بەگوێم کردایـێ نـانی خێری خەڵکم لەحوجرەدا زایە نەکردایێ، وە ئەمەم بەسەر نەهاتایێ. تانەی ناتەبـەق ئەیوت «اللّه صَدَق».

ئـەگـەر شمـشێری بـڕاو تیـژ تـەوێ   لە ئاسنی باش مەگەر دەس کـەوێ
تۆ جۆ وەشێنی جۆت دەس ئەکەوێ   گەنم لە تووی جۆ هەر ڕێ ناکەوێ

＊＊＊

«۹٦»

## لالە و لادەن

بازێ وەخت خوای گەورە قودرەتی خۆی نیشان ئێمە ئەدات کە ئیمانمـان پتەوتر بێ بە قودرەتی. مەسەلەن شەوی جومعە لە تـاریخی۱۳۸۱/۹/۲۹ تـەلـەفزیـۆن

ئێران دوو کچی ٢٨ ساڵەی نیشان‌داین. کەئەم دوو کچە تارانی بوون بەناو «لالـە» و «لادەن» بیژەنی. کە تەواو بەدەنیان ڕێک‌وپێک و ساق و سەلیم و عاقڵ ولەسەرخۆ بوون. هەریەک ئینسانی ژیرو ژۆڵ و سەواددار بوون، کـە لـە کـەلاسـی یـەکـۆ تـا لیسانسی حقـووق خوێندوویانـە و ئیمتحانیـان داوە. وەلـێ حـەیفـێ لـە سـکوومای دایکیانۆ سەری هەردووکیان لکا بوو بەیەکا. کە لە تەلەوزیۆنا ئەتبینی روو بەڕووی ئێمە بوون لای گۆچکەی راسی یەکێکیان چەسپی بوو، بە لای گوێچکەی چـەپـی ئەویانۆ، بەشەر سەرگەردان ئەبوو بە جۆرێ کە دوکتۆرەکـان ئێران نـەیانتوانی لـە یەکیان جیا کەنۆ. وەلێ دوکتۆری دەوڵەتی سەنگاپوور کە لەم حاڵە ئاگادار کـران قەولیان دا ئەگەر ببرێن بۆلایان، لەیەکیان جیاکەنۆ. ئەوەبوو دوای ٢٨ سـاڵ پێکـەوە ژیان و جیا کرانەوە بەڵام دوای جیا کردنەوەیان هەردووکیان مردن. پیاو بیر ئەکاتۆ زۆر سەرگەردان ئەبێ کە تا ئەم عومرە چۆن خەوتـوون، حـەمـام و دەس‌بـەئاویـان چۆن بووە. باقی لازمات بەشەرییان چۆن بۆ جێبەجێ بووە!.

تەماشای قودرەت خودای گەورەکەی ئیمان خۆت بە خودا پتەوتـر ئـەکـەی
حاشـا لـە هـەمـوو ماسیوا ئـەکـەی هەر خۆت تەمایەر رەحمی ئەو ئەکەی

* * *

«٩٧»

## ڕێز لە پیر

پیاوێ لەبەر پیری دەسی ئەلەرزی، کوڕێکی بـوو ژنـەکـەی حـوکمی لـێ کرد، ئەبێ بڕۆی بۆلای خـەڕات، کاسـەیـێ داری دروس کـەی بـۆ باوکـت، لـەوا چێشت و شتی بۆ دانێین. جـا خـۆ باوکـت هـەمـوو کاسـەی چینی و شیشەکـانی شکانین با بە جیاوازی نان و چێشتی بۆ دانێین. کوڕەکە دەستووری ژنەکەی بەجـێ هانی. ڕۆیی لای خەڕات کاسەکەی دروس کرد و بۆی هانی. کوڕەکـە کـوڕێکی بوو پرسی: باوە لە کوێ ئەم کاسەتە بۆ باوەگەورەم دروس کرد؟ ناونیشانم بدەرێ. وتی: بۆچیتە کوڕەزاکە وتی: منیش ئەڕۆم بۆلای ئەو خـەڕاتـە کاسـەیـێ وا دروس ئەکەم بۆ تۆ، هەڵیئەگرم تا تۆ پیر ئـەبی، منیش لـەوا بـۆ تـۆ چێشت و خـۆراک

دائەنێم. ئیتر کوڕەکە زۆر خەجاڵەت بوو کاسەکەی تووڕدا و بە عادی وەکوو خۆیان خۆراکیان بۆ باوەگەورەیان دائەنا.

هەرکەسێ حورمەت بگرێ لە پیرێ — کە پیر بوو ئەویش حورمەتیەگیرێ
هەرکەسێ گەمە و گاڵتە کا بە پیر — گیرۆدە ئەبێ، ئەکەوێتە گیر

* * *

«۹۸»

## حورمەتی باوک

پیاوێ پیر لەبەر پیری خێزانی لێ عاسی بوو، کوڕێکی بوو سەوەتەیەکی هانی کە باوکی خاتە ناوی و بیبا بۆ هەردێ دوورو چۆڵ و هۆڵ و بەجێی بێڵێ و خۆی بێتۆ و نەجاتی بێ بە دەسیۆ ئەو کوڕە، کوڕێ ژیری بوو، وتی: باوە گەورەم بۆ کوێ ئەبەی، پێم بڵێ، هاتیتۆ سەوەتەکە بێنەرۆ لەگەڵ خوت، با منیش هەڵی گرم تا تۆیش پیر ئەبی و بەو سەوەتە بتبەم بۆ ئەوجێی باوەگەورەمە و بەجێت بێڵم خۆم بێمۆ. لەبەر ئەوە کە قسەکە زۆر بەجێ و کاری بوو، زۆر تەریقۆ بوو لەو خەیاڵە پەشیمانۆ بوو، دوای ئەوە تا باوکی مابوو، بە باشی خزمەتی ئەکرد و دڵی بەجێ هانی بۆیە وتویانە:

وەختێ لاشەکەم کەفتە کارەبێ — نووری بینایم لێ بێزار ئەبێ
کوڕ و کەنیشک و قەوم و منالم — ناپرسن چۆنە حاڵ و ئەحوالم
وەختێ نەتوانم خۆم بەم بەڕێوە — یا خوا نەمێنم، بمرم لە جێوە

* * *

«۹۹»

## سەردانی نەخۆش

دراوسێیێکمان نەخۆش بوو، بە قسەی دوکتۆر سەرەتانی بوو، ئاوسێ و بەراوسێ تەقەیان تێکەوت، دەسە دەسە و دانە دانە، ئەڕۆین بۆلای، منیش وتم بە کۆڕێکم: هاوسێمانە با بڕۆین بۆلای، کە رۆین ماڵێ چکۆلەیان بوو، زۆر بە ناڕەحەت جێمان بوو دانیشین ئەونە هاتبوون خەفەیان کردبوون، نەخۆشەکە ئەونە لە خۆیۆ لە میوان بێزار بوو بوو، رای کرد بۆ پشتە دیوی ماڵەکەیان خۆی شاردۆ، کە چاوم بەم حاڵە کەوت زۆر بەزەییم پیا هاتۆ، وتم: براکان ئێمە بێئازار و بێخەمین،

ئەو دەردەدارە و خەمبارە، خەمی ئێمەیش سەربارە، با لێی دورۆ کەوین، خۆ خەفە بوو، با هەناسەیێ پشوویێ بدا، با نزیکەکانی بێن بۆ دەوری، حەدیس ئەفەرموێ: کە چووی بۆلای نەخۆش خەبەر پرسی کە و زوو بێرە دەرۆ نەکا ئیحتیاجی بێ، رووی نەبێ بە لای تۆوە باسی بکا. ئێمە هەڵساین بازێ لە میوانەکان لەگەڵ ئێمە هاتنە دەرۆ. بەڕاسی نەخۆش زۆرتر موحتاجە بە دوو شت، یەک «ئیستراحەت» دوو «بێدەنگی»، ئەمانە ئەڕۆن بە قاڵە قاڵ دەوری ئەدەن، ئاسایشی ئەشێوێنن و خەفەی ئەکەن. زۆر زۆر بە پیاوەتی و بە باشی ئەزانن، باوکم «خوای لێ خۆش بێ» لەسەر مەرگیا، جەنجاڵی زۆر دەوروبەری دابوو، فەرمووی: رۆڵە، خۆزگا ئەمانتە لە من دوور ئەخستۆ، تا چارەک ساعەتێ. وتم: باوکم وا ئەفەرموێ: دوورۆ کەوتن، لەو چارەکە سەعاتا یاسینم خۆند، کەلیمەیەکەم لێ هەڵە بوو، غەڵەتی دام و ئەونە سەرەحاڵ بوو، لەو چارەکە سەعاتا، فەوتی کرد.

| | |
|---|---|
| سەر جەنجاڵ کردنی نەخۆشی هەژار | زۆرتر ئەکا بۆی نەخۆشی و ئازار |
| سەرسووکی دەوای دەردی نەخۆشە | بێدەنگ وبێوەی بە جل دایپۆشە |
| ئیمڕۆ لە ماڵۆ سەهلە، ئەتوانین | بە تەلەفونێ هەواڵی زانین |

* * *

«١٠٠»

## نانی پرسە

رۆژێ لە گەڵ پیاوێکا وتوو وێژمان ئەکرد، لەبارەی پرسە، و چل ساڵ بەرلەوە باوکی مردبوو، وتی: لەو رۆژا کەخۆیشمان دەوڵەمەن بووین کە باوکم پیاوێ ناودار بوو، ئەونە پرسەکەرمان هات، بێجگە لەوە کە لە ماڵ خۆمانا بۆمان جۆر بوو، هەشتسەد تمەن قەرزار بووبووین،کە بە سێ چوار ساڵ ئەو قەرزمانە بلۆ نەدراوۆ، هێشتا ئەو قەرز و زەحمەتیە لە بیر نەچوو بوو، دەی نەخێر مردوو نەسەدەقە سەر زینوو چۆن ئەو خۆراکە حەلاڵ ئەکەن و ئەیخۆن بە پیاوەتیشی ئەزانن.

| | |
|---|---|
| مەیخۆن کە حاڵی خۆراکێ وایە | نان پرسە زۆرتر «غصب الحیا»یە |
| نەڕۆن بۆ پرسە باشترە لەوە | تووشی حەرام بن بەخواردن ئەوە |

ئەگەر بۆت کرا مەڕۆ بۆ پرسە ئەگەرناچار بووی هەر رایە بەسە

* * *

«۱۰۱»

## نانی پرسە خێری نیە

دراوسێی ماڵە دەوڵەمەنێ بووم، گەورەیەکیان لێ مردبوو، پرسەکەر زۆر دەوری دابوون، لە کەسوکار و بێگانە، ئەوانیش بێدەریغ پلاو و گۆشتی زۆریان بۆ رژاندبوون، بە پای فیل. کەسی گەرەک بوو بڕوات و بخوات، نیوەڕۆیێ ئاگام لێ بوو، فەقیرێ بە کاسەیەکۆ، رۆیی بۆ ماڵیان بۆ چێشت لەو هەموو چێشتە بەشیان نەدا کاسەکەیان بە خالی پێ داوۆ وتیان: پرسەکەرمان زۆرە. لام وایە بەقەی ئەو کاسە چێشتە کە بیاندایە بەو فەقیرە لەو هەموو خۆراکە کە پرسەکەر خواردی خێریان نەگەییوە.

پرسەکەر ماڵی نەشێوێ ئیمڕۆ کە تالان ناکا و بەماشین ئەڕۆ
بەش ساحێب پرسە زۆر جێ ئەمێنێ خۆزگەم بەو رۆژە ئەمیش نامێنێ
نارۆن بۆ پرسە و زەحمەت ناکێشن لەماڵی خەلکا پێ راناکێشن

* * *

«۱۰۲»

## براکەم نابێتۆ

ژنێ شووەکەی و کوڕەکەی و براکەی، مەحکووم ئەبن بە ئیعدام کە فلان رۆژ بیانکوژن. ژنەکە بەخۆکوشتن و خۆبڕین ئەڕوا بۆلای حاکم، ئەلێ: کەس وەک من زولمی لێ نەچووە، کەسێ سێ خۆشەویستی بە رایەکا بکوژن. حاکم زۆر بەزەیی پیا یێتۆ، ئەلێ: یەکێکیان لەبەر خاتر تۆ ئازاد ئەکەم، کامیان حەز ئەکەی با ئازادی کەم. بیری لێ کردۆ، وتی: براکەم بۆ ئازاد کە. حاکم وتی: شووەکەت چەند ساڵە رەفێقتە و بە مردن ئەو ماڵ وێران ئەبێ، و کوڕەکەت جگەرگۆشەی تۆیە، بۆچی یەکێ لەوانە ئازاد نەکەم، براکەت ئەوێ ئازادی کەم. ژنەکە وتی: شووەکەم ئیعدام ئەکەی، دوای ماوەیێ ئەتوانم شوویێ کەم و

کوڕێترم ببێ، بەڵام براکەم کە مرد، باوکو دایکم زینوو نابنۆ و جوان نابنۆ تا برایەترم بیێتۆ.

| | |
|---|---|
| راسی وتووە ئەو ژنە ژیرە | کە بیری بەینێ باشتر تەگبیرە |
| شوو وەسە لیباس، بیکەی بیگۆڕی | ئەتوانی چەند ساڵ رایی بیگۆڕی |
| کوڕوکچت ئەبێ لەویش هەروەک زوو | لە بیرت ئەچێ کوڕو کچی زوو |
| برا لەدەس چوو تازە نابیتۆ | دایک و باوک بۆ تۆزینو نابیتۆ |

* * *

«١٠٣»

**خۆی فەقیر بوو**

رۆژێ هاروونەڕەشید پارەی زۆری دا بەدەس باڵووڵ برایۆ، بیبا بۆ بازاڕ بیدا بەفەقیر و هەژار و نەدار،کە رۆیشت بۆ بازاڕ تەماشای کرد مەعمووری هارونەڕەشید دووکانەودوکان ئەگەڕێن بە زەبری شەلاق پارە و مالیات لە خەڵک ئەسێنن، پارەکەی هانیۆ و دایۆ بە هارونەڕەشید، وتی: باڵووڵ بۆ هانیتۆ نەتدا بە فەقیر و هەژار؟ وتی: تۆ مەعموورت تێخستووە بە دوکانەکانا بە زۆری شەلاق پارە لە خەڵک ئەسێنن. ئیتر وتم لە هاروون موحتاجترو فەقیرتر پەیا نابێ، تا پارەی بۆ ببەم لەبەر ئەوە پارەکەم بۆ هانیتۆ با کەمتر زۆرکەی لە خەڵک.

| | |
|---|---|
| دەولەمەن ئەبێ دلی وافربێ | با ئیحتیاجی بە خەڵک کەمتر بێ |
| نەک بە هەرکەس گا بلێ بە بەشم | نان بەبێ پێخۆر هەرگیز ناچەشم |
| نە لە رێی زۆرۆ نە لە رێی سواڵۆ | پارە و نیعمەت کەس نەباتە ماڵۆ |
| لە مامەڵەدا کەس نەخلەتێنێ | لە رێی حەڵاڵۆ ماڵ بەدەس بێنێ |

* * *

«١٠٤»

**بەش کەر وا لە جەهەننما**

شێرێک و ورچێک و رێوییێ بە خێر و شەڕ بوون بە شەریک رۆیین بۆ ئەو هەردە بۆ راو. سێ حەیوانیان نەچیر کرد، گایەک و بزنێک و کەروێشکێ. دوای مانوو حەسانەوە شێرەکە وتی: چۆن بەشی کەین؟ ورچەکە وتی: بە عادلانە، گاکە بۆ تۆ بزنە کە بۆ من، کەروێشکەکە بۆ رێوی. شێرەکە وتی: نەفام تۆ نە لە شەرع

........................................................................................

ئەزانی و نە لە قانوون، چۆن بووی بە قازی وا بەشی ئەکەی لە داخا شکانی و لە پێشا ئەوی خوارد، دوایی وتی بە ڕێویەکە: بە بیری تۆ چۆنی بەش کەین. وتی: قوربان من هەر پاش‌خوان خۆر تۆ بووم گاکە بۆ بەر قلیانیت، بزنەکە بۆ نیوەڕۆت کەرویشکەکە بۆ ئێوارەت. کە کەم ئەخۆی منیش لە پاش‌خوانەکەی تۆ تێر ئەخۆم. شێرەکە وتی: تۆ ژیری لای کێ دەرست خوێندووە؟ ئیشارەی کرد بۆ ورچەکە و وتی: لای ددانی ریچی ڕەفێقەکەم.

زۆردارکە بە زۆربازووکار ئەکا　　سازش و تەسلیم مەگەر چاری کا
ئەرناوەکوو ئەو ورچەت پێ ئەکا　　ددانت لەدوور وەک ئەوریچ ئەکا
ریوی فێلاوی کە خۆیی سازان　　رزگاری بۆ بوو بە سەهل و ئاسان

* * *

«۱۰۵»

## مامۆسای زانا

خوا لێی خۆش بێ حاجی مەلا ئەحمەدی نۆدشەیی لە سالی ۱۳۰۲ قەمەریا لەشاری سنە لە عومری ۷٤ سالیا فەوتی کردووە و مەرقەدی وا لە تەپەی شێخ حەمە باقردا. وەختێ مەلا «عبدالرحمن» پێنجوێنی هەوالی فەوتی مامۆسای واتە حاجی مەلا ئەحمەدی نۆتشەیی، ئەبیسێ بە گریانۆ بەرەو بازاڕ ئەڕوات لێی ئەپرسن: قوربان بۆ وائەکەی؟ ئەیفەرموو: جێگەی بڕوام عالمێ بوو ناوی حاجی مەلا ئەحمەد بوو ئەوا ئەویش فەوتی کرد، ئیتر بڕوام بە عیلمی کەس نیە ئەترسم لە فتوایەکما بە هەلەدا بچم وگیرۆدەی لێ پرسیاوی لای خوا ببم بۆ خۆم ئەگریەم.

مامۆسای ئەوسا بۆ یەک وەها بوون　　سەرگەرم و سەرخۆش حوببی خوا بوون
ئیسە کە مەلا یەک یەکێ مابێ　　بۆ دونیا ئەبێ وەکوو خەلک وابێ
ئەرنا ژیانی رۆبەڕا نابێ　　لێی قوبوول ناکەن وەکوو زوو وابێ

* * *

«١٠٦»

## ماچ کردن

قال مجنون:

أمرّ علی الـدیار دیـار لیلـی　　أقبّل ذا الجدار و ذا الجدارا
و ما حبّ الدیار شغفن قلبی　　و لکن حبّ من سکن الیارا

منیش تەرجەمەم بەم جۆرە کردووە:

ئەڕۆم بـۆ دەورووبـەری مالـی لـە یلـێ　　ماچ ئەکەم دەر و دیواری خەیلێ
بـۆ دەرو دیـوار نیمـە هـیچ مـەیلـێ　　ماچ ئەکەم لەبەر خـاتری لـەیلـێ
کەسێ کە دەستی پیاو چاک ماچ ئەکا　　هەر لەبەر خوایە دەسی ماچ‌ئەکـا
مـەیکـە بـە موشـریک مـەڵـێ کـافرە　　خـوا ئاگـادارە، خـوا نـازرە

* * *

«١٠٧»

### دۆینەوڕۆن

ئاشێ لە «دەربەن کەڵەو»ا ئەبێ ئاشەوانێکی ئەبێ بە ناو لالە قادر ئارەزووی گونینە و ڕۆن ئەکا ئەڵێ: خۆزگا بۆ خیگەیێ ڕۆن و مەشکەیـێ دۆینـە. ئـەکـەوێتـە گوێی جنۆکەیێ ئەڵێ: مام قادر ئەڕۆم دۆینە و ڕۆنت بـۆ بێنم بیکـە بـە چێشت و بەیەکۆ بیخۆین. بەو شەرتە راسی دڵەکەت نەڵێی. ئیتر ئەڕوات لە ماڵـێ خیگـەڕۆن بێنێ و لە ماڵێترا مەشکەی دۆینە. مام قادر ئەیکا بە دۆینـەوڕۆن کـە ئـەینێتـە سـەر سفرە ئەڵێ «بسم اللّه» با نـان خـۆیـن، جنـۆکـە لـە ترسـا رائـەکاتـەدەرۆ. لـە داڵانی ئاشەکەدا ئەڵێ:

هۆ لالۆ قادر گونینە وەرە　　تۆ ئازات ماچا بۆ دڵێ بەرە

* * *

«١٠٨»

## پەنا بۆ خۆشەویستی خوا

ئەڵێن لە وڵاتێکا دەسەیێ جەردە پەیا ئەبن کە رێگە لە خەڵک ئەبەسن و ئەزیەت و ئازاری زۆریان ئەبێ بۆ خەڵک، هەموو شکایەت ئەبەن بۆلای حاکم وەخت. ئەویش دەسوور ئەدا بە مەعموورەکانی ئەوانیش ئەڕۆن دوای تێک هەڵچوونی زۆر دە نەفەریان لێ‌دەسگیر ئەکەن. ئەنووسن بۆ حاکم بە سلامەتی سەرتۆ دە نەفەر لە جەردەکانمان گرت. ئەویش زۆری پێ‌خۆش ئەبێ. کە دە نەفەرەکە ئەبەن یەکێکیان لە رێدا رائەکا ئەوانیش خەبەریان داوە دەنەفەرمان گرتووە و حاجی رێبوار کە کەس نایناسێ تووشیان ئەبێ و ئەیگرن و باڵی ئەبەسن و ئەیکەن بە جێگەدار جەردە راکردووەکە و ئەیانبەن بۆلای حاکم. حوکم ئەدا کە بەیانی ئەهلی شار کۆئەکەنۆ و هەموویان ئیعدام کەن. حاجی بێچارە کاغەزێ ئەنووسێ بۆ پێغەمبەرﷺ کە من کەسم نیە و کەس ناناسم ئوممەتی تۆم و بە خزمەت تۆ گەییوم، بێ بە هاوارمۆ و نەجاتم بدە، ئەیدا بە دەم باوە و حاکمەکە ئەو شەوە خەو ئەبینێ کە ئەو دە نەفەرە کە گیراون حاجیێ بێ‌تاوانیان وا تیا مەیەلە بێ تاوانەکە ئیعدام کەن ئەویش بەیانی یێ بۆ ناویان حاجیەکە ئەدۆزێتەوە و ئازادی ئەکا و خەڵاتیشی ئەکا و ئەڕواتەوە بۆ ماڵ خۆی.

حاجی بێچارە زوو بە دەس و برد    هاواری بۆ لای خودای خۆی ئەبرد
هات بە هاواریۆ خوای میهرەبان    رێگەی نەجاتی ساز کرد بە ئاسان
تۆیش ئەگەر وابی پەنابەی بۆ لای    نەجات خۆت ئەدەی لە وەی و بەڵای

* * *

«١٠٩»

## دار هەڵبڕی سەگ دز دیارە

پیاوێ ماڵێکی زۆری بوو شەوێ دز رۆیی هەموو ماڵەکەیان برد وتیان شکت لە کێیە با بی‌گرین. پێنج نەفەری دابە داوۆ وتی: دڵم لە مانە پیسە پێنج نەفەرەکەیان برد بۆلای قازی ژیر ئەویش پێنج داری یەک متری پێ‌دان و وتی: بیبەنۆ لە ماڵۆ داینێن، حەفتەیێ‌تر بینۆ دارەکان بێننۆ هەرکامتان دز بێ دارەکەی

..............................................................

وپەنجە زیاد ئەکا ئەویانە کە دز بوو دوو پەنجە لە دارەکەی بڕیۆ جا قازی کە
ەکانی تەماشا کرد کە ئەم یەکیانە دوو پەنجەی کەمترە زانی ئەمیانە دزە گرتیان
مووو مالەکەیان لێ سەندۆ.

قەت‌دزی‌مەکە بۆئەم‌دونیا    دزی ماڵ ئاوسێ زەرەری تیایە

* * *

«۱۱۰»

**هاوسێ**

ژنێ چوو بۆ ماڵ هاوسێکەی، بێژنگ و ساج بخوازێ، نەیاندایە، بە
ەئیووسی گەڕایەوە. دوای چەند رۆژێ ژنە ساحێب ساج و بێژنگەکە ئەمرێ، لە
خەوا چاویان پێ‌ئەکەوێ کە دەموو چاوی کون کون بووە و لایەکی رەشۆ بووە،
وتیان: ئەمە لەبەر ئەوە بووە کە کەلکی هاوسێکەی نەگرتووە.

* * *

# ناوەرۆک

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|

.........

..............................................

